# گەندەڵی و حکومەت

## هۆکارەکان، ئەنجامەکان، چاکسازی

نووسینی:

پرۆفیسۆر سوزان ڕۆز ئەیکەرمان

وەرگێڕانی:

گۆران سەباح غەفوور



ئەمجارەش پێشکەشە بە:

* دکتۆر هیمداد عبدالقهار لە زانکۆی سەلاحەدین

* ڕۆزە

ناوی کتێب: گەندەڵی و حکومەت - هۆکارەکان، ئەنجامەکان، چاکسازی
نووسینی: پرۆفیسۆر سوزان ڕۆز ئەیکەرمان
وەرگێڕانی: گۆران سەباح غەفوور
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٤٠
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ئازمودە
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (١٤٢)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## پێشواژە

* گـەندەڵی بووەتە دیاردەیەکی جیـهانی. هەر لە وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە بگرە تا دەگاتە هەرێم و وڵاتانی جیـهانی سێیەم بەدەست ئەو دیاردەیەوە دەناڵێنن. بەڵام، ڕێژەکەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە.
* دیاردەی گـەندەڵی لە لایەن پسـپۆرانەوە بە" کـرمی سـەرەخـۆرەی وڵات" دادەنرێت. کرمێک کە هەموو داهات و بەرهەمی وڵات دەخوات و ورده ورده وڵات بەرەو کەمی خوێن و شێرپەنچەی ئابووری دەبات.
* گەندەڵی یەکێک لەو هۆکارە هەرە کاریگەرانەیە کە هەمیشە وڵات دوا دەخات لە پرۆسـەی پێشکەوتن و بەرەو دواوەی پەلکێش دەکات. وڵاتی گەندەڵ فریای هیچ ناکەوێت و هیچ شتێکیش بەشی ناکات.
* گەندەڵی نەک هەر تەنها سیستەمی ئابووری وڵات ئیفلیج دەکات، بەڵکو سیستەمی پەروەردەیی و ئیداری و سیـاسی و ئاینی و کـۆمـەڵایەتی و نەتەوەییش دووچاری نەخـۆشی "ئێسکە نەرمە" دەکات و هەرگیز ڕێگەیان پێ نادات بکەونە سـەرپێ و بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێن.
* ئایا هۆکـارەکانی ئەم دیاردە کوشندەیە چین؟ پاڵنەرەکانی واستە و بەرتیلدان و وەرگرتن و خزمایەتی و پارە دزین و خـواردنی بەشی مـافی هاوڵاتییـان چین؟ ئایا بەرپرس و فـەرمانبـەری حیزبی و حکومی بۆچی بەرتیل وەردەگرن؟ بۆچی گەندەڵن لە ڕووی سـیاسی و ئیـداری و ئابوورییـەوە؟ ئایا سـیستـەمی باجی حکومـەت بەرپرسیـارە؟ ئایا کەمی مووچە وا لە فـەرمانبـەری حیزبی و حکومی دەکات پەنا بەرنە بەر ئەم دیاردەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیـارانە و چەندین پرسیـاری جۆراوجـۆری دیکە لەم کتێبەدا دراوەتەوە.
* هیوادارم ئەم کتێبە ببێتە بناغەیەک بۆ پسپۆرانی ئێمە بۆ ئەوەی دەست بکەن بەلێکۆڵینەوە لەسـەر دیاردەی گـەندەڵی لە وڵاتی خـۆمـان تاوەکو بەزووترین کـات



دەرمانێک بۆ ئەم نەخـۆشییە بدۆزنەوە. گەر بەتەواوی چارەسـەریشی نەکەن ئەوا با تۆزێک ئازارەکەی کەم بکەنەوە!

وەرگێڕ
goforspring1@yahoo.com
goransabah@hotmail.com

# دەستپێک

## زیانەکانی گەندەڵی

هەژاری و خراپی باری تەندروستی و گوزەران و دابەشکردنی دەرامەت و سامان بە نایەکسانی تەواوی وڵاتانی جیهانی گرتۆتەوە. گەلێ لە وڵاتان گەشەی ئابوورییان نزمە یان خراپە. تەنانەت ئەو وڵاتانەی کە دەوڵەمەندن لە ڕووی سەرچاوە سروشتییەکانەوە، باری ئابووری و داهاتی دانیشتوانیان نزمە. وڵاتانی تر، بەتایبەتی ئەوانەی سەر بەکەرتی سۆڤیەتی پێشوون، سەرەڕای هەبوونی هێزێکی کرێکاری کارامە باری ئابوورییان هەر خراپە.

بەڵام هاودژیەک (التناقض) لە ئارادا هەیە. ڕێکخراوە قەرز بەخشە نێودەوڵەتییەکان، وەک بانکی جیهان، زۆرجار گرفتیان هەیە لەمەڕ جێبەجێکردنی پرۆژە پەسەندکراوەکان. ئایا چۆن دەشێ کار وا بڕوات لە کاتێکدا پێداویستییەکان ئێجگار زۆرن؟ یەکێ لە ڕەگەکانی ئەم گرفتە، دام و دەزگا پەککەوتووە تایبەتی و حکومییەکانن. حکومەتی کەم دەرامەت واتە: سوود لە یارمەتی دەرەوە نابینێت بەشێوەیەکی دروست و کاریگەر. وڵاتانی کەم دەرامەت و ئەوانەی گەشەی ئابوورییان نزمە هەمیشە گرفتیان هەیە چونکە ناتوانن سوود لە سەرچاوە ماددی و مرۆییەکان وەرگرن. بۆیە ئەم وڵاتانە پێویستییان بەچاکسازی ڕێکخراوەیی هەیە، بەڵام ئەم چاکسازییەش کارێکی زەحمەتە. بونیاتنانی بەندەر و سەدە و هێڵی خێرا ( خط سریع) لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە بەرەو پێشەوە دەچێت، کەچی چاکسازی حکومەت و هاوکاری دامەزراندنی کەرتێکی تایبەتی بەهێز ئەرکێکی ئەوەندە زەحمەت و گشتگیرە، تەنها بەنەخشەیەکی ئەندازیاری ئەنجام نادرێت.

گرژی نێوان توانای وڵاتە پێشکەوتوەکان و داواکارییەکانی هاوکاری نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە قەرز بەخشەکان، سەرەڕای مێژوو و کەلتووری ئەو وڵاتانە، لە سەرچاوەکانەوە سەر هەڵدەدات. بەپێی ڕەخنەگرانەوە، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان



بایەخ بەدەزگا و گومرگە مەحەلییەکان نادەن، هەروەها ناتوانن پرۆگرامەکانیان بگونجێنن لەگەڵ ڕەوشی تایبەتی تاکی وڵات. هەرچەندە ئەمە لە هەندێ حاڵەتدا بێ شک ڕاستە، واتە هەندێ جار دەتوانن بەرنامەکانیان بەپێی بەرژەوەندی تاک بگونجێنن. هەندێ لە دام و دەزگاکانی وڵاتان کە هەرچەند پێشکەوتوون، زۆر بەخراپی پابەندن بەبەدەستهێنانی ئامانجەکانیان.

هەندێ لە ڕەخنەگرانی تر پرسیار لە ئامانجەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەکەن، گفتوگۆی ئەوە دەکەن کە گەشەی ئابووری پێوەرێکی ناتەواو و بەرتەسکی دڵخۆشی و تەندروستییە. بەڵام بەپەسەندکردنی ئەو ڕەخنەیەش، جیاوازییەکی فراوان دەمێنێتەوە لە نێو وڵاتان لە ڕووی تەندروستی و پەروەردە و ژیانی ئابووری و یەکسانی ژینگە. هەرچی شتێک لە جیهان بەهادار بێت وەک زۆری داهات و باشی گوزەرانی ژیان یان کەمکردنەوەی مردنی منداڵان جیاوازە لە سەرانسەری جیهان، بگرە بەڕێژەیەکی جیاواز هەڵبەزو دابەزی تیا هەیە.

ئاشکرایە، جیاوازییەکان لە کەلتوور و بەها بنەڕەتییەکان لە سەرانسەری جیهاندا هەیە. بەڵام تەنها یەک پاڵنەری مرۆیی هەیە کە پاڵنەرێکی جیهانی و سەرەکییە بۆ خستنە ڕووی ئەزموونە جیا جیاکانی وڵاتان. ئەو پاڵنەرەش " بەرژەوەندی خود"ە، واتە بەرژەوەندی خێزانێک یان گروپێک لە ڕووی دڵخۆشی و تەندروستییەوە. ڕەخنەگران بەم بەرژەوەندییە دەڵێن " تەماع". ئابووری ناسان پێی دەڵێن " ئەوپەڕی سوود وەرگرتن". ئیتر هەر ناوێک بێت، کۆمەڵگاکان جیاوازن لە ڕێگای هەوڵدانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان. گەندەڵی کوشندە تێکشکان و زیانێکی گشتگیرە، واتە گۆڕینی بەرژەوەندی خود بۆ مەبەستی بەرهەمهێنەر.

دەتوانین ڕێگایەکی باش بگرینە بەر بۆ تێگەیشتن لە ژێرکەوتنی وڵاتانی پێشکەوتوو گەر لە پێشدا لەوە تێبگەین چۆن بەرژەوەندی خود مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و چۆنیش خراپ بەکاردەهێنرێت. باشترین حاڵەت دابین دەکرێت لە بازاڕی پڕ لە ململانێ کە تیایدا بەرژەوەندی خود دەگۆڕێت بۆ چالاکی بەرهەمهێنەر کە ئەمەش بەرەو بەکارهێنانی تەواوی سەرچاوەکانی دەبات. خراپترین حاڵەتیش جەنگە. پێکدادانێکی وێرانکەر لەسەر سامان بەوێرانکردنی ژێرخانی سەرچاوەکان

کۆتایی دێت کە هەر ئەویشە یەکەم جار ئاگری شەڕەکەی خۆش کردووە. لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەشدا، ئەو بارودۆخانەن کە خەڵک تیایدا سەرچاوەکان بەکاردەهێنن بۆ مەبەستی بەرهەمهێنان و دەستەبەرکردنی قازانجێک لە دابەشکردنی سوودەکانی چالاکی ئابووری. ئابووری ناسان بەمە دەڵێن " گەڕان بەدوای کاردا".

من لە کارلێکی نێوان چالاکی ئابووری بەرهەمهێن و کاری نابەرهەمهێن دەکۆڵمەوە لە ڕێگەی جەختکردنە سەر گەندەڵی لە کەرتە حکومییەکاندا کە بووەتە دیاردەیەکی جیهانیی. لە توێژینەوەکانی ئەم دواییەدا، ئاستە بەرزەکانی گەندەڵی تێکەڵ کراوە لەگەڵ ئاستی نزمی گەشە و وەگەڕخستن " ئستثمار". گەندەڵی کاریگەری سیاسەتی پیشەسازی کەم دەکاتەوە و وا لە کار دەکات لە کەرتێکی نافەرمییەوە بچێت بەڕێوە و بەدەر بێت لە باج و یاساکان. بەشی وەگەڕخستن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە دەرەوە Foreign direct investment (FDI)"بە هۆی ئاستی بەرزی گەندەڵییەوە پەکی کەوتووە. ئابووری ئاسیا شتێکی شازە، ئەوانەی بەئاستی گەندەلی بەرزەوە سەرنجی FDI ڕادەکێشا گەر گەندەڵی کەمتر بووایە، هەروەها سیاسەتی پیشەسازییان کاریگەرتر دەبوو.

تەنانەت کاتێ گەندەڵی شان بەشانی گەشەی ئابووری بێت ئەوا بەرتیل زیان و چەواشەکاری دەنێتەوە. بەرپرسی گەندەڵی ئاست بەرز زۆر هاوکاری وەگەڕخستنێکی حکومی بێ بەرهەم دەدات و هەروەها وەگەڕخستنەکانی ڕابردووش پووچ دەکاتەوە. گەندەڵی تەواوی پرۆسەی وەگەڕخستن کەم دەکاتەوە و FDI سنووردار دەکات، بەڵام هانی زیادەڕۆیی ژێرخانی وەگەڕخستن دەدات. لە ڕژێمێکی گەندەڵدا، ئەکتەرە ئابوورییەکان لەگەڵ هەندێ کەم تەرخەمییەوە، وەک ئەوانەی پابەندن بەکارە نایاساییەکان، قازانجێکی بەراوردکاریان هەیە. وڵات هەژارتر دەبێت گەر ئاستی گەندەڵی تیایدا بەرز بێت. ڕەنگە وڵات بکەوێتە نێو تەڵەیەکی گەورەی گەندەڵییەوە کاتێ گەندەڵی لەم وڵاتەدا دەزێت و شەرعیەتی وەگەڕخستنی بازرگانی پووچ دەکاتەوە.

کاری هاوتەریبی وڵات کاریگەری نێگەتیڤی گەندەڵی دووپات کردۆتەوە لەسەر گەشە و بەرهەم.، بەڵام وڵات کارێکی زۆر کەم دەکات بۆ داڕشتنی نەخشەیەکی دژەگەندەڵی و ستراتیژییەکانی. ئەم توێژینەوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە گەندەڵی زیان



بەخشە بەڵام میکانیزمی تەواو ناخاتە ڕوو کە بەهۆیەوە گەندەڵی کاریگەری هەبێت لەسەر باری ئابووری. بەهەقیقەت، شتێکی شاراوەیە گەر وڵاتێک لە بەرزترین ئاستی گەندەڵیدا بێت و ماناکەشی لێڵە. ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە بەرتیل و سووخۆری بەشی سەرەکین لە بەهای گرێبەستەکان و خزمەتگوزارییەکانی حکومەت؟ ئایا مانای ئەوەیە کە ڕێژەی بەرتیل گەلێ بەرزە لە گرێبەستەکاندا؟ ئایا مانای ئەوەیە کە بەرتیل کاریگەرییەکی چەواشەکاری هەیە لەسەر ژیانی سیاسی و ئابووری؟ ڕووپێوەکان هیچ زانیارییەک نادەن بەدەستەوە کە یارمەتی یەکێک بدەن تێبگات لە ماناکانیان، لە ڕاستیدا، ئەو زانیاریەی کە گەرەکە پێناچێت دەست بکەوێت. ئاڵۆزترکردنی کێشەکان، کۆپەیوەندی نێوان گەندەڵی و باری ئابووری خراپ پەیوەندیەکی ڕەها نییە. ئاستی بەرزی گەندەڵی وێرانکەرترن ، بەپێی هەندێ مەرج، لە ئاستەکانی تری گەندەڵی.

ئاستی بەرتیل ئاستێکی هەمەجۆر و لە هەمان کاتیدا هەستیان پێ ناکرێت. یەکێک دەیەوێ بزانێت تەنها چەند پارە وەک بەرتیل دراوە، بەڵام دەیەوێ ئەوەش بزانێت کە چەند شت بە بەرتیل فرۆشراوە. بۆ ئەمەش، ئەو کەسە پێویستی بەشیکردنەوەی وڵات بەوڵات و کەرت بەکەرت هەیە. ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ دانانی کارنامەی ئەو جۆرە هەوڵانەو کەڵک وەرگرتن لەو کارانەی کە پێشتر وجودیان هەبووە. گەر یەکێک سەیری پێکهاتەی سیستەمی ئابووری و سیاسی بکات دەتوانێت پەی بەوە ببات کە گەندەڵی چەندە زیان بەخشە بەهەموو جۆرەکانییەوە. بەپێی ئەو زانیاریەش، بەرنامەکانی چاکسازی دەتوانن هێرش بکەنە سەر ئەو ناوچەی کە خراپترین ئاستی گەندەڵی لێیە. من کار لەسەر ئەوە دەکەم کە چۆن لە وڵاتان هۆکارەکان و دەرەنجامەکانی گەندەڵی سەرهەڵدەدات و چۆن چاکسازی ڕوودەدات. بەڵام، کۆکردنەوەی حاڵەتەکان بەس نییە. ئێمە پێویستمان بەزانیاری سیستەماتیکی هەیە لەسەر چۆنییەتی گەندەڵی و مامەڵە لەگەڵ خود کاریگەری هەیە لەسەر کارەکانی حکومەت و بازاڕە تایبەتییەکان.

من کێشەی گەندەڵی شی دەکەمەوە بە چوار ڕێگا. یەکەمیان، وەرگرتنی پێشینەی ڕێکخستنی دەوڵەت و کۆمەڵگا وەک خۆی و پرسیارکردن لەسەر ئەوەی چۆن پاڵنەرەکانی گەندەڵی لە نێو بەرنامە گشتییەکانەوە سەر هەڵدەدەن. من ئەوە دەخەمە

ڕوو کە گەندەڵی دەتوانێت ڕێڕەوی مووچە بەخشین بەهەموو شێوەکانییەوە ئیفلیج بکات و پەکی بخات. هەوڵەکانی چاکسازی دەتوانن پاڵنەرەکان بۆ بەرتیلدان و وەرگرتن کەم بکەنەوە و هەوڵی نەمانی گەندەڵی زۆرتر بکات. ئامانجمان نەهێشتنی گەندەڵی نییە بەڵکو چاککردنە بەشێوەیەکی دروست و کاریگەر و هەروەها یەکسانی و شەرعیەت بگێڕینەوە بۆ دەوڵەت. تەواو بنبڕکردنی گەندەڵی شتێکی وا سوودمەند نابێت گەر هەوڵی بۆ بدەین چونکە تەنها خۆ ماندوو کردنە، بەڵام هەنگاونان بۆ دانانی سنوورێک و کەمکردنەوەی ئەو زیانانەی کە گەندەڵی دەینێتەوە.

دووەمیان دانانە بەوەی کە گەندەڵی واتای جیا جیا وەردەگرێت لە کۆمەڵگای جیاجیاوە. بەرتیلی یەکێک دیاری یەکێکی ترە. سەرکردەیەکی سیاسی یان بەرپرسێکی حکومی هاوکاری هاوڕێیانی یان ئەندامانی خێزانی و پاڵپشتکەرانی دەکات، ئەمانە ڕەنگە لە کۆمەڵگایەکدا مایەی شانازی بێت و بەڵام لە کۆمەڵگایەکی تر مانای گەندەڵی بێت. مەبەستی من دیاریکردنی پێوانەیەکی جیهانی نییە بۆ ئەوەی لە کوێ هێڵێک بکێشین لە نێوان شانازیکردن بە دیاری و بەرتیلی نائەخلاقی و نایاسایی. ئەوەندە بەسە بۆ بەلاوەنانی ئەو هۆکارانەی کە دەبێ بەرەو دەستنیشانکردن بچن. کەلتوور و مێژوو شی کردنەوەن نەوەک پاساو هێنانەوە، من وەک ئابووری ناسێک، ناتوانم شیکردنەوەیەکی قووڵی ڕۆڵی کەلتوور و مێژوو بکەم، بەڵام دەتوانم ئەوە بخەمە ڕوو کە میراتی ڕابردوو هیچی تر لەگەڵ هەل و مەرجەکانی مۆدێرندا نایەتەوە.

سێیەم هەوڵ ڕەچاوی ئەوە دەکات چۆن پێکهاتەی بنەڕەتی کەرتی حکومی و تایبەتی گەندەڵی بەرهەم دێنن یان لەناوی دەبەن. من لە پەیوەندی نێوان پاڵنەرەکانی گەندەڵی و فۆرمەکانی دیموکراسی دەکۆڵمەوە و گفتوگۆی دەسەڵاتی ڕێکخراوە گشتی و تایبەتییەکان و ئەکتەرە تاکەکان دەکەم. چاکسازی لەم ئاستەدا ڕەنگە زۆر باش پێویستی بەگۆڕان هەبێت لە هەردوو پێکهاتە دەستووریەکان و پەیوەندی زەقی نێوان بازاڕ و دەوڵەت.

دوا بەشی ئەم کتێبە باس لە پرسێکی زەحمەت دەکات ئەویش دەستەبەرکردنی چاکسازییە. یەکەم، من گفتوگۆی ڕۆڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەکەم، هەردووکیان و



ڕێکخراوە قەرزبەخشەکان و دەستە فرە نەتەوە سیاسی و ئابووریەکان. سەبارەت بەهەندێ وڵات، بەتایبەتی ئەوانەی کە ئاستی پێشکەوتنیان بەرچاو نییە، ڕۆڵی بازرگانی فرە نەتەوەیی زۆر هەستیارە. گەر ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانە هاوکار بن لە هێشتنەوەی ڕژێمی گەندەڵ، ئەوا ئامانجەکانی پێشکەوتن ئیفلیج و سەقەت دەکەن. من هەوڵەکانی بەم دواییە دەخەملێنم بۆ لیستکردنی کارەکان بۆ یارمەتیدانی سنووردارکردنی گەندەڵی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و ئەو وڵاتانەشی کە ئێستا لە قۆناغی گواستنەوەی سۆشیالیزمدان.

دووەم، پێشنیارەکان لەمەڕ چاکسازی دەمان گەیەننە کێشەی ئیرادەی سیاسی ناوخۆ. فیکرەی باش هیچ کەڵکێکی نییە تاوەکو یەکێک نەبێت بەخۆشحاڵییەوە جێبەجێی بکات. دەرەنجامی ئەم کتێبە باسی ئەو وانە سەرکەوتووانە دەکات کە لە ڕابردوودا جێبەجێ کراون. هەرچەندە قەت وا ڕێک ناکەوێت کە دوو وڵات هەمان پێشینە و هەلو مەرجیان هەبێت، چاکخوازە مۆدێرنەکان دەتوانن شتێک فێر ببن لە تۆماری مێژووییدا.

ئەم کتێبە نەخشەیەکی تەواو بۆ چاکسازی بەرجەستە ناکات. ئەم کتێبە بەپێکەوەنانی باشترین کار کۆتایی پێ نایەت. بەڵکو پێشنیاری کۆمەڵێک ئەلتەرناتیف دەکات کە چاکسازی دەبێ بچێتە نێو تاکی وڵاتانەوە. یەک وانەی بنەڕەتی هەیە ئەویش ئەوەیە: چاکسازی نابێت سنووردار بێت بۆ دروستکردنی سیستەمی یەکڕیزی. بەڵکو گۆڕانی ڕەگ و ڕیشەیی لەو ڕێگایانەی حکومەت کاری پێ دەکات دەبێ لە نێو جەرگەی کارنامەی چاکسازیدا بێت. ئامانجی سەرەکی دەبێ کەمکردنەوەی بەرتیلدان و بەرتیل وەرگرتن بێت، نەک توندکردنی سیستەمی کۆنترۆڵی داهاتوو.

چاودێریکردن و چەسپاندن دوو شتی زۆر پێویستن، بەڵام کاریگەرییەکی درێژخایەنیان دەبێت، گەر ئەو مەرجە بنەڕەتییانەی کە هانی بەرتیل دەدات کەم نەکرێتەوە. گەر ئەو پاڵنەرانە وەک خۆیان مانەوە، ئەوا نەهێشتنی سندوقێک سێوی خراپ زۆر خێرا دەبێتە هۆی دروستکردنی گروپێکی نوێی گەندەڵ کە پێک دێن لە بەرتیلدەرە تایبەتی و بەرپرسەکانی حکومەت.

## کاریگەری گەندەڵی ئابووری

گشت وڵاتان، پێشکەوتوو و دواکەوتوو، کۆنترۆڵی دابەشکردنی قازانج و خەرجیە زۆرەکان دەکەن. دابەشکردنی ئەو قازانج و خەرجییانە بەگشتی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو بەرپرسە گشتیانەیە کە خاوەن دەسەڵاتێکی ئیختیارینە. کۆمپانیا تایبەتەکان و تاک ڕەنگە چارەسەرێکی گونجاوی بوێت بۆیە پارە دەدات تا ئەو چارەسەرە بەدەست بێنێت. هەموو مووچەیەک گەر بەنایاسایی بەبریکارە گشتییەکان بدرێت گەندەڵیە لە پاڵ ئامانجی بەدەستهێنانی قازانج یان کەمکردنەوەی خەرجی. گەندەڵی هێمایەکە کەمو کورییەکان لە سیستەمی هەر وڵاتێکدا دەردەخات. وەک بڵێی دەوڵەت هەردوو قاچی شکابێت و نەتوانێت بەرەو پێشەوە بچێت. دام و دەزگا حکومییەکانیش دامەزراون بۆ حوکمکردنی ئەو فرە پەیوەندیەی نێوان هاوڵاتی و دەوڵەت. دام و دەزگا حکومییەکان بۆ خزمەتی هاوڵاتی دامەزراون نەک بۆ خۆدەوڵەمەندکرنی چەن بەرپرسێک و تەنها هەموو شتێک بۆخۆیان قۆرخ بکەن و هەر ئەوان لە خوانەکە بخۆن، ئا ئەوەیە کەسی گەندەڵ. ئالیەتی نرخ، زۆرجار سەرچاوەیەکی توانستی ئابووری یان پشکێک بۆ گەشە، لە فۆرمی بەرتیلەوە دەتوانێت کاریگەری و شەرعیەتی حکومەت ئیفلیج بکات.

ئەم بەشە، تیشک دەخاتە سەر گرینگترین ئەو حاڵەتانەی کە گەندەڵی بەشێوەیەکی بەر فراوان دەتوانێت حوکم لەسەر ئەوە بدات کێ قازانج دەکات و بەرگەی خەرجیەکانی کارەکانی حکومەت دەگرێت.

* حکومەت دەتوانێت قازانجێکی بەردەوام بۆ تاک و کۆمپانیا گەورەکان فەراهەم بکات لە ڕێگەی بەکارهێنانی پێوەری یاسایی نەوەک ناچاریان بکات پارە بدەن ئینجا کاریان بۆ بکات. هەموو شێوازەکانی بەرتیلدان و وەرگرتن بازاڕ تووشی قات و قڕی و لەناوچوون دەکات.

* ڕەنگە بەرپرسەکان لە کەرتە حکومییەکاندا پاڵنەرێکی کەمیان هەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان بەباشی لەسەر بنچینەی ئەو بڕە پارەیەی وەک مووچە وەری



دەگرێت لە شوێنەکەی خۆی. بەم شێوەیە کارەکانیان دوا دەخەن. ڕەنگە کاری موراجیعێک تەنها یەک ئیمزا بێت پێی دەڵێت برۆ بەیانی وەرەوە ئیتر بەم شێوەیە یەک هەفتە کاری هاوڵاتیەک دوا دەخات لە هیچ و خۆڕایی. یان ئەوەتا دەیان بەربەست و پاساوی تر بۆ ئەنجام نەدانی کارەکەی دەهێنێتەوە. ئا لێرەدا بەرتیلدان و وەرگرتن پاڵنەرێکی سەرەکییە و بەرپرس یان فەرمانبەران پەنای بۆ دەبەن.

* ئەوانەی پابەندن بەڕووپێوی یاسایی، هەوڵی کەمکردنەوەی ئەو نرخە دەدەن کە دەیدەن و حکومەت فەرزی کردووە لەسەریان لە ڕێگەی باج و ئەرکی گومرگ و یاساکانەوە. ئا لێرەدا بەرتیلدان و وەرگرتن نرخ دێنێتە خوارەوە.

* بازرگانی نایاسایی زۆرجار دەبێتە هۆی کڕینی ئەو قازانجانەی کە لە گەندەڵی دەکەوێتەوە لە دەوڵەت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، بازرگانی نایاسایی و تاوانی داڕێژراو زاڵ دەبێت بەسەر پۆلیس و بەشەکانی تری کۆنترۆڵی دەوڵەت بەهۆی گەندەڵی و چاوشۆڕی وەرگرتنی بەرتیل. ئالێرەدا بەرتیلدان و وەرگرتن دەبێتە هۆی ئەنجامدانی تاوان.

ئەو شێوازانەی بەرتیلدان و وەرگرتن تەواوکەر و بەهێزکەری یەکترن. بۆ نموونە: گەر بەرتیل پاڵنەرێکی گەورە بێت بۆ پارە، ڕەنگە قازانجێکی بەردەوام لە باج بکات یان کەسانێک لە باج دووربخاتەوە لە بری ئەوە پارە وەرگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر حاڵەتێکی گەندەڵی و بەرتیلدان و وەرگرتن ڕەنگە حاڵەتی خراپتری بەدواوە بێت، بۆیە دەبێ هەریەکەیان بەجیا لێیان بکۆڵرێتەوە.

### پارەدان کە دەبێتە یەکسانکردنی کەلوپەل و داوا

حکومەت زۆرجار کاڵا و خزمەتگوزاری یان بەلاش یان بەنرخێکی کەمتر لە بازاڕ دابین دەکات بۆ هاوڵاتی. هەمیشە لە بازاڕدا دوو نرخ هەیە بۆ هەمان شت، نرخێکی نزم و گونجاو، نرخێکی بەرزی نێو بازاڕی ئازاد. ئا لێرەدا، کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەرتیل دەدەنە بەرپرسەکان بۆ ئەوەی ئاسانکارییان بۆ بکەن بۆ کڕینی کاڵای نرخ نزمی دەوڵەت. بۆ نموونە، لە وڵاتی چین هەندێ لە کاڵا بەرهەم هێنراوەکان بەهەردوو جۆرە نرخ دەفرۆشران، واتە نرخی هەرزانی حکومەت و نرخی گرانی نێو بازاڕی

ئازاد. هەرچەندە جیاوازیەکانی نێوان هەردوو نرخ (واتە نرخی هەرزانی حکومەت و نرخی گرانی نێو بازاڕی ئازاد) لەم سالانەی دواییدا نزیکەی وەک یەکیان لێ هاتووە، لە کاتێکدا پێشتر جیاوازییان زۆر بوو. توێژەرە چینییەکان لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێن " لە ساڵی ١٩٨٩ دا نرخی خەڵووز لە بازاڕ ڕێژەی لە سەدا ٦٧٤ ی نرخی هەرزان بوو. واتە زۆر گرانتر بوو لە نرخی هەرزان. هەروەها نرخی حەوت شتی یان بەرهەمی دیکە لە بازاڕ لە سەدا ٢٥٠ تا ٤٧٨ ی ئەو نرخە هەرزانە بووە کە لە لایەن حکومەتەوە جێگیر کراوە. ئەمەش شتێکی سەیر نییە کە بەرتیلدان و وەرگرتن بۆ کڕینی کەلوپەل بەنرخێکی هەرزان زۆر ئاسایی بوو. لە وڵاتی نێجیریا، کاتێ نرخی نەوت بەقەد نرخی نێو بازاڕی لێهات لە "بەنین" دراوسێی ئەوا قاچاغکردن بەنەوت لە نێجیریاوە بۆ بەنین لە ڕێگەی گەندەڵیەوە پەرش و بڵاوبۆوە. ئەو قازانجەشی کە لەو قاچاغیەوە دەکرا لە بەر نرخەکان زۆر جیا بوون لە یەکتر بۆ قاچاغچییەکە و ئەو بەرپرسە بوو کە بەرتیلی وەرگرتبوو بۆ ڕێگە پێدان بەو بازرگانییە نایاساییە.

گەر نرخی کاڵا و ڕێژەی بەرژەوەندی لە لایەن حکومەتەوە کۆنترۆڵ کرا، ئەوا بەرتیلدان و وەرگرتن هەر دەبێت بۆ ئاسانکاری. چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ بازرگانەکان لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕووسیادا ئەوە دەردەخەن کە بەرتیلدان و وەرگرتن زۆرجار پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی دڵنیایی. لە لوبنان، ڕووپێوێکی لەم چەشنە ئەوەی ئاشکرا کردووە کە قەرز بەخشین نادرێت بە کەس گەر ئەو کەسە بەرتیل نەدات، واتە بەبێ بەرتیل قەرزدان نییە. کاریگەری و گەندەڵی فەرمانبەری بانقەکان دەخاتە نێو مەترسییەکی گەورەوە، واتە هەندێ جار ئەو کەسەی کە قەرزی پێ دەبەخشرێت لە بەر بەرتیلدان و وەرگرتن پابەند نابێت بەدانەوەی قەرزەکەی. بۆ نموونە، لە کینیا چاودێرێکی کارامە خەملاندوویەتی کە چارەگێکی شێوازەکانی بانق شتێکی بێ بایەخ بوو لە ساڵی ١٩٩٢ ئەمەش لە بەر دەستێوەردانی سیاسی لە سیستەمی داراییدا.

حاڵەتێکی لەم چەشنە هەبوو لە بانکی نەتەوەیی "فیجی" کە تیایدا کاریگەری سیاسی زۆر زەق و بڵاو بوو. لە کۆریا قەرزەکانی بانق هەمیشە بەباشی پەیوەست و بەسترا بوو بەچەند کۆمپانیایەک پاش ئەوەی ئەزموونی کێشە و دەردەسەری



داراییان بۆ پێشهات. ئەو کۆمپانیایانەش کە قەرزیان بەشێوەیەکی بەردەوام وەردەگرت لە بانق بەرتیلێکی بەرچاویان دەدا بەسیاسەتمەدارە دەسەڵاتدارەکان، بۆیە هەمان ئەو بەرپرسانە فشاریان دەخستە سەر ئەو بانقانە کە بەبەردەوامی ئەو کۆمپانیایانە بێ بەش نەکەن لە قەرز. فەرمانبەرانی نێو بانقیش بەرتیلیان وەردەگرت. لە پاکستان، توێژەرە لێهاتووەکانیان حیسابیان کردووە کە لە ساڵانی ١٩٩٦ و ١٩٩٧ حکومەت لە سەدا ١٠ تا ١٥ زەرەری دەکرد لە بەرهەمە ناوخۆییەکان لە بەرئەوەی قەیرانێکی بانق لە ئارادابوو، ئەو قەیرانەش قەرز بەخشین لە بانقەکان بەیاوەرانی ڕژێم بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بوو.

ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن زۆرجار ژێرخانی ئابووری وەگەڕ ناخات، بۆیە پاڵنەر دروست دەبێت بۆ بەرتیلدان تاوەکو پارەی بێگانە بەڕێژەیەکی بەرچاو وەگەڕ بخرێت. بۆ نموونە، ئاڵوگۆڕ کردن بە سیستەمی ڕێژەیی پارەی جۆراوجۆر لە "پاراگوای" بووە هۆی گەندەڵی پێش ئەوەی چاکسازی تیا بکرێت. سیستەمی دوانەی باشووری ئەفریقیا سەرچاوی بەرتیلدان و وەرگرتن بوو. یەکەی "ڕاندی" دارایی هەڵوەشایەوە لە مارسی ساڵی ١٩٩٥، گۆڕانێکی سیاسی لەو وڵاتە بووە هۆی نەهێشتنی کۆمەڵێک پاڵنەری سەرەکی گەندەڵی لە وڵاتدا.

تەرخانکردنی مۆڵەتی بەردەوامی هاوردە و هەناردن سەرچاوەیەکی هەمە لایەنەی بەرتیلدان وەرگرتنە، هەروەها واستە کردن لە ڕێگای بەرتیلەوە بەستراوەتەوە بە بەهای ئەو قازانجەی کە دەبەخشرێت. لە فلیپین، لە سەرەتای پەنجاکان هەردوو ڕێگا بەکارهێنران. ئەوانەی کە دەستێکی باڵایان هەیە لە نێو سیاسەت زۆر بەئاسانی مۆڵەت وەردەگرن، مۆڵەتەکەشیان بەردەوامە تا لە سەدا ١٠ ی پارە بەبەخشن بەلیژنەکە. بەتایبەتی ئەوانەی کە مەسئولن یان خزم و کەسەکانی مەسئولان لە پێش هەموو کەسێکن بۆ وەرگرتنی هەر مۆڵەتێک. لە نێجیریا، ئەو ڕژێمەی جلەوی دەسەڵاتی لە دەست بوو، لە سەرەتای هەشتاکان بەرگەی چاکسازیەکانی بازرگانی ئازادی کرد کە شتێکی خوازراو بوو لە لایەن گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتیەوە، ئەمەش لە بەر یەک هۆی سەرەکی ئەویش زۆر بەئاشکرا دیار بوو کە سیستەمی هەنووکەیی مۆڵەتی هاوردە سەرچاوەیەکی سەرەکی واستە و

بەرتیلدان و وەرگرتن بوو. لە کۆتایی هەشتاکاندا، سیستەمی مۆڵەتپێدانی هاوردە ئەوەندە توند بوو دواجار بەیەکجاری هەڵوەشایەوە. ئەمەش بەئاشکرا لەبەرئەوەی کۆمەڵەی کارگەکانی نێجیریا، ئەو ئەندامانەی کە هەمیشە بەرتیلیان دەدا لە ساڵانی زوو هیچ قسەیەکیان لەسەر نەبوو، درکیان بەوە کرد کە ڕەوشی ئەوان باشتر دەبێت گەر ئەو سیستەمە بوونی نەبێت. وێڕای ئەمەش، لە هەمان کاتدا کە سیستەمی مۆڵەتپێدانی هاوردە کۆتایی پێهات، دەوڵەت دەرفەتی نوێی ڕەخساند بۆ گەڕان بەدوای دەسکەوت و کاردا!

لەم حاڵەتانەدا پاڵنەرەکان زۆر ئاشکرا و زەقن بۆ بەرتیلدان و وەرگرتن. بەڵام ئایا توانست و دەرەنجامەکانیان چین؟ ئایا هەروا بەئاسانی کاڵا و داوا یەکسان دەکەن بەیەکتر، کارکردن بەنرخەکان لە بازاڕی یاساییدا؟ من ڕەچاوی سێ حاڵەت دەکەم: یەکەمیان، قازانجی گشتی بەردەوام و جێگیرە لە کەلوپەل. ئەو بەرپرسانەی کە بەرپرسن لە تەرخانکردنی هیچ دەسەڵاتێکیان نییە بۆ زیادکردن یان کەمکردنەوەی تەواوی ئەو کاڵایانە. دووەمیان، قازانجەکە بەردەوامە، بەڵام بەرپرسەکان خۆیان دەتوانن کاریگەرییان هەبێت لە جۆر و چەندایەتی ئەو کاڵایەی کە لە بەردەستە. سێیەمیان، خزمەتگوزاری لە بەردەستە بۆ هەموو ئەوانەی کە شایستەن، بەڵام بەرپرسەکان دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە پێ داگرن و بیدەن بە یەکێک کە هەموو تایبەتمەندییەکانی تیایە.

## کاڵای جێگیر

لە یەکەم حاڵەتدا کە بەرپرسەکان دەبێ ژمارەیەکی جێگیر لە مۆڵەت یان قازانج تەرخان بکەن، هەروەها ژمارەی ئەو خەڵکانەی کە شایستەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو خزمەتگوزاریانەی کە ژمارەیان لە سەرووی کاڵاکانەوەیە. گەر بازاڕی گەندەڵ تەواو کاری خۆی بکات، ئەو خزمەتگوزاریانە بۆ ئەو داواکارانە دابین دەکرێت کە ئامادەن زۆرترین پارە وەک بەرتیل بدەن. گەر هیچ جیاکارییەک لە نرخدا نەبێت، ئەوا بەرتیل لە بازاڕدا دەگاتە ئاستی ئەو نرخەی کە لە بازاڕی ئاساییدا هەیە. ئا لەم کاتەدا، دەوڵەت دەیتوانی بەشێوەیەکی یاسایی ئەو خزمەتگوزاریانەی بفرۆشتایە بەهەمان



ئەنجام جگە لە دابەشکردنی دەرامەت. بەرتیلدان و وەرگرتن دەرامەتی خزمەتگوزرایە مەدەنییەکان بەرز دەکاتەوە. پارەدانی یاسایی دەچێتە نێو خەزێنەی حکومەتەوە. بەڵام ڕەنگە ئەو جیاوازیە ڕاست نەبێت. گەر کرێکاری نێو بازاڕ شێوازی پێشبڕکێی بەخۆوە بینی، ئەوا ئەو کاتە حکومەت دەتوانێت نرخی خزمەتگوزاری مەدەنی کەم کاتەوە بۆ ژێر نرخی کرێی کەرتە تایبەتەکان لەبەر ئەوەی بەرتیلدان و وەرگرتن هەیە بۆ بەرپرسە حکومییەکان. بەکورتی، گەر هات و هەلومەرجی پێشبڕکێ وجودی هەبێت هەم لە بازاڕی گەندەڵدا هەمیش لە کرێکاری نێو بازاڕدا، ئەوا ئەو کاتە بەرتیلدان و وەرگتنی نایاسایی وەک نرخی نێو بازاڕ وان. ئەوانەی کە دەیبەنەوە و هەمیشە قازانج دەکەن ئەو کەسانەن کە هەمیشە ئامادەن زۆرترین پارە وەک بەرتیل بدەن، ئەوانەشی کە هەمیشە زەرەر دەکەن و دەیدۆڕێنن ئەو داماوانەن کە هەمیشە ئامادەن کاتیان بەفیڕۆ بچێت لە سرە گرتن یان بەردەوام عەریزە بنووسن بۆ ئەو بەرپرس و کاربەدەستانەی کە بەبەرتیل کاری ئەوانی تر زۆر بەئاسانی دەڕوێنن.

بەڵام ڕەچاوی ئەو ڕێگایانە بکە کە ئەنجامی ناماقوڵ و یان نایەکسانی لێ دەکەوێتەوە دەکرێ سەر هەڵبدەن لەم جۆرە حاڵەتە سانایەدا. سەرەتا، وادانێ کە ئەوانەی ئامادەن زۆرترین پارە وەک بەرتیل بدەن پەسەند دەکرێن. پاشان، دەبێ یەکێ پرسیار بکات ئایا بازاڕە گەندەڵەکان زۆر جیان لە بازاڕە کراوەکان و پڕ لە پێشبڕکێکان؟. بەگشتی، ئەو بازاڕە گەندەڵانە وەک بازاڕی یاسایی کار ناکەن و ناچن بەڕێوە. ناشەرعیەتی بەرتیلدان و وەرگرتن بەشداربووان قایل و دەسخەڕۆ دەکات بۆ سەرفکردنی سەرچاوەکانیان بۆ ئەوەی مامەڵە نهێنییەکانیان بپارێزن و بەردەوام بێت. ئەمە لە بەرابەردا مانای ئەوەیە کە زانیاری لەبارەی نرخی بەرتیلدان و وەرگرتن بەشێوەیەکی بەرفراوان بەردەست نابێت. نرخ ڕەنگە بەشێوەیەکی ڕێژەیی و گۆڕاو بێت لە بەر زەحمەتی گەیاندنی زانیاری بازاڕ. هەندێ لە بەشداربووە بەهێزەکان ڕەنگە ئەوە ڕەت بکەنەوە بێنە نێو بازاڕەوە لە بەر ئەخلاقی نەهێشتن یان ترسی سزادان، هەروەها بەرپرسە گشتییەکان ڕەنگە مامەڵەیان لەگەڵ ئەوانەی کە دێنە نێو بازاڕەوە سنووردار بکەن و متمانە بەهاوڕێ و پەیوەندیەکان بکەن و نەهێڵن

هیچ زانیاریەک بچێتە دەرەوە. لە بەر هەموو ئەم هۆیانەی باس کران، سیستەمێکی گەندەڵ نەک هەر تەنها بوار بە ڕوحی پێشبڕکێ نادات بگرە زۆر جێگای گومان لێکردنە لەوەی بازاڕی یاسایی.

وێڕای ئەمەش، بەرتیلدان و وەرگرتن ڕەنگە ئامانجەکانی هەر پرۆگرامێک پشت گوێ بخات. لە بەریتانیا، لە سەدەی هەژدەدا، گەلێ لە بەرپرسان و فەرمانبەران بەشێوەیەکی یاسایی پارەیان وەرگرت لە ڕێگەی بەدەستهێنانی پشکێک لەو کرێیەی کە کۆیان کردبۆوە. چاکخوازان ( ئەوانەی لە بواری چاکسازی دەکۆڵنەوە) پەلەیان لە جێبەجێکردنی بەرنامەیەک کرد بۆ جێگیرکردنی مووچە، ئەو چاکسازانە ئەوەیان خستە ڕوو کە بەرپرسان و فەرمانبەران بەشێوەیەکی نایەکسان بایەخ تەنها بەلایەنێکی کارەکەیان دەدەن ئەویش قازانجی خۆیان تیا بێت، واتە گەر لەو کارەی کە وەک ئەرکێک لە سەریەتی جێبەجێی بکات قازانجی خۆی تیا نەبێت نایکات. گەر بێت و هەندێ وردتر قسە بکەین، ئەو خزمەت گوزاریانەی کە دابین کراون بۆ خەڵکی پێویست و هاوڵاتی هەژار و نەدار بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە بەرزترین پارە وەک بەرتیل بدەن. واتە ئەوەی پارە بدات لە هەر دەزگایەک یان شوێنێک بێت ئەوا کارەکەی زۆر بەئاسانی بۆ دەچێتە سەر. کەواتە، فرۆشتنی مۆڵەتی کاڵای هاوردە و هەناردن یان مۆڵەتی چێشتخانەیەک ئەنجام دەدرێت، بەڵام پشتگیریکردنی متمانەی کەسانی ترو نیشتەجێبوون یان وەرگرتنی قوتابی بەواستە لە زانکۆ، هەموو ئەمانە ئامانجەکانی بەرنامەیەکی سەراپاگیر بۆ چاکسازی ئیفلیج و بوودەڵە دەکات. هەتا گەر ئەوانەی کە پەسەند دەکرێن شایستە بن لە ژێر کاریگەری یاسا بەڵام جیاوای لە نێوانیاندا بکرێت.

ئێستا با باسی ئەوە بکەین کە یەکێک هەروا خانووێک یان شوقەیەکی پێ ببەخشرێت یان لە ڕێگەی خزمایەتی یانیش لە ڕێگەی واستەوە چەند ئەرزێکی پێ بدرێت. گەندەڵی لە بەرنامەی نیشتەجێبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا رووی دا، کاتێک ژمارەی ئەوانەی بێ خانوو بوون زۆر زیاتر بوو لەو شوێنانەی کە تەرخان کرابوون بۆ دابەشکردن. تەنانەت لە شارۆچکەیەکدا، بەرپرسان دوو لیستیان دانابوو، یەکێکیان بۆ خزم و کەس و برادەران بوو و ئەوەکەی تریش بۆ



ئەوانەی سرە دەگرن. لە نێو ئەوانەی کە سرەش دەگرن ئەو کەسە زووتر بەری دەکەوێت کە واستەی هەبێت. لە واشنتۆن دی سی، دوو بەرپرس دەستگیر کران لە بەرئەوەی بەرتیلیان وەرگتربوو لە هەندێ کەس کە ناویان لە لیستەکەدا نەبوو بۆ وەرگرتنی شوێنێک بۆ نیشتەجێبوون، هەروەها لەوانەش کە ناویان لە لیستەکەدا هاتبوو بەڵام سرەبڕییان بۆ کردبوون. هەمان شێوازی گەندەڵی سەری هەڵدا لەسەر بەخشینی شوێنی نیشتەجێبوون لە هۆنگ کۆنگ و سەنغافورا کە لەم شوێنانەدا داوا زۆر زیاتر بوو لەوەی کە لە بەردەستدا بوو. لە هۆنگ کۆنگ ئەو بڕە پارەیەی کە درابوو وەک بەرتیل نرخی هەمان ئەو قازانجە بوو کە بەدەست هێنرا بوو.

دابینکردنی ئاوەڕۆ و زەوی، ئەمەش حاڵەتێکی تری گەندەڵییە کە بەر ئەو کەسانە دەکەوێت کە بەرتیل دەدەن و کاریگەرییەکی خراپی هەیە لەسەر ئامانجەکانی بەرنامەی ئاوەڕۆ. لە پرۆژەی ئاوەڕۆدا، جووتیاران بەم شێوەیە بەرتیل دەدەن بە بەرپرسان: زۆرینەی ئاو بۆ ئەوان بچێت و هیچ ئاو یان بڕێکی زۆر کەم بۆ جووتیارانی تر بچێت، واتە تەواو بێ بەش بن لە ئاو. لە هەندێ سیستەمی ئاوەڕۆدا لە هیندستان و پاکستان، هەندێ لەو جووتیارانە بڕێکی زۆر کەم ئاویان پێ دەگات، تەنانەت بۆ کارە سەرەکییەکانی نێو کێڵگەش بەشیان ناکات، هاوکات هەندێ لە شوێنەکانی نێو کێڵگە هەندێ جار وشک دەبن پێش ئەوەی ئاویان پێ بگات. هەڵمەتێکی چاکسازی نەخشەی زەوی گرتەوە بۆ ئەوەی جووتیارە هەژارەکانیش سوودی لێ وەرگرن، کەچی گەندەڵی بەبەرگ و دەمامکێکی تر سەری هەڵداوە ئەویش ئەوانەی کە دەوڵەمەند و خزم و کەس و هاوڕێ و نزیکانی بەرپرسەکان بوون ئاویان زۆرتر پێ دەگەیشت و بەم جۆرە ئەو بەرنامەیەش سەری نەگرت و ئیفلیج بوو.

## کاڵای جۆراوجۆر

ئێستا باسی حاڵەتی دووەم و سێیەم دەکەین کاتێ بەرپرسان دەتوانن کاریگەرییان هەبێت لەسەر جۆرایەتی و چەندایەتی ئەو خزمەتگوزارییەی کە دابین دەکرێت و لەسەر ناسنامەی سوودمەندەکان. لەو حاڵەتانەدا، گەندەڵی بەدڵنیاییەوە بەرەو پووچ بوونی کارەکانمان دەبات. ڕەنگە تاکێک دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت ڕێگە بدات یان

پاڵپشتی یەکێک بکات یان چاو بپۆشێت لە سەرپێچییەکانی یاسا کە یەکێک بەرامبەر بەرنامەیەک دەیکات.

لە حاڵەتی دووەمدا، کە چەندایەتییەکە کەمە بەڵام هەمەجۆرە، بەرپرسەکە وەک قۆرخکەرێکی تایبەت، ڕەنگە لە سەر ئاستێکی ڕەسمی کەمتر دابەش بکات بۆ زیادکردنی دەسکەوتی ئابووری بۆ دابەشکردن. بەپێچەوانەوە. گەر حکومەت کاڵای لە ژێر ئاستی قۆرخکردندا دانا ئەو کاتە بەرپرسی گەندەڵ دەگەڕێت بەدوای دابینکردنی کاڵای زۆرتری خزمەتگوزاری. بەرپرسەکە هەمیشە وێڵە بەدوای ئەوەی کە دەسکەوتەکانی خۆی زیاد بکات نەک خزمەتگوزاری دابین بکات بەئاستێکی نموونەیی. هەڵسوکەوتی بەرپرس نەک هەر تەنها دەوەستێتە سەر دەسکەوتی گشتی ئابووری بەڵکو لەسەر ئەو پشکەی کە بەرپرس دەتوانێت بەلای وەنێت و گلی داتەوە لە پشکی سوودمەندەکان. گەر کۆمەڵە بەرپرسێک دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر تەرخانکردنی سوودێکی کەم، ئەوا کێشەکان جارانی ئەوەندە دەکرێت چونکە هەریەکەو هەوڵ دەدات دەسکەوتی خۆی زیاتر بکات و زیاتر لەوەی تر بەدەست بێنێت.

با ڕووسیا بەنموونە وەرگرین لە ڕووی بازاڕ بۆ زەوی و زاری بازرگانی. ئەنجومەنە مەحەلیەکانی حکومەت مافی خاوەندارێتیان هەیە، بەڵام سەرۆکی بەڕێوەبردن دەسەڵاتێکی بالای کەسی هەیە لە بڕیاردانی ئەوەی چەند زەوی و زار ببەخشێت بەکەرتی تایبەت. تەرخانکردنی زەوی و زار هیچ پەیوەندی بەبنەماکانی بازرگانییەوە نییە. هەبوونی کرێکار شتێکی دڵخۆشکەرە، هەروەها ڕێژەی کرێ زۆر لە خوار نرخی بازاڕە. هاوکات کەمی کرێ گرێی ئابووری گەورە دروست دەکات کە بۆ بەرپرسە مەحەلیەکان وردە وردە زیاد دەکات، لە هەمان کاتیشدا ئەو کرێیە کەمە ڕێژەی داوا ئێجگار زۆر بەرز دەکاتەوە. نادیاری و هاودژی و داواکارییە یەکگرتووەکان ژووری جێ هێشتووە بۆ گەندەڵی و هەوڵدان بۆ پڕکردنی گیرفانی خۆت لە ڕێگای ئاژانسە مەحەلیەکانەوە. نەقووسانی حوکمی یاسا دەبێتە هۆی ئەوەی بەرپرسان بەدوای دەسکەوتی زیاتردا بگەڕێن و تەنها چاویان لە گیرفانی خۆیان بێت. ئەم پرۆسەیە لە شارەکانی ڕووسیا زۆر تووندتر و زیاترە بەهۆی



هەبوونی دەسەڵاتدار و باڵادەستی زۆرو زەوەند، کە هەریەکەیان هەوڵ دەدات سوود و قازانج بۆخۆی گل داتەوە لە ڕەوشە ستراتیژیەکەدا. سەرەنجامی ئەمەش سیستەمێکی گەندەڵ و نایەکسان و ئیفلیج لە دایک دەبێت.

لە حاڵەتی سێیەمدا، خزمەتگوزاریەکی گشتی، وەک پاسپۆرت یاخود مۆڵەتی لێخوڕین یانیش مووچەی کەسێکی پیر و بەساڵاچوو، کەم نییە، بۆ هەموو ئەوانەی کە شایستەن هەردەم هەیە. بەڵام گرفتی هەرە گەورە ئەوەیە کە خەڵکانێکی ناشایستە و پلە بەرز و خزم خزمانێ زۆرجار لە ڕێگای بەرتیلدان و وەرگرتنەوە ئەو سوودانە دەستەبەر دەکەن. بۆ نموونە، لە وڵاتی تایلاندا، چەند قوتابیەک بەهۆی پارە دان وەک بەرتیل بە بەرپرسان لە تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە کۆلێژی پۆلیس دەرچوونە و هەروەها هەندێکی دیکەش هەر بەپارە تاقیکردنەوەی شوفێریان بڕیەوە و مۆڵەتی لێخوڕینیان وەرگرتووە. لە کۆریا، بەرپرسان بەوە تۆمەتبار کراون گوایە بەرتیلیان وەرگرتووە تاوەکو ساختە لە وەرەقەی تاقیکردنەوەی قوتابیەکاندا بکەن، تاوەکو ئەوەی کە شایستە نییە دەربچێت و بچێت بەرەو قۆناغێکی تر. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بەرپرسانی کۆچ و خزمەتگوزرای نشینگە بەرتیلیان وەرگرتبوو تاوەکو چەند بەڵگە نامەیەک تەزویر بکەن. لە بەڕازیل مەسەلەی تەزویرکردنی بەڵگەنامەکان بۆ قەرەبوو کردنەوە بووە هۆی گەندەڵی بەرپرسانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و گەندەڵ کردنی سیاسەتمەدار و قازی و هەتا دادوەریش. ئەم جۆرە حاڵەتەش پێی دەوترێت " گەندەڵی لەگەڵ دزین"چونکە نموونەی هەڵوێستی ئەمانە گورزێکە بەمانای ئەوەی کە بەرتیلدان و وەرگرتن بەری بێت لە پارە وەرگرتن لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکاندا، بەڵام زنجیرە نموونەیەکی ئاوا گەورە چەند حاڵەتێکی تریش دەگرێتەوە کە پرۆسەی توانست و لێهاتوویی هیچ باوی نامێنێت و هەموو یاساو ڕێساکانیش پێشێل دەکەن. شتێکی ئاشکرایە، کە کەسی نەشیاو هەمیشە ئەو کەسانەن کە ئامادەن زۆرترین پارە وەک بەرتیل بدەن چونکە هیچ ڕێگەیەکی یاساییان نییە بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییەکان.

بەڵام ئەوانەی کە کەسی شیاو و شایستەن ڕەنگە بەرتیل بدەن گەر بەرپرسان دەسەڵاتێکی قۆرخکەری ڕەهایان هەبوو بۆ دروستکردنی کێشە و نەڕواندنی کارەکە،

ئینجا یان ئەوەتا ڕەزامەندی لەسەر کارەکە نابەخشێت و دوای دەخات یانیش کارەکە بەتەواوی ڕادەگرێت تاوەکو بەرتیلی نەدەیتێ بۆت ناڕوێنێت. هەوڵەکان بۆ دروستکردنی بەربەست لە بەردەم کارێک زۆر بە سەرکەوتوویی بەرتیلی لێ دەکەوێتەوە گەر هات و کەسی داواکار هیچ سەرچاوەیەکی ئەڵتەرناتیڤی نەبوو، یان هیچ ناوەندێکی تری کاریگەری نەبوو بۆ داواکردن بۆ ڕواندنی کارەکەی. ستراتیژیەتێکی تر بەردەوامی نادیاری و گومان دروست کردنە لە پێوەری شایستەیی و شیان. ئەو کاتە بەرپرسان و فەرمانبەران دەتوانن هەر بەهەوەسی خۆیان هەرچی کارێک بیانەوێت بیوەستێنن تا ئەو کەسە بەرتیل نەدات، بەڵام کارێکی زەحمەتە بۆ ئەو ماف خوراوانە کە چۆن بیسەلمێنن مامەڵەیەکی نایەکسانیان لەگەڵدا کراوە لە لایەن بەرپرسانەوە.

هەرچەند دەسەڵاتی بەرپرس باڵاتر بێت و دەرفەتی کەمتریش کراوە بێت بۆ هاوڵاتی و کۆمپانیاکان، ئەوا زیانەکانی ئەو سیستەمە ئەوەندە زیاتر دەبێت کە دەبێتە هۆی گەندەڵی هەتا گەر ئەوانەی کە خزمەتگوزاریەکانیش بەهەقی خۆیان بەدەست بێنن هەر باجەکە دەدەن. زیانەکانیش کات و کێشەیە کە هاوڵاتی دووچاری دەبێتەوە لەبەر ئەوەی بەرپرسان ئەوپەڕی کۆششی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ سوودمەندەکان تاوەکو پارە لە ڕێگای بەرتیلەوە بەدەست بێنن.

## بەرتیل وەک پاڵنەرێکی پارەدان بۆ بیرۆکراتەکان

لەبەرئەوەی کات پارەیە، کۆمپانیا و هاوڵاتی داماو پارە دەدات تا کارەکەی لێ دوانەخرێت. لە گەلێ وڵاتدا هێڵی تەلەفۆن یان پاسەپۆرت یان مۆڵەتی شوفێری وا بەئاسانی بەدەست نایەت تا پارە وەک بەرتیل نەدەیت. هەندێ جار خزمەتگوزارییەکە بەردەستە تەنها بۆ کەسە گەندەڵەکان نەوەک بۆ هاوڵاتی شایستە و خۆگر.

ڕۆژنامەیەکی هیندی لیستێکی دەسکەوتی ستاندەردی بڵاو کردەوە بۆ زنجیرەیەک خزمەتگوزرای گشتی و ڕۆتینی. لە سنت پیتسبێرگ لە ساڵی ١٩٩٢دا نرخی بەستانی هێڵی تەلەفۆن ٢٠٠ دۆلار بوو. دیراسەیەکی نافەرمی ئابووری لە ئۆکرانیا ئاستەکانی بەرتیلدان و وەرگرتن لیست دەکات بۆ ئەو خزمەتگوزارییە پێویستانەی



بازرگانە تایبەتەکان. زۆربەی کۆمپانیا زەبەلاحەکان باسی کرێ دانیان کردووە بەپەیوەندی لەگەڵ هاوردە و هەناردن. هێڵەکانی تەلەفۆن لەگەڵ کرێ نافەرمییەکاندایە. پارە بۆ باج و غاز و پشکنینی تەندروستی گشتی بوون، هەروەک کرێی نافەرمی و پارەدان بۆ ئاسان گەیشتن بەکارتی دڵنیایی. زەرەری هەرە گەورەی مامەڵەکردن لەگەڵ بەرپرسی دەوڵەت لە ڕێگای بەرتیلدان و وەرگرتنەوە وا لە گەلێ کۆمپانیا و هاوڵاتی دەکات هەول بات بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان بەهۆی کەرتی نافەرمییەوە و گەلێکی تریش لە ڕێگای فرۆشتن و نرخ و مووچەوە بۆ دەسەڵاتداران. زەرەرەکان بۆ دەوڵەت زۆر زۆرە، وێڕای ئەمەش، ئاستی بەرتیلدان وەگەڕخستن ئیفلیج دەکات و کردنەوەی کۆمپانیای نوێ سست دەکات.

هەمان پاڵنەری گەندەڵی وجودی دەبێت گەر حکومەت پارەی وەسڵەکانی خۆی نەدات لە کاتی خۆیدا. بۆ نموونە، لە ئەرژەنتین، حکومەت کار و کارنامەی کۆمپانیایەکی زەمانەتی دواخست، ئەمە وای لەو کۆمپانیایە کرد کە پەنا بەرێتە بەر بەرتیلدان و گەندەڵی، ئەوەبوو سیستەمێکی تەزویریان بەکارهێنا بەهاوکاری دارو دەستەی حکومەت و بەرپرسی گەندەڵ و واستەچییەکان.

لەو وڵاتانەی کە ئاستی گەندەڵی بەرزە، بەڕێوەبەرەکان چەندین سەعات سەرف دەکەن لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ فەرمانبەرانی دەوڵەت. لە ڕووپێوەکانی خەڵکی بازرگان لە ژمارەیەک وڵات، حاڵەتی ئۆکرانیا لە پێش هەموو وڵاتانی ترەوەیە. لە ساڵی ١٩٩٦ دا بەڕێوەبەرەکان و بەڕێوەبەرە گشتییەکان نزیکەی لە سەدا ٣٠ ی کاتی ئاسایی خۆیان بردە سەر لە مامەڵە کردن لەگەڵ فەرمانبەران. لە وڵاتانی تری وەک سلڤادۆر لە سەدا ٧ و لە لیسوانیا و بەڕازیلیش لە سەدا ١٥ , .

هەندێ لە پسپۆران پێوانەیەکی ئابوورییان داناوە کە بەرتیلدان و وەرگرتن پاڵنەریان گەلێ زۆرە بەپێی ئەو پێوەرە. بۆ نموونە، بەرتیلدان بە بەڕێوەبەران و سەرپەرشتی کارانی سرە گرتن زۆرە. پارەدان پاڵنەرێکە بۆ فەرمانبەران ، ئەوانەی کە ڕێز لە کاتی خۆیان دەگرن و کارەکەیان بەخێرایی ڕادەپەڕێنن. دابینکردنی خزمەتگوزاری تەلەفۆن لە هیندستان ئەم خاڵەمان بۆ شی دەکاتەوە. بەشێوەیەکی فەرمی، دونیا شامی شەریفە و هەموو کەسێک مافی یەکسانی هەیە لە

بەدەستهێنانی هەر شتێک، بەڵام بازرگانەکان بەرتیل دەدەن تاوەکو باشترین جۆری هێڵی تەلەفۆن بەدەست بێنن، خراپەکەشیان بۆ هاوڵاتی داماوە. هەندێ پێیان وایە کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، گەندەڵی کۆکردنەوەی باج وجودی هەیە شان بەشانی ئەوەی حکومەت دەتوانێت دەرامەتی سنووردار بسەپێنێت. وەزیر ئامانجی دانانی ڕێژەی دەرامەتەو نەخشەیەکی باوەڕپێکراوی باج دادەنێت و ڕێژەی کۆکردنەوەی باج دادەنێت. ئا لێرەدا، گەندەڵی دەمی کۆکەرەوەی باج شیرین دەکات بۆ گەڕان بەدوای داهات و دەسکەوتی باج، هەروەها حکومەتیش لە بەرتیلدان و وەرگرتن خۆش دەبێت تا وای لێ دێت ئەو کەسەی باج کۆ دەکاتەوە دەسکەوتی بەقەد دەرامەتی باج دەبێت. هەرچەند جیاوازی نێوان باوەڕی باج و ئامانجی دەرامەت زۆر بێت ئەوەندەش گەندەڵی زیاتر دەبێت.

نووسەرانی هەندێ لە توێژینەوەکان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە گەندەڵی شتێکە چاو پۆشی لێ دەکرێت. من لەگەڵ ئەوەدا نیم. یەکەم، لێبوردن و چاوپۆشی لە گەندەڵی لە ئاژانسێکی گرینگەوە وەک کۆکردنەوەی باج یان لە دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی ڕەنگە خۆی ببێتە هاندەرێک بۆ بڵاوبوونەوەی بۆ ناوچەکانی تر بەسەرەنجامی زۆر ترسناکیشەوە. دووەم، نووسەران وا دادەنێن کە فەرمانبەران تەنها دەسەڵاتێکی سنوورداریان هەیە. بۆ نموونە، ئەو کەسەی باج کۆدەکاتەوە بەمتمانەی باجی هاوڵاتیان و کۆمپانیاکان دەزانێت، لە واقیعدا، ڕەنگە ئەو کەسە متمانەی باج وەک ناوەندێکی بەرتیلدان و وەرگرتن دروست بکات. ویستی تاک و کۆمەڵ بۆ گەندەڵی جیایە، سەرەنجامەکەی شێوازێکی پارەدانی نایەکسان و هەڕەمەکییە. بڕی باج و بەرتیلدان و وەرگرتن جیایە لە نێو باجدەران بەڕێگایەک کە ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر توانای کاریگەری کۆکەرەوەی باج نەوەک لە سەر یاساکانی باج. گەر باجدەران جیا بن لە ئامادەیی و خۆشحاڵیان بۆ بەرتیل و هەروەها گەر ئەو باجەی کە لە بەرابەر بەرتیل دراوە ئاشکرا نەبێت ئەوا سەرەنجامەکەی سیستەمێک دەبێت کە تەنها چەند کەسێکی سنووردار لێی دەخۆن و سوودمەند دەبن ئەوانی تریش با ئاو بێنن و دەستیان بشۆن.

بە هەمان شێوە، بەرپرس و فەرمانبەران ڕەنگە دەرفەتی گەندەڵی دروست بکەن کە



ببێتە هۆی لەباربردن و شکستی حکومەت. بۆ نموونە، لە هیندستان ئەوانەی لەسەر تەلەفۆن کار دەکەن وەسڵ ناکەن بۆ موشتەریەکان لە بری ئەوە پارە بۆخۆیان وەردەگرن، یان ئەوەتا وەسڵەکە کەمتر دەنووسێت، بڕە پارەکەی تر بۆ خۆی هەڵدەگرێت. لە ئیتاڵیا، ئەو شوێنەی دواخستنی بیرۆکراتەکان بۆ ماوەیەکی درێژ وەک جۆرە یاسایەکی لێ هاتووە، بەرپرس و فەرمانبەران داوای بەرتیل دەکەن تەنها بۆ ئەوەی کارەکەی خۆیان بکەن. واتە جگە لە مووچەی مانگانەی خۆیان گەر هاوڵاتی یان موراجیعێک پارەیان نەداتێ ئەوا ئیشەکەی بۆ ناڕوێنن. سەرەنجامی هەموو ئەمانەش، هاوڵاتی داماو لە قوڕدا دەچێتە خوار و ژیانی ڕۆژانەی سەختتر و دژوارتر دەبێت.

سێیەمیان، گەندەڵی دەتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر کەش و هەوای بازرگانییەک کە هیچ زەمانەتێکی نەبێت. کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەرتیل دەدەن تاوەکو زەمانەت بەدەست بێنن، بەڵام ڕەنگە ئەو زەمانەتە فڕوفێڵێک بێت چونکە ناتوانن مامەڵەی گەندەڵی بەهێزترو زیاتر بکەن. لە ماوەیەکی کورتدا، ڕەنگە بەرتیلدان و وەرگرتن بەرهەمی هەبێت لە کۆکردنەوەی باج یان دابینکردنی خزمەتگوزاریەکان، بەڵام ئاستەنگەکان لە ماوەی درێژخایەندا سەر هەڵدەدەن. پارە وەک بەرتیل دەدرێت بۆ زیاد کردنی زەمانەتی ئەنجامی کۆمپانیا یان هاوڵاتی بەشێوەیەکی هەمەجۆر لە نێو مەرجەکانی ئەو کۆمپانیایەدا. بۆ نموونە، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر گەندەڵی ناخەنە ڕوو، لانت پریشێت و گیتا سێتی، لەو داتایەی کە بەکاریان هێناوە لە جامایکاو کینیاو پاکستان ئەوە دەخەنە ڕوو کە چۆن ڕێژەی تاریفەکان ( التعریفە) نەک هەر تەنها بەڕێژەی کەمی کۆکردنەوە بەستراوەتەوە بەڵکو بەنەگونجانی گەورەتری ئەو ڕێژانەی کە بەڕاستی دراون. ڕووپێوەکانی خەڵکی بازرگان لە پاکستان و ئۆکرانیا ئەوە دەخەنە ڕوو کە کۆمپانیای جۆراوجۆر و زەبەلاح و گەورە بەرتیل زۆر بەکاردەهێنن بۆ مەرامی کارەکانیان. بەرپرسیارێتیەکانی بەناو باج (مسؤولیات الضریبە الأسمیە) کەمتر و بێ هێزترن لە بەرپرسیارێتی باجی ڕاستەقینە بۆ کۆمپانیاکە خۆی و بۆ ڕکابەرەکانی. لەسەر ئاستی کۆمەڵگا هەوڵەکانی تاک بۆ کەمکردنەوەی گومان دەتوانێت گومان زیاتر

بکات لە بری کەمکردنی. سەرەنجامی هەموو ئەمانەش، گەر لە دەروازەی ئابووریەوە ڕابمێنین دەبینین بار و ژینگەی ئابووری لە مەترسیدایە و ژینگەیەکی نەبەربینبارە.

گەندەڵی دەتوانێت چاکسازی فەرمی لە دەوڵەت پەرپووت و بوودەڵە بکات، یان ئەوەتا هەر لێنەگەڕێت چاکسازی بکرێت. ئەو کۆمپانیایانەی کە سوودیان لە بەرتیلداندا بینیوە بەردەوام هەوڵی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ زیادکردنی ڕوونکردنەوەی یاسا و ڕێساکان. هاوپەیمان و هاوپشکەکانیان لە نێو دەوڵەتدا دژی ئەو چەشنە چاکسازیە دەوەستنەوە کە داڕێژراوە بۆ دروستکردنی بوارێکی ئابووری کراوە و پڕ لە پێشبڕکێ. بەکورتی، هەرچەندە هەندێ جار بەرتیلدان و وەرگرتن بەوە دەناسرێتەوە کە دەدرێت بەفەرمانبەر و بەرپرسی حیزبی و حکومی، بەڵام سیاسەتێکی چالاکی لێبوردن و چاوپۆشین بەرنامە و پرەنسیپەکانی چاکسازی درێژخایەن ئیفلیج و لە بار دەبات. هەروەها حکومەت لە پێش چاوی هاوڵاتیان سووک و بێ متمانە دەکات. هاوڵاتی هیچی تر حکومەتی خۆش ناوێت و بگرە کاری توندو تیژیشی لێ دەکەوێتەوە. ئەو پارەیەی کە وەک بەرتیل دەدرێت و بەچاوێکی شۆڕ و پەسەندکردنەوە سەیر دەکرێت دەبێ یاسا لەسەری بوەستێت. بەڵام هەموو پاڵنەرێکی پارەدان توانستی بیرۆکراتەکان باش ناکات. هەندێ کەس یان کۆمپانیا ڕەنگە زۆر بەسادەیی دەمی فەرمانبەر شیرین بکات بۆ دروستکردنی پرۆسەی زیاتری دواکەوتن لە بەرژەوەندی دەوڵەمەندان و سوودمەندان.

## بەرتیل بۆ کەمکردنەوەی نرخ

حکومەت باجی ڕەسمی و چەند یاسایەک بۆ باجدان دەسەپێنێت. هاوڵاتی و کۆمپانیاکانیش پارە وەک بەرتیل دەدەن بۆ کەمکردنەوەی نرخی ئەو باجانە. من یەکەم جار باسی پاڵنەرەکانی گەندەڵی لە پرۆگرامی تەنزیمییەوە دەکەم کە دواتر گەندەڵی لە کۆکردنەوەی باج و ئەرکەکاندا بەدوادا دێت. پاشان باسی کاریگەری سیاسی و ئابووری ئەم جۆرە گەندەڵییە دەکەم.



## پرۆگرامە تەنزیمییەکان

لە ژێر پرۆگرامی تەنزیمی حکومیدا، کۆمپانیاکان پارە دەدەن بۆ ئەوەی یاساکان بەفیت و مەرامی ئەواندا شی بکرێنەوە یان باری قورسی ئەو ڕێکخستنانەیان لەسەر سووک بکرێت. یاسا و ڕێساکان بەکاردەهێنرێن لە لایەن فەرمانبەر و بەرپرسی گەندەڵ وەک ناوەندێک بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆیان و پڕکردنی گیرفانیان. لە هەموو شوێنێک حوکمەکان لە بەرابەر پارەدان وەک بەرتیل چۆک دادەدەن. لە سەرانسەری جیهاندا شێوازەکانی بەرتیلدان و پارەدان وەک یەکە، سەرەڕای جیاوازییەکانی نێوان کەلتوور و هەلومەرجی ئابووری و ڕێکخستنی سیاسی. بەرتیل و پارەدان هەیە لە مۆڵەتپێدانی کارکردن و بازرگانی و لە بواری ئاوەدانکردنەوە و بیناکردن، هەروەها لە سەلامەتی شوێنی کارکردن و ژینگەی ترسناکی ڕێکخستن. هەرکاتێک بەرپرس و فەرمانبەرانی تەنزیمی دەسەڵاتیان هەبوو، ئا ئەو کاتە پاڵنەر وجودی دەبێت بۆ بەرتیل.

بۆ نموونە، لە کۆریا، پاش ئەوەی کۆگایەکی گەورە ڕووخا لە ساڵی ١٩٩٥، پاشان ئاشکرا بوو کە بەڵێندەرەکان ئەو چیمەنتۆیەی بەکاریان هێنابوو بۆ سەبکردن جۆرە چیمەنتۆیەکی خراپ بوو کە فەرمانبەر و بەرپرسانی حکومی ڕێگەیان بەو کۆمپانیایە دابوو سەرپێچی یاساکانی سەلامەتی بکات و چاوپۆشییان لێ کرد. چەند نموونەیەکی تر هەر لە کۆریا، لە بەر بەکارهێنانی چیمەنتۆی خراپ باڵەخانەیەکی نیشتەجێبوون ڕووخا و ٢٨ هاوڵاتی کوشت. هەروەها پردێک لە سیئۆل کەوتە خوارەوە کوشتنی ٣١ هاوڵاتی لێ کەوتەوە. لە تورکیا، پاش ڕوودانی بوومەلەرزەکە لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٩٨، کە بووە هۆی ڕووخانی چەندین باڵەخانە، خراپ بەکارهێنانی کەرستەی بیناکردن ئاشکرا بوو. گەلێ لەو قوتابخانە و نەخۆشخانانەی کە حکومەت دروستی کردبوون ڕووخان، ئیتر خەڵک دەستی کرد بەگومان لەوەی کە پشکنەرانی باڵەخانە و بەرپرس و فەرمانبەرانی حکومی هەمووی گەندەڵ بوونە. هەموو ئەمانە بۆ کەسێک تەواو ئاشنایە، بۆ یەکێک کە زانیاری هەبێت لە سەر گەندەڵی پشکنەرانی پرۆژەکانی دروستکردنی باڵەخانە لە شاری

نیۆیۆرک یان لە دەسەڵاتی نیشتەجێبوون لە ڕووسیا.

لە مەکسیک، بەرتیل و پارە لە ئاژانسە تەنزیمیەکاندا شتێکی ئاشکرا و زەقە کە دەبێتە هۆی ڕێگە پێدان و مۆڵەت پێدانی بەساختە. هەمان حاڵەت ڕاستە لە کینیا کە تیایدا کۆمپانیاکان سەر بەسەرۆکن و سوودی سەرەکی لەم چەشنە تەنزیمە دەبینێت.

لە ئەندەنووسیا خزمایەتی و ناسین و هاوڕێیەتی شتێکی گرینگە، پەیوەندییەکی بچووکی نێو ئەزموونی بازرگانییە بچووکەکان ئاستێکی بەرزی بەرتیلی هەیە. یەکێک لە توێژینەوەکان ئەوەی خستە ڕوو کە بەرپرسە بچووکەکان بەهۆی بەرتیل وەرگرتنەوە ساڵانە لە سەدا ٥ تا ٢٠ بەقەد داهاتی ساڵانەی ئەو وڵاتە بەدەست دێنن. لە پاکستان، کۆنترۆڵ بەسەر جێبەجێکردنی یاساکانی ژینگە وەک سەرچاوەیەک بۆ دەسکەوت و داهات سەیر دەکرێت.

ئەو نیزامانەی کە دەوری زێدەڕۆیی سەرچاوە سروشتییەکان دەدەن بەشێوەیەکی تایبەتی کراوەن بۆ گەندەڵی لە کاتێکدا یاسا هەمیشە ڕادەکێشرێت بۆ لای ئەوەی کە زۆرجار قازانجێکی زۆری بەرهەم دێنێت. بۆ نموونە، توێژینەوەکان لەسەر پیشەسازی زانستی دارستان ئەوە دەردەخەن کە پارەدان وەک بەرتیل هەمیشە بەکارهێنراوە بۆ بەهێزکردنی قازانجەکانی دارستان. بەهەمان شێوە، پاڵنەرەکانی گەندەڵی زۆرن بۆ پرۆژەیەکی تایبەت و نوێ بەمامەڵە کردن لەگەڵ ئاژانسە تەنزیمییە پارە خۆرەکان بەبێ تۆمارکردنی زانیارییەکان لەسەر گەندەڵی و ئەو کارەی دەکرێت بەنهێنی. لە پرۆسەیەکی پێشبڕکێی نێوان کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەرکەوتووە کە کۆمپانیایەک ڕەنگە هەوڵی ئەوە بدات دەسکەوتەکانی زیاتر بکات لە ڕێگای بەکارهێنانی بەرتیل بۆ مسۆگەرکردنی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ بازرگانییەکەی.

## باج و گومرگ

باج دان و گومرگ کردن هەمیشە دوو کاری زۆر زەحمەتن. لەگەڵ ئەوەش، بریکارەکانی گومرگ شتێک کۆنترۆڵ دەکەن کە کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەهەندی وەردەگرن، هەروەها ئەو شتە پەیوەندی بەجیهانی دەرەوە هەیە. بۆیە بازرگانەکان



یان هەر تاکێکی تر لەگەڵ باج وەرگر و بریکارەکانی گومرگ ڕێک دەکەون بۆ هێنانە خوارەوەی باجەکە و خێرا ڕواندنی کارەکانیان. لە ئەنجامدا، کۆکردنەوەی دەرامەت ڕەنگە کەم و بەنایەکسانی کۆبکرێتەوە. بۆ نموونە، لە پاکستان، توێژینەوەیەک خەمڵاندوویەتی کە گەر بێت و دزەکردنی کاڵا و بەرهەمی تر لە دەرەوە بۆ ناوەوە لە ڕێگای گەندەڵی و خراپی بەڕێوەبردن بێت ئەوا ڕەنگە بتوانرێت لە سەدا ٥٠ی کەم بکرێتەوە، بەڵام باج بۆ بەرهەمی ناوخۆ ڕێژەکەی لە سەدا ١٣,٦ بەرز بێتەوە بۆ سەروو سەدا ,١٥ فەرمانبەرانی شاری نیۆرک توانا و بەهرەکانی کۆمپیوتەریان بەکار هێنا بۆ کەمکردنەوەی یان نەهێشتنی بەرپرسیارێتی باج بۆ سەدان کەسی خاوەن کاڵا و زەوی و زار. بەشێوەیەکی گشتی، ئەو فەرمانبەرانەی بەرتیل وەردەگرن دەسکەوتی ڕۆژانەیان دەگاتە لە سەدا ١٠ ی باجی ڕەسمی، بەڵام هەندێ جار دەسکەوتەکانیان زیاد دەکات و دەگاتە لە سەدا ٢٠ تا ,٣٠ بەهۆی بەکارهێنانی هەمان تەکنیکی بەرتیل وەرگرتن، فەرمانبەرێکی سەر خوێندنەوە و حیساب کردنی پارەی ئاو پارەیەکی زۆری لە ڕێگەی بەرتیلەوە بەدەست هێنا بەهۆی کەمکردنەوەی پارە لەسەر پسوولەی ئاو.

ئەزموونی ژمارەیەک لە وڵاتانی ئەفریقی کرۆکی کێشەکە دەخاتە ڕوو. لە گامبیا، لە سەرەتای نەوەدەکاندا، سەرەنجامی بەرتیل وەرگرتن لە ڕێگای گومرگ و داهاتی باج وەرگرتن بەقەد لە سەدا ٨ تا ٩ ی بەرهەمی ناوخۆ بوو ( واتە شەش تا حەوت جار ئەوەندەی کە ئەو وڵاتە لە تەندروستی سەرفی دەکات). نەهێشتنی باجی دەرامەت تەنها سەدا ٧٠ ی داهاتی وڵات بوو. تەنها لە سەدا ٤٠ ی پرۆژە بچووک و مامناوەندییەکان باجیان داوە. کەمی دانی باجی گومرگ لە ڕێگای کەمی ڕێبەری کردنێکی دیار و تاریفە بڵاوکراوەکان ئاسانکاری بۆ کراوە. دەسەڵاتی باڵای بەرپرسان هاندەرێکی سەرەکی گەندەڵییە لە ڕێگای بەرتیل وەرگرتنەوە کە ئەمەش هەمیشە لە نێو بەرپرسەکان دادەڕێژرێت بۆ نەهێشتنی تاریف. بێ گومان، سیستەمێکی باش و کارا دەیتوانی ڕێژەی باج و تاریف کەم بکاتەوە، بەڵام کاریگەری چەواشەکاری ئاستێکی بەرزی نەهێشتن ئەنجامدانی ئەم کارە بەزەقی دیارە. توێژینەوەیەک لەسەر نەدانی تاریف لە زامبیا و تانزانیا و مالی

خەملاندوویەتی کە حاڵەتەکانی لێنەگەڕانی دانی تاریف بەبەڵگە و بێ بەڵگە هەیە، بەرهەمی داهاتی لە سەدا ٥٠ دابەزاندووە. واتە بەرپرسان لێناگەڕێن بازرگان و کەسانی تر تاریف بدەن. لە مۆزەمبیق، لە ساڵی ١٩٩٥ دا، فەرمانبەرانی گومرگ سەدا ٤٩ ی داهاتیان کۆکردۆتەوە، گەر هەموو کەسێک تاریف و باج بدات ئەوا ئەو ڕێژەیە زۆر زیاتر دەبێت. ئەم سەدا ٤٩ یە بەوانەش کە باج و تاریفیان نەداوە، بەڵام ئەوە ناگرێتەوە کە بەرپرسان و فەرمانبەران بۆ خۆیان وەریان گرتووە. بەرپرس و فەرمانبەرانی گومرگ دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە لێنەگەڕێن چەند کەسێک باج بدەن بەڵام ئەمەش بەبێ ڕێبەری و بەدواداچوونە. هاوکات بەرپرس و فەرمانبەران کارەکانیان زیاتر دوادەخست و نرخی باجی کاڵاکانیان بەرزتر کردەوە و ڕێژەیەکی بەرزتریان داوا دەکرد بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن بەرتیل بدەن. لە "زایر"، زۆربەی بەرهەمەکانی وڵات بەقاچاغ نێردرا دەرەوە لە ڕێگەی بەرپرس و فەرمانبەرانی گومرگەوە. هەروەها گەندەڵی زۆر بوو لە نەهێشتنی کۆنترۆڵ و پشکنین و باجی هاوردە. توێژینەوەیەک لەسەر بازرگانی نێو سنوورەکان ئەوەی نیشان دا کە چۆن هێنەرەکان نیوەی کێشی بارەکانیان بەلاوە دەنا و قازانجەکەیان بەش دەکرد لەگەڵ بەرپرسانی گومرگ. هەروەها تیمی دژە تەزویریش بەرتیلی وەرگرت.

باجدەران و بەرپرسی گەندەڵ قازانجەکانی باج و گومرگ لە نێوە خۆیان دابەش دەکەن. باج وەرگرتن لە دایک دەبێت لە لایەن ئەو باجدەرانەی کە هەژارن و هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتییان نییە و هەروەها لە لایەن هاوڵاتییانەوە کە باجی خزمەتگوزارییەکان دەدەن. بۆ نموونە، لە ئەفریقیا، توێژینەوەکان لە گامبیا و مۆزەمبیق و غانا دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە گەندەڵی وا لە دەوڵەمەند دەکات باج نەدات چونکە دەتوانن زۆر بەئاسانی دەمی بەرپرسان شیرین بکەن. نەدانی باج لە فلیپین مانای ئەوەیە کە هەژار دوو ئەوەندەی دەوڵەمەند باج دەدات، هەروەها لە سەدا ٦٣ ی هاوردە هیچ باجێک نادەن لە ڕێگەی گەندەڵییەوە.

دەرفەتی نوێ بۆ گەندەڵی یەکێکە لەو ئازارە زۆرانەی گواستنەوەی سیاسی و ئابووری، هەروەها دەتوانن چاکسازی ئیفلیج بکەن بەهۆی کەمکردنەوەی یەکسانی و شەرعیەت. باجی گەندەڵ و سیستەمی گەندەڵی گومرگ کە لە بەرژەوەندی هەندێ



کەس دایە وا لە وڵات دەکات کە هەمیشە نەکەوێتە سەر ڕێڕەوی چاکسازی و هەمیشە وڵات بەرەو کزبوونی ئابووری دەبات. بۆ نموونە، چاوپێکەوتنەکان لە مۆزەمبیق کە ئەنجامدراون لە ساڵی ١٩٩٦ ئەوە دەردەخەن کە گەندەڵی زیادی کردووە لەوەتەی پرۆسەی چاکسازی دەستی پێ کردووە لە ساڵی ١٩٨٦! دزین لە باجی دەرامەتی وڵات ڕێژەی بەرهەمی ناوخۆی داشکاندووە لە سەدا ٢٠ بۆ سەدا ١٧,٦ . گەندەڵی شتێکی گشتییە کاتێ ڕێژەی بەناو باج زۆر بەرزە، هەروەکو لەو وڵاتانەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات کە لە قۆناغی گواستنەوەدا بوون و هەروەها لە وڵاتانی سۆڤیەتی پێشوو. ڕێژەی بەرزی بەناو باج دەبێتە هۆی بەرتیلدان و وەرگرتن وەک لە جۆری نەهێشتنی دانی باج لێکەوتنەوەی چەندین جۆری دیکەی گەندەڵی و پارە خواردن.

## کاریگەری ئابووری و شەرعیەتی سیاسی

کاریگەری ئابووری بەرتیلدان بۆ سەرپێچی کردن و لادان لە نیزامەکان و کەمکردنەوەی باج دەوەستێتە سەر کاریگەری ئەو پرۆگرامانەی کە بەلای چەواشەکاری و گەندەڵیدا دەچن. گریمان دەوڵەتێک گەلێ نیزامی نابەجێ و باجێکی زۆر لەسەر کاردا دادەنێت. کەواتە، لەم ناوەدا کە یاسا ئامانجی خۆی ناپێکێت و بەرتیلیش بۆ سووککردنی ئەو نیزامە و کەمکردنەوەی باج بەشێوەیەکی کاریگەر زیاتر دەبێت. بەرتیلدان و وەرگرتن دەتوانن بەئاسانی لە یاسا و نیزام لابدەن و باج کەم بکەنەوە و گواستنەوەی کاڵا دابەزێنن. هەتا ئەگەر بازاڕی گەندەڵ هەندێ لەو کێشانەی هەبێت کە لە سەرەوە باس کران، ئەنجامەکەی هەر دەوەستێتە سەر پتەوی بناغە و کاریگەری نیزام و یاساکان لە شوێنی خۆی. ئەم بەرگری کردنە لە بەرتیلدان و وەرگرتن زیاتر لە لایەن وەگەڕخەرەکان لە وڵاتانی پێشکەوتووەوە سەر هەڵدەدات و هەروەها لە نێو باس و مشتومڕەکانی وەگەڕخستن لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بەدەر دەکەوێت. وەک بڵێی پاساوێکی ژیرانەیە کە لە نائومێدی و نامۆییەوە دەکەوێتەوە لە لایەن بازرگانەکان بەرامبەر بەفەرمانی یاسا و نیزامەکان. شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە گرینگە چونکە پاساو دەهێنێتەوە بۆ

گەندەڵی و سوود وەرگرتن، کاتێک یەکێک لە یاسا لادەدات و بەرتیل دەدات و قازانج دەکات. ئەوان ( بازرگان و هاوڵاتی) بەرتیلیان پێ باشترە لەوەی سیستەمێکی ڕاستگۆ هەبێت ئەگینا جێبەجێکردنی یاسا لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە، چونکە پابەند بوونیان بەو یاسا قورسانەی حکومەت پێ ناکرێت.

بەڵام ئایا هاوڵاتی و کۆمپانیا زەبەلاحەکان ناچارن تەنها گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بن کە گوایە یاسای یەکسان و بەجێن؟ ئاشکرایە، لە وڵاتە پیشەسازییەکان ئەم مەسەلەیە بەهیچ شێوەیەک پەسەند ناکرێت. کۆمپانیا گەورە ئەمریکی و ئەوروپییەکان بەشێوەیەکی گشتی هەوڵ نادەن بەرتیل بدەن بەو ڕێگایەی کە دەیانەوێت لە سەرەنجامی حوکمەکانی ژینگەیی و تەندروستی و سەلامەتی یان لیست کردنی پارمەتیدانی تاوانباران بۆ ئەوەی بەر سزای یاسایی نەکەون. لە بری ئەوەدا، ئەو کۆمپانیایانە کار دەکەن بۆ گۆڕینی یاساکان، بەشداری هەڵمەتی یاسایی دەکەن، ئاژانسی گشتی دادەمەزرێنن، هەروەها ئەو بەڵگە و فایلە یاساییانە دەهێنن کە ڕووبەڕووی یاسا و نیزامەکان دەبنەوە. یەکێ دەتوانێت ناڕەزایی دەربڕێت لە بارەی گرینگی سامان و دەستەی هاوکاری گەورە لە ژیانی سیاسی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، بەڵام بەلایەنی کەم ئەو چالاکیانەی کە بەڵگە و دۆکیومێنتی تەواویان هەیە و هەڵمەتەکان گونجاوترە بۆ بەرتیلدانی نهێنی لە دام و دەزگا دیموکراسییەکاندا.

بەڵام، هەندێ لە هەمان ئەو کۆمپانیایانە کەمتر پابەندن بەپێشێل کردنی یاساکان لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و ئەوانەی لە قۆناغی گواستنەوەی ئابووری دان. لە بەرئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاسا لەسەر ئەو بەرتیلانە ناسەپێنێت کە لە دەرەوە دەدرێن بۆ ڕواندنی کارە بازرگانییەکان، بۆیە کۆمپانیا ئەمریکییەکان دووچاری سزای ناوخۆی یاسایی دەبنەوە. بەڵام لایەنی گرینگی ئەو ناچارکردنە پێشنیاری ئەوە دەکات کە فرە نەتەوەکان هەمیشە هەست بەو ناچارییە ناکەن بۆ گوێڕایەڵی یاسا لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لەو شوێنەی کە لێی کار دەکەن. بەڵگەی ڕووپێوەکان ئاقارێکی فراوان لە بیروبۆچوونی بازرگانە ئەمریکییەکان دەردەخەن. لە یەک توێژینەوەدا، لە سەدا ٣٠ی ڕووپێوەکانی بەڕێوەبەرانی ئەمریکا ئەوە دەردەخەن کە هەرگیز کارێکی پەسەند نییە بۆ دانی دەست هەقی ڕاوێژکاری بەبڕی ٣٥٠٠٠٠



دۆلار بۆ بەرپرسێکی دەرەوە لە بەرابەر قازانجی ١٠ ملیۆن دۆلار. بەڵام لە دیوێکی تری مامەڵەکەدا لە سەدا ٦ ی ئەو پارەدانە هەمیشە پەسەند دەکرێت. بێ گومان، تەنها بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا گەورەکانی دەرەوە نین کە ئەم جۆرە باوەڕانەیان هەیە. کۆمپانیا ناوخۆییەکان زۆرجار بەهەمان شێوەی کۆمپانا زەبەلاحەکان کار دەکەن.

دوو کێشە هەیە لە بەردەم ئەو سیاسەتەی کە زۆر لێبوردنی هەیە. یەکەمیان، یەکێک ناتوانێت پشت ببەستێت بەوەگەڕخەرەکان بۆ دانی بەرتیل تەنها بۆ نەهێشتنی یاسا قورسەکان و باجی زۆر. لە بری ئەوەدا دەیانەوێت کاریگەری ئەو بارەی لە سەریانە کەم بکەنەوە. بمانەوێت و نەمانەوێت، بێ گومان یەکێک دەتوانێت ئەو شێوازانە دروست بکات کە تیایدا یاساکان هەمووی لەسەر بەرتیلدان و وەرگرتن بن بۆ گروپە سیاسییە بەهێزەکان بەبێ هیچ شەرعیەتێکی سیاسی. پاشان کەمکردنەوەی ئەو بارە قورسەی یاساکان دەبێتە ئامانجێکی سەرەکی. تاوەکو پاڵپشتکەرێکی بەهێز نەبێت کە باوەڕی بەوە هەبێت هەموو ئەو کارانە نایاسایی و ناشایستەن، ئەو جۆرە دیاردانە و یاسایانە دژی ئەو بەرتیل و چەواشەکاری و گەندەڵییە قەت جێبەجێ ناکرێت. ئایا هاوڵاتییەک یان کۆمپانیایەک دەتوانێت بەرگری لەو کارە گەندەڵەی بکات کە کردوویەتی لە ڕێگای بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە یاسا لە جێی خۆی نییە و عادلانە نییە؟ ئایا دەتوانن پاساو بۆ بەرتیلدانیان بەسیاسەتمەداران بهێننەوە لە ڕێگەی پاساوی ئەوەی کە یاسا وایان لێ دەکات پەنا بەرن بۆ بەرتیل و زیاد کردنی پێشبڕکێ؟ ئەمە سیاسەتێکی شیکردنەوەی ئەو بارە قورسەی لە سەر سیستەمی سەپاندنی یاسا کە زۆر کەموکوڕی هەیە جێبەجێ ناکرێت لە ڕووی تیۆرەوە هەر ناشەرعییە لە ڕووی سەپاندنی لە سەر دادگاکان.

دووەمیان، کارێکی زۆر نامۆیە بۆ لێبوردنی حوکمدانی کارەکانی کۆمپانیاکان کە بەرتیلدانیان بەئاشکرا سەلمێنراوە چونکە قازانجیان پێ زیادی کردووە. ئەم جۆرە بۆچوونانە زەرەرە بۆ ئەو نەتەوانەی کە تێدەکۆشن بۆ بونیاتنانی دەوڵەتێکی باوەڕپێکراو. ئەو دەوڵەتانە دەبێ میکانیزمی کاریگەر بگرنە بەر کە داوای گشتی وەربگیرێت بۆ نێو یاسا کە پابەندبوونێکی باوەڕپێکراو دابین بکات بۆ سەپاندنی

یاسا، ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکی یاسایی دابین بکات بۆ ئەوانەی کە دووچاری داوای پڕ لە فڕوفێڵ دەبنەوە. گەر وەگەڕخەرەکان و هاولاتی ئاسایی حوکمی خۆیان بدەن لە سەر ئەوەی کە یاساکان شەرعین، ئەوا هەوڵی دروستکردنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت دەدۆزرێتەوە. بەرتیلدان و وەرگرتن نەک هەر تەنها لە کاتی چەسپاندنی یاسادا بەردەوام دەبێت بەڵکو لە کاتی ئەوەی کە یاساکان بەکردەیی جێبەجێ دەکرێن. هەموو دەوڵەتەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەتەواوی و سەرکەوتوویی دەسەلاتی بەرژەوەندی تایبەتییان شکاندووە، یاسای نابەجێ و قورس جێبەجێ دەکەن، بەلام هیچ دەوڵەتێک ناتوانێت بەشێوەیەکی کاریگەر کار بکات گەر تاک یاسا نەگرێتە دەست و نەیسەلمێنێت لە ڕێگەی گەڕانەوە و پشت بەستن بەپێوەرەکانی قازانجی نرخ.

بۆیە گفتوگۆکان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە گەندەڵی ڕەنگە زیاتر چاوی لێ بپۆشرێت کاتێ کاریگەری تاک زیاتر دەبێت، بەلام کاتێ جێبەجێ دەکرێت و ڕوودەدات لە ڕژێمێکی ناشەرعیدا کە ناتوانێت هیچ نارەزاییەک بۆ پشتگیری گشتی دروست بکات. ئەو کاتە هەتا بەرتیلیش بۆ نەدانی باج زەرەری کەمتر دەبێت لەوەی لەهەلومەرجەکانی تردا چونکە هەرچەند سەرچاوە کەم بێت لە ولات، ئەم ولاتە ئەوەندە دەسەلاتی کەم دەبێت. هێشتا زەرەر هەر دەمێنێت. سوودمەندانی مامەڵەی گەندەڵی هەمیشە دەبن بەپاڵپشتێکی بەهێز دژی چاکسازی چونکە دەترسن لە لەدەستدانی سوود و قازانجە تایبەتییەکانیان. وێڕای ئەمەش، کاتێ ڕژێمێکی چاکسازی دەسەلات دەگرێتە دەست، کۆششەکانی زەحمەتتر دەبێت گەر گەندەڵی بووبێتە کارێکی سیستەماتیکی. یەکێک لە ئەرکە بەراییەکانی ئەم ڕژێمە دەبێ هەڵسوکەوتی بەرپرس و هاولاتی و کۆمپانیای گەندەڵ بگۆڕێت لە ڕەگ و ڕیشەوە. چاوپۆشین و لێبوردن لە هەوڵەکانی تاک لە دژی یاسا قورسەکانی دەوڵەت لەگەڵ شەرعیەت و ماهیەتی دەوڵەت ناگونجێت.

## گروپی تاوانباران و گەندەڵی

خاوەنی کار و بازرگانە نایاساییەکان هەمیشە هەوڵ دەدەن کارەکەیان بەمسۆگەری



بکەن لە ڕێگەی بەرتیلدان بە پۆلیس و سیاسەتمەدار و دادوەرەکان یان لە ڕێگەی شەریک کردنی ئەو بەرپرسانە لە قازانجی بازرگانە نایاساییەکەیان. بەلام ئەم جۆرە کار و بازرگانیانەش زۆر موعەرەزن هەڕەشەیان لێ بکرێت بۆ پارە لە لایەن گروپی ترەوە. دەسەلاتی سەپاندنی یاسا (لە پۆلیس و پارێزەرەوە بگرە تا دەگاتە دادوەرەکان) دەتوانن داوای پارە بکەن بۆ پێشێل کردنی یاسای تاوانباران یاخود کەمکردنەوەی سزای تاوانباران. گەر بەڵگە ئاشکرا بێت لە سەر تاوانبارێک، ئەو جۆرە بازرگانانە ناتوانن خۆیان لە گەندەڵی بدەن و هەڕەشە لە دادوەر یان پۆلیس بکەن کە بەزەبری بەرتیل سزاکەیان کەم بکاتەوە یانیش چاوپۆشییان لێ بکات.

بێ گومان، بازرگانە نایاساییەکان بەدەرن لە قوربانی بەری لە تاوان. بەڵکو زۆر جار چالاکانە هەوڵ دەدەن بەرتیل بدەن بەپۆلیس. هەر تەنیا هەوڵی پارێزگاری خۆیان نادەن لە لێپێچینەوە بۆ خۆیان بەڵکو هەوڵی زەمانەتیش دەدەن بۆ دەسەلاتی قۆرخکردنیان لە بازاڕی ڕەش یان نایاساییدا. لە ئەمریکای لاتین و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، تلیاک فرۆش و قومارچییەکان پارەیان داوەتە بەرپرسان بۆ ئەوەی تاو بدەنە ڕکابەرەکانیان یانیش ڕێگەیان لێ تەسک بکەنەوە. لە تایلاند، هەندێ لە دەسەلاتدارە مەحەلییەکان پەنا لە کاری نایاسایی دەکەن نەک هەر تەنها لە بەر ڕکابەرانەوە بەڵکو لە بەر یاساش. واتە چاوپۆشییان لێ دەکەن بەهەموو شێوەیەک. لە ڕووسیا، ئەوانەی کە هەمیشە کاری نایاسایی دەکەن هەندێ جار هەڕەشەیەکی گەورەن بۆ سەر ڕکابەرەکانیان، زۆرجار پارە دەدەن بەپۆلیس تاوەکو دەست وەرنەدەن هەوڵە تایبەتییەکانیان نەکەن بۆ زاڵ بوون بەسەر بازاڕدا.

مەترسی گەشەی ئابووری لەوێوە سەرهەڵدەدات کاتێ گروپەکانی تاوانباران دەست دەکەن بەزاڵ بوون بەسەر کار و بازرگانییە یاساییەکانیش. باشووری ئیتاڵیا و ئەو ولاتانەی لە قۆناغی گواستنەوەن لە ئەوروپای ڕۆژهەلات و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو نموونەن بۆ ئەم خاڵە. گەلێ لە ولاتانی ئەمریکای لاتین و ئاسیا دووچاری هەمان مەترسی دەبنەوە. گروپە ڕێکخراوەییەکانی تاوان نەک هەر تەنها دەتوانن قازانجەکانی کارو بازرگانییە نایاساییەکانیان بەکاربێنن بۆ دەم و چاو بەستنی بەرپرسە گشتییەکان بەڵکو دەتوانن بۆ پەلکێشکردنی کارە یاساییەکانیش

بەکاری بێنن. واتە دەتوانن لە ڕێگەی پارە دانەوە کارە یاساییەکانیش ئاوێتەی خۆیان بکەن. ئەو قازانجەی لە کار و بازرگانییە نایاساییەکان دەست دەکەوێت، قازانجێکە بەبێ باجدان، کەواتە دەتوانرێت وەگەڕبخرێتەوە لە بازرگانییە ڕەواکان و بەدەست هێنانی قازانجی گشتی.

ئاستی بەرتیلدان زۆر بەرزە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ئەو وڵاتانەی کە لە پاش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دروست بوون. هەموو ئەو شتانەی کە بەردەستە بۆ هەر کەسێک کە ئارەزووی هەبێت کەمتر نییە لە پشکێک لە تەواوی سامانی دەوڵەت. بەهای پشکی تایبەتمەندێتی دەوڵەتێکی سۆشیالیست بەهای سوود و قازانجی پشک لە وڵاتانی پێشکەوتوو کەم دەکاتەوە. هەردوو گرووپی تاوانباران و بازرگانی ڕەوا بەدوای پشک دەگەڕێن لە سامانی دەوڵەتدا. گەر تاوانباران کەش و هەوایەکی پڕ لە گومان دروست بکەن و هەڕەشەیەک بن بۆ توندو تیژی، ئەوا ڕکابەران دوور دەخەنەوە، بەتایبەتی کۆمپانیا زەبەلاحە ڕۆژئاواییەکان، هەروەها گۆڕەپانێکی ئازاد بۆ گرووپی تاوانباران جێدەهێڵن. بەهەقیقەت، وەگەڕخستنی ڕاستەوخۆی دەرەوە FDI لە کار و بازرگانی شەرعی زۆر فراوان نەبووە لە وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و زۆر جیاوازیش بووە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر. یەک لێکدانەوە بۆ ئەم ئەنجامانە بێ هێزی دام و دەزگاکانی دەوڵەتە و گرووپی تاوانباران و گەندەڵی کاریگەریان لە سەر دروستبوونی ئەم ڕەوشە هەیە.

تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا، هەندێ کار و بازرگانی شەرعی زۆر بەتایبەتی موعەرەزن بۆ دزەکردن بۆ نێو چوارچێوەی تاوانەوە. تاوانی ڕێکخراو بەگرووپ سوود و قازانجێکی زۆری هەیە بۆ تاوانباران بەڵام هەناوی دەوڵەت دەخوات و بۆگەنی دەکات. نەک هەر تەنها ئامادەیە بۆ بەرتیلدان بەڵکو هەڕەشە و توندو تیژی بەکار دەبەن بۆ ئەوەی گرێبەستەکان وەرگرێت و ڕێگای خۆی بگرێتە بەر. لە هەرە سەرکەوتووترین نموونەکان، کار و بازرگانی شەرعی و یاسایی ئەوانەی کە لە ژێر دەستی مافیاکان بەڕێوە دەچن هەموو شتێک قۆرخ دەکەن بۆ ئەوەی ببن بەپاڵپشتێکی بەهێز بۆ کاریگەری تاوانی ڕێکخراو و بەگرووپ.

" دیاگۆ گامبێتا و پیتەر ڕۆیتەر" لیستێکی ئەو هۆکارانە ئامادە دەکەن کە دەبێتە



هۆی سەرهەڵدانی کۆنترۆڵی مافیا بەسەر بازرگانییە شەرعی و ناشەرعییەکاندا. لە حاڵەتە هەرە بەرچاوەکاندا جیاوازی بەرهەم هێنان و بەربەستەکان کەمن، تەکنەلۆژیا بەپێی پێویست نییە و کرێکار بێ بەهرەیە، داواش زۆر زۆرەو هەروەها پیشەسازی پێکهاتووە لە ژمارەیەکی زۆری کۆمپانیای بچووک بچووک. بۆ نموونە لۆریەکی زبڵ کۆکردنەوە بەنموونە دەهێنینەوە: یەکێک لۆریەک دەکڕێت، لە بەرئەوەی ئەو لۆریانە بەتەنیا لە سەر شۆستە گشتییەکان کار دەکەن، کەواتە ڕکابەرانی ئەو کەسە زۆر بەئاسانی دەتوانن هێرش بەرنە سەر ئەو لۆریە بەبێ ئەوەی پۆلیس هەر ئاگاداریش بێت. بۆ کەمکردنەوەی مەترسی تاوانی بەکۆمەڵ و ڕێکخراو، مافیاکان دەتوانن پارە بدەن بەپۆلیس بۆ ئەوەی سەیری شوێنێکی تر بکات نەک ئەو شوێنەی کە ئەوان کارە نابەجێیەکەی تیادا ئەنجام دەدەن.

بە هەمان شێوە، هەر کاتێک بازرگانێک پێویستی بەمۆڵەت هەبێت بۆ کارکردن، ئەوا توانای بەرتیلدانی هەیە بەبەرپرسان بۆ ئەوەی ڕەزامەندییان بەدەست بێنێت بۆ خۆی و لە هەمان کاتیشدا کاری ڕکابەرەکەی ڕەت بکەنەوە، ئەوا ئەو بڕە بەرتیلە سوودێکی بەرچاوی پڕ لە ڕکابەری بەرهەم دێنێت. یەکێتی کرێکار، بەپەیوەندی یان بەبێ پەیوەندی بەتاوانی ڕێکخراوەیی و بەکۆمەڵ، دەتوانێت ئەم تاکتیکە بەکار بێنێت. بۆ نموونە، بەرپرسێکی یەکێتی بیناکردن لە فلادلفیا دەستگیر کرا لە سەر ئەوەی بەرتیلی دابووە یەکێک لە بەرپرسانی ئیدارەی تەندروستی و سەلامەتی بۆ ئەوەی بەڵێندەرەکانی ڕکابەری بێزار بکات و دەست لە کارەکەیان بکێشنەوەو گۆڕەپانەکە بەتەنیا بۆ ئەو جێبهێڵن.

ئەو کار و بازرگانییانەی کە سەرچاوەی قازانجیان لە شارە سەرەکییە شارستانییەکانە زۆر لە مەترسیدان گەر هێزەکانی پۆلیسی ئەو وڵاتە بێ هێز یان گەندەڵ بن. ئەمە چێشتخانە و دوکانەکان دەگرێتەوە کە خزمەتی گەشتیار و بازرگانەکان دەکەن. کارگەکان و پیشە گەرەکان دەتوانن خۆیان لەو شوێنە سەرەکییانە دوور بخەنەوە، بەڵام کاری خزمەتگوزاری ناتوانێت خۆی حەشاردا و لە جۆڵەوانی بێت. گەر پۆلیس جێی متمانە نەبوو و خۆی بە بەرپرسیار نەزانێت، ئەوا گرووپی تاوانباران ڕەنگە داوای پارە بکەن بۆ پاراستن لەو شوێنەی کە گەنجینەکان

بەشێک لەو کارانە دەپارێزن لە هێرشەکانی ئەو گروپانە خۆیان.

کارەکانی وەک چاکردنەوەی ڕێگا و بان و دروستکردنی بینا، ئەوانەی کە کاری گەورە دەکەن لەگەڵ دەوڵەت ئەوانەش ڕەنگە پەنا بەرنە بەر تاوان و کاریگەرییان هەبێت. گەر حکومەتێک گەندەڵ بێت بەهۆی تاوانی بەکۆمەڵی پەیوەست بەکاری نایاسایی، ڕەنگە هەنگاوێکی کورت بێت بۆ بەرتیلدان بۆ بەدەستهێنانی گرێبەست بەپێی بەرژەوەندی ئەوان. لەو پەڕی تاوانی بەکۆمەڵ و کاری نایاسایی کەرتی بەڕێوەبردن سەرقاڵە بەبەرتیلدان بەبەرپرسان بۆ ئەوەی ڕازییان بکات و دەموچاویان ببەستێت لە بەرابەر ئەو کارەی کە دەیکەن. بۆ نموونە، لە باشووری ئیتاڵیا، ڕووپێوێک ئەوە دەخاتە ڕوو کە لە نیوەی زیاتری کارە بچووک و مام ناوەندەکان دەکشێنەوە لە تێندەرێکی گشتی پاش ئەوەی گرووپی تاوانی بەکۆمەڵ یانیش هاوپەیمانانی سیاسی ئەو گروپانە هەڕەشەیان لێ دەکەن.

سامان و قازانج و پەیوەندی نێودەوڵەتی گەلێ گروپی تاوانی بەکۆمەڵ ئەوە دەخەنە ڕوو کە کۆنترۆڵ کردنیان لە هەر وڵاتێکدا کارێکی ئەستەمە. ترسەکە ئەوەیە، کە سەرەڕای ئەوەی هەنگاوی پێشکەوتن وشک دەبێت و کاتی زیاتر گەرەکە، چالاکی تاوان زیاتر ئاوێتەی سیاسەت دەبێت و دواجار جیاکردنەوەیان کارێکی یەکجار سەخت دەبێت.



## ئەنجامەکان

یەکێک لەو لایەنانەی کە بەرگری لە بەرتیلدان و وەرگرتن دەکات جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە حکومەت حوکم و نیزامی نابەجێ و هەڕەمەکی دەسەپێنێت بەسەر کارەکاندا. گەر لە هەر دام و دەزگایەکی حکومی فەرمانبەران و بەرپرسانی برسی و تەمبەڵ و ناشایستەی لێ بێت، ئەوا پاڵنەری بەرتیلدان و وەرگرتن بەرز دەبێتەوە و هەروەها سوودەکەش ئاشکرایە، هەروەها کۆمپانیا زەبەلاحەکان و هاوڵاتیان دەتوانن لە ڕێگەی بەرتیلدان و وەرگرتنەوە کارەکەیان بەدڵی خۆیان ئەنجام بدەن. بەرتیل هەندێ جار نەک هەر تەنیا سوود بەبەرتیلدەر و وەرگر دەگەیەنێت بەڵکو کار لە سیستەمی یەکسانی و توانستی کار دەکات. وجودی ئەم جۆرە حاڵەتانە باسێکی بەردەست نییە بۆ چاوپۆشینی گەندەڵی فەرمانبەرانی پلە نزم.

یەکەم: کە ئاشکراترین حاڵەتە، هەموو بەرتیلێک ئەنجامی خۆی نییە. بۆ نموونە، وەک نەدانی باج، پێشێل کردنی یاساکانی ژینگە، ڕێگە پێدان بەکەسی ناشایستە و سوود پێگەیاندنی، هەروەها پاراستنی گروپی تاوانی بەکۆمەڵ. دووەم، گەر بەرتیل بەڕاستی دەبێتە هۆی خزمەتکردنی کارێک ئەوا دەبێ بەیاسایی بکرێت و دەسکەوتەکەش دەبێ بەئاشکرا ڕابگەیەنرێت. هەر بازاڕێک وەستا بێت لە سەر بەرتیل ی نایاسایی ئەوا بازاڕێکی گەندەڵ و ناشایستە و بێ کەڵکە.

سێیەم: بەرگری لە بەرتیل وەک ئالیەتێکی تەرخانکراو و نەگۆڕە. کۆمەڵێک یاسا و پرۆگرامی داواکاری گشتی دەدات بەدەستەوە. لە بری ئەوە، بەرپرسی گەندەڵ، کە سوود لە پەسەند کردنی بەرتیل دەبینێت، دواجار دەسەڵاتی ئەوەی دەبێت چالاکیەکانیان بەشێوەیەکی تر بخەنەوە گەڕ. ڕەنگە کار بەئەنقەست دوا بخەن و کەم کارەکان ڕابپەڕێنن و وا لە موراجیع بکەن ناچار بێت بەرتیلیان باتێ. ڕەنگە هەڕەشەی گرتن و تاوان بەسەریاندا بسەپێنێت. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، تاک دەتوانێت پاساو بۆ بەرتیل بهێنێتەوە وەک ڕێگایەک بۆ نەهێشتنی زەرەری گەورەتر، بەڵام زەرەری سیستەماتیکی زەرەری ترسناک و جدین. لەگەڵ ئەوەش، چاوپۆشین و

لێبوردن لە هەندێ ناوچەی ژیانی گشتیدا ڕەنگە خەڵکی زیاتر و زیاتر هان بدات بۆ ئەوەی پەنا بەرنە بەر گەندەڵی و فڕو فێڵ.

چوارەم: گەندەڵی گشتگیر شەرعیەتی حکومەت کەم دەکاتەوە. گەندەڵی لە دابینکردنی خزمەتگوزاری و کەلوپەلی گشتی و هەروەها لە ڕووی نرخەکانەوە بەربەستێکی گەورە دەخاتە بەردەمی شەرعیەتی حکومەت. بەرتیلدان و وەرگرتن بەدیلێکی جێگیر و درێژخایەن نییە بۆ یاسای چاکسازی.



## گەندەڵی گەورە بەرپرسان

گەندەڵی گەورە لە نێو گەورە بەرپرسانی حکومەت ڕوودەدات و دزە دەکاتە نێو پرۆژە و بەرنامە گەورەکانی حکومەت. حکومەت زۆرجار سوودی دارایی زۆر گەورە دەگوازێتەوە بۆ کۆمپانیا گەورە تایبەتییەکان لە ڕێگەی گرێبەستی خاوەنێتی و بەخشیشی حکومەتەوە. بەرتیل کاری قۆرخکردن دەگوازێتەوە بۆ وەگەڕخەرە تایبەتییەکان لەگەڵ پشکێک بۆ بەرپرسە گەندەڵەکان. پرۆسەی کاری تایبەتی و خزمایەتی موعەرەزە بۆ گەندەڵی مامەڵەی ناوەوە.

### پارەدان بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم و گرێبەستی گەورە

بەرتیل و پارەدان بۆ بردنەوەی بەرهەم و گرێبەستی گەورە بەشێوەیەکی گشتی لە بەرژەوەندی بەرپرسە گەورەکان و بازرگانە گەورەکاندایە. حاڵەتە گرینگەکان خەرجییە بەردەستەکانی بودجە دیاری دەکەن و کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لە سەر بودجەی حکومەت و باری گەشەی وڵات. ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە لە ڕاستیدا لە ژێر دەسەڵاتی بەرپرسە گەورەکاندایە و زۆرجاریش دەستە فرە نەتەوەییەکانیش بەتەنیا یان بەهاوبەشی کار دەکەن لەگەڵ شەریکە مەحەلییەکان.

گەر حکومەت کڕیار یان بەڵێندەر بێت، هۆگەلێک هەن لە پاڵ پارەدان بە بەرپرسان.

یەکەم، کۆمپانیایەکی گەورە ڕەنگە پارە بدات تاوەکو ناوەکەی بخرێتە نێو لیستی ئەو کۆمپانیایانەی کە ئەو کارە دەکەن.

دووەم، ئەو کۆمپانیایە ڕەنگە پارە بدات تەنیا بۆ وەرگرتنی زانیاری نهێنی لە بارەی کارەکەوە.

سێیەم، بەرتیلدان و وەرگرتن ڕەنگە دەمی بەرپرسان شیرین بکات تا ڕێگە خۆش بکەن تەنها بۆ ئەو کۆمپانیایەی کە دەیەوێت ئەو کارە بەدەست بێنێت.

چوارەم، کۆمپانیایەکی گەورە ڕەنگە پارە بدات بۆ ئەوەی وەک بەڵێندەری سەرەکی دەستنیشان بکرێت. پێنجەم، هەرکە کۆمپانیایەکە گرێبەستەکە دەباتەوە، ڕەنگە ئەم جارە پارە بدات بۆ ئەوەی نرخی باشتر وەرگرێت و چاوپۆشی لێ بکرێت لە سەر جۆری ئەو کەرستەیەی کە بەکاری دەبات بۆ کارەکە.

گەندەڵی لە کاتی گرێبەستدا لە هەموو وڵاتێکدا هەیە، تەنانەت لەو وڵاتانەش کە لەوپەڕی ڕاستگۆییدان وەک وڵاتانی ئەسکەندەناڤی و سەنغافورا و نیوزلەندا. چەند نموونەیەک حاڵەتی ئەم جۆرە گەندەڵییە دەخەنە ڕوو.

لە پاراگوای، گەندەڵی لە گرێبەستەکانی پێکهاتەی نێودەوڵەتی لە سەردەمی ڕژێمی سەرۆک ئەلفرێدۆ ستروسنەر ( ١٩٥٤–١٩٨٩) لە سەدا ١٠ تا سەدا ٢٠ دەخەملێنرێت. گەندەڵی یارمەتی بەرزکردنەوەی نرخی دروستکردنی سەدەی ئیتاپوی دا لە سنووری بەڕازیل و بووە هۆی دروستکردنی چەند پرۆژەیەکی تر کە لە سەرووی پێداویستی مەحەلی بوو. لە ئەندەنووسیا، لە حەوتاکان، دوو کۆمپانیای ئەڵمانی بەرێژەی لە سەدا ٢٠ بەهای گرێبەستێک بەرتیلیان دابووە بەرپرسێک بۆ دروستکردنی پۆڵا کە خاوەنی کۆمپانیایەکی نەوتە.

لە زیمبابۆی، ڕێکەوتنێکی نێوان وەزیرەکان لە بواری پۆستە و گەیاندندا لەگەڵ کۆمپانیایەکی گەیاندنی سویدی بووە هۆی بەدەستهێنانی تێندەرێک. سوود و قازانجەکە لەم ناوەدا بە٧,١ ملیۆن دۆلار دەخەملێنرێت. لە ڕێکەوتنێکی فرۆکەدا لە کۆریای باشوور چەندین کۆمپانیای ئەمریکی بەرتلیان دابووە سەرۆک ڕۆتەی وو. پرسیار لە سەر داواکاری فرە نەتەوەییەکان کرا، بەڵام هەموو جۆرە دەستێکیان لەو مامەڵەیە ڕەت کردەوە. لە مامەڵەیەکی تردا، ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی "ڕۆ تەی وو" دانی بەوەدانا کە بەرتیلی وەرگرتووە و بە٣٠٠٠٠٠ دۆلار دەخەملێنرێت. فەزاعەتێکی گەورە لە سەنغافورا گەلێ کۆمپانیای فرەنەتەوە و بەرپرسە گەورەکانی دەستەی گشتی وڵاتی گرتەوە. بەرپرسەکان بەرتیلیان لە بەرابەر ئاشکرا کردنی زانیاری لە سەر تەندەرەکە وەرگرتبوو. حاڵەتەکە بووە هۆی ئەوەی پێنج لەو کۆمپانیا گەورانە خرانە نێو لیستی ڕەشەوە. بەرپرسەکەش چوار ساڵ حوکم درا بۆ بەندیخانە.



گەندەڵی گەورە شتێکی سنووردار نییە بۆ نەتەوە پێشکەوتووەکان بەمامەڵە کردن لەگەڵ کارە فرە نەتەوەییەکان. هەندێ ڕووداوی تری لەم جۆرە زیاتر بەرچاو دەکەوێت لە وڵاتە پیشەسازیەکان. لە ئەڵمانیا، بۆ بەدەستهێنانی گرێبەستێک بەگوژمەی دوو ملیار و نیو دۆلار بۆ دروستکردنی تێرمینالی دووەمی فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت بەرتیلێکی زۆر درا بەلایەنی بەرپرس. بەپێی ڕاپۆرتەکان گەندەڵی بووە هۆی زیادکردنی لە سەدا ٢٠ تا ٣٠ ی نرخەکان. لە سەینماریتایمی بەشی فەڕەنسی چواردە کەس کاری گەندەڵییان کردووە بۆ بەدەستهێنانی گرێبەستی کۆمپیوتەر. خزمەتگوزارە مەدەنییەکان دەستکاری ڕێنماییەکانیان کرد کە بووە هۆی زەرەرێکی زۆر گەورە و بە٥٠ ملیۆن فرانک دەخەملێنرێت، ئەمە بەپێی ڕاپۆرتێکی وەزارەتی ناوخۆی فەڕەنسا. لە بەلجیکا، ١,٩ ملیۆن دۆلار وەک بەرتیل دراوەتە بەرپرسە گەورەکانی حیزبی سۆشیالیست بۆ ئەوەی بەرگری لە گرێبەستێک بکەن. لە ئیتاڵیا، نرخی گەلێ پرۆژەی سەرەکی بونیاتنان داشکانی بۆ کرا بوو بەواستە و بەرتیل پاش ئەوەی بەدیار کەوت لە لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوەی سەرەتای نەوەدەکان. نرخی پرۆژەی دروستکردنی تونێلی میلان لە ٢٢٧ ملیۆن دۆلارەوە بەبەرتیل داشکا بۆ ٩٧ ملیۆن دۆلار، هەروەها نرخی دروستکردنی تێرمیناڵێکی نوێ لە ١,٣ دابەزی بۆ ٣,٢ ملیۆن دۆلار. هەموو ئەم داشکاندنانەش بۆ ئەوە بوو کالای خراپ بەکار بێنن و قازانجێکی زیاتر بکەن. هەوڵە سەرکەوتووەکان بۆ تەندەر لە سەدا ٤٠ تا ٥٠ بوو لە ساڵی ١٩٩٧ ئەمەش باشتر بوو لە پێنج ساڵ پێش ئەو کاتە.

گەورەترین فەزاعەتی گەندەڵی لە وەزارەتی بەرگری ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بوو لە سەر پرۆژەیەک لە سەر نووسینگەی فیدراڵ بۆ لێکۆڵینەوە کە لە ڕێگای پارە دان و بەرتیلەوە گرێبەستەکە وەرگیرا.

هەموو کارە گەندەڵییەکان تەنیا لە سەر پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە و بونیاتنان نین. ئەو کالا و کەرەستەیەی کە بەکار دەهێنرێت لە پرۆژەیەک زۆر نزیکە لەوەی کە لە ڕێگای بەرتیلەوە تەواو یان بەباشی بەکار نەیەن، زانین و ئاشکرا کردنی ئەمەش زۆر ئەستەمە چونکە دوای تەواوبوونی پرۆژە تۆ ناتوانی بزانی چەند و چ جۆرە مەوادێکیان بەکار هێناوە. بۆ نموونە، لە مالاوی، ورد بینەکان بەوەیان زانی کە بای چەندین ملیۆن دۆلار کالا فرۆشرا بوو لە لایەن گەنجینەی حکومەتەوە کەچی یەک

دۆلاریش دیار نەبوو. لە کینیا، حکومەت ملیۆنێک و نیو دۆلار زەرەری کرد لەبەرئەوەی وەزارەتی تەندروستی دەرمانی بەسەرچووی کڕیبوو بەنرخێکی هەرزانتر.

ئایا هیچ شتێکی غەریزی هەیە لەو حاڵەتانە جگە لە قەبارەی مامەڵەکان؟ لە ئاستێکی دیاریکراودا، توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندووە کە حکومەت پارەیەکی ئێجگار زۆر زەرەر دەکات لەم حالەتانەدا. هەروەک پێشتر، گەندەڵی سیستەماتیکی دەتوانێت ببێتە هۆی لە ناوبردنی توانستەکان و کەمکردنەوەی پێشبڕکێ. ڕەنگە ژمارەی موشتەرییەکان کەم کاتەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە هەمیشە لە ڕێگەی بەرتیلەوە پرۆژەکان وەردەگرن و دەست بەسەر تێندەرەکاندا دەگرن و بازاڕ قۆرخ دەکەن، هەروەها هەر ئەوانەشن زانیاری لە سەر تێندەر نادەن بەهیچ کەسێکی تر جگە لە خۆیان، هەروەها بۆ کەسانی تر نرخ زۆر زیاتر دەکەن تاوەکو کەس نەتوانێت خۆی لە پرۆژەکان بدات. بەڵام، پێوانەی مامەڵەیەکی گەندەڵ و دەم شیرین بوونی بەرپرسی گەورە مامەڵەی نوێتر دەهێنێتە نێو بازاڕەوە. یەکەم، گەر بەرپرسە هەرە بەرزەکان، بەسەرۆکی دەوڵەتیشەوە، زیاتر بایەخ بەسوود و قازانجی شەخسی خۆیان بدەن، ئەوا پەنا دەبەنە بەر ڕێگای ناشەرعی و فڕوفێڵ هەروەها فێڵ لە کات و شوێن و ژێرخانی وەگەڕخستن دەکەن بۆ قازانجی شەخسی خۆیان. دووەم، بڕیارەکانی وەگەڕخەران ڕەنگە کاریگەری ئەو واقیعەی لە سەر بێت کە مامەڵە لەگەڵ سەرکردەی سیاسیشدا بکەن.

## بەرپرسان

با ڕەچاوی بڕیاری بەرپرسان بکەین وەک ڕێژەیەکی گۆڕاو. کاریگەری گەندەڵی ئاست بەرز دەچێتە ئەودیو پێوەری وەگەڕخستنی حکومی و لە دەستدانی داهات بۆ بودجەی حکومی. بەرپرسە هەرە بەرزەکان ڕەنگە چەند پرۆژەیەک هەڵبژێرن و بەنرخێکی ناماقوڵ کڕین و فرۆشتن بکەن. بۆ نموونە، قازانج لە ڕێگەی بەرتیلەوە ئاسانتر بێت لەوەی کە لە وەگەڕخستنی سەرمایە و مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بەدەست دەکەوێت، فەرمانڕەواکان زیاتر بەلای پرۆژەی سەرمایەدارەکاندا دەچن بۆ



باشتر کردنی باری ئابووری خۆیان. توێژینەوەیەکی قووڵ ئەوەی دەرخستووە کە گەندەڵی ئاست بەرز ئاوێتەی وەگەڕخستنی ئاست بەرز دەبێت وەک وەگەڕخستنی ڕاستەوخۆی دەرەوە. ئەو وڵاتانەی کە زۆر گەندەڵن زۆر کەم سەرف دەکەن لە سەر کارەکانیان و ژێرخانێکی زۆر نزمیان هەیە. بەرپرسی گەندەڵ زیاتر ئارەزووی پرۆژەی سەرمایەدارانی گشتی دەکات لەوەی کە لە سەرمایەدارو وەگەڕخەرە تایبەتەکان چونکە سوودێکی ئێجگار زۆر بەدەست دێنن. بەرپرسان هەمیشە پشتگیری ئەو پرۆژانە دەکەن کە ناسراون بە" فیلی سپی" واتە هەمیشە بەردەست بە بەهایەکی کەم لە پێشخستنی گەشەی ئابووریدا.

داوا بۆ چیمەنتۆ یەکێکە لە بەخشیشەکان! لە نێجیریا لە ساڵی ١٩٧٥ دا حکومەتی سەربازی داوای چیمەنتۆی کرد کە کۆی گشتی دوو لە سەر سێی پێویستییە خەملێنراوەکانی ئەفریقیا بوو کە لە توانای بەرهەم هێنانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو تێپەڕ دەکات. نرخ بەرزتر بوو لە نرخی نێو بازاڕی نێودەوڵەتی بەهۆی لادانێکی فراوان، ڕێکخستنی ژوورێک بۆ بەرتیل کۆکردنەوە، هەروەها کۆمپانیای گواستنەوەی باریش قەرەبوو کردنەوەی کۆدەکردەوە لەبەرئەوەی لە بەندەری داخراوی لاگۆس چاوەڕوانیان کردووە. زیانەکە بۆ نێجیریا ٢ ملیار دۆلار بوو، واتە چارەگێکی داهاتی نەوتی ساڵی ١٩٧٥ لە ئیتاڵیا دەرامەتی ساڵانەی چیمەنتۆ دوو ئەوەندەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و سێ ئەوەندەی ئەڵمانیا و بەریتانیا بوو. پێداچوونەوەیەک لە پرۆسەی " دەست پاک کردنەوە" لە گەندەڵی لە ئیتاڵیا ئەوە ئاشکرا دەکات کە گەلێ پڕۆژەی بونیاتنان زۆر بەئاسانی فڕفێڵی تیادا کراوە و بەنرخێکی زۆر بەرز جێبەجێ کراوە، هەروەها هیچ شتێکی بەردەستیش نەبوو کە توانای ئەوان بسەلمێنێت لە بەرتیل دان و وەرگرتن، زۆر بەئەستەم ئەم جۆرە گەندەڵیانە ئاشکرا دەبن.

بۆ پرۆژەی زۆر گەورە و بەسەرمایە کاتی ڕێگای سوودەکانی تۆڕی گەندەڵی ڕەنگە زۆر جیا بێت لە شێواز و ڕێگەی سوودەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی. ئەمە کار لە هەڵبژاردەکانی حوکم دەران دەکات. وا دانێ کە سوودەکانی بەرتیل دان و وەرگرتن بەشێوەیەکی ڕێژەیی زۆر دووپات دەکرێتەوە لە گەرماوگەرمدا لەوەی کە لە تەواوی

پڕۆژەکە بەدەست دەکەوێت. بەلایەنی کەم هەندێ لە بەرتیل دەدرێت پێش ئەوەی پڕۆژەکە دەست پێ بکات. پاشان تەنانەت بەرپرس و خەڵکانیش بەهەمان ڕێژە کەم دەبنەوە، ئەوا بەرپرسەکان پشتگیری ئەو پڕۆژە و سیاسەتانە دەکەن کە کاتی ڕێچکەی بەڕێوەچوونی سوودەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی پڕ بەپێستی خۆی نییە. بۆ نموونە، لە پرۆژە گەورەکانی بونیاتناندا، سەرکردەکانی وڵاتێک ڕەنگە لە کاتی ئێستادا سوود وەرگرن لە بەرتیل وەرگرتن، بەڵام ڕەنگە دووچاری زەرەر بن لە داهاتوو بەهۆی کەمتەرخەمی و کەموکوڕی لە کارەکەی یانیش بەهۆی قەرزێکی زۆرەوە.

وێڕای ئەمەش، بەرپرسە گەندەڵەکان ڕەنگە ڕێژەیەکی بەرزتری داشکانیان هەبێت لەوەی لە هاوڵاتیانی وڵاتدا. تەنانەت بەرپرسێک کە کۆنترۆڵێکی ماوە کورتی هەیە بەسەر کۆمەڵگا ڕەنگ نییە داهاتووی خۆی بەمسۆگەری لە بەر چاو بێت، بۆ یە پەنا دەباتە بەر گەندەڵی لەو ماوە کورتەدا تا بەزووترین کات گیرفانی خۆی پڕ بکات. بۆیە دەستی ناپاک و دزی ئەو بەرپرسە دەبێتە هۆی دروستکردنی داهاتوویێکی نامسۆگەر و لەوانەشە بەزووترین کات لاببرێت لە سەر کار ( گەر لێپێچینەوە هەبێت)، بۆیە مسۆگەر نەبوونی داهاتووی وای لێ دەکات زیاتر بدزێت و هەمیشە نیگەران و چاو ئەبڵەق بێت. لە ئەنجامی ئەوەشدا، بۆیە ڕێژەیەکی زۆر لە پرۆژەکانی حکومەت بۆ خۆی گلّ ئەداتەوە و پشتگیری ئەو پرۆژانە دەکات کە لەم ماوە کورتەدا بەرتیلی تیایە بۆ ئەو، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی حکومەت و هاوڵاتی لە داهاتوودا باجی ئەم دزینە بدەن. بەپێچەوانەوەش، بزووتنەوەیەکی چالاک کە شوێنی ئۆتۆکراتێک لەق دەکات دەبێتە هۆی زیاد بوونی گەندەڵی و پەیڕەو کردنی سیاسەتی زۆر خراپتر هەروەک بەرپرسەکە لە وەڵامیدا دەیکات بۆ بارە شڵۆق و لەقەکەی. بەکورتی، بەرپرسی گەندەڵ پشتگیری ئەوە دەکات کە پڕۆژەکان بەکاتێکی کەم تەواو بێت لە سەردەمی بەرپرسیارێتی ئەودا، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرپرسەکە لە سەر حیسابی سوود و قازانجی کۆمەڵایەتی پارەیەکی خەیاڵی لێ بدات و بخاتە نێو گیرفانی خۆیەوە.

دەشێ دەسکەوتەکانی گەندەڵی لە بەرهەمی حکومەتیشدا بەدەست بهێنرێن.



بەرپرسان ڕەنگە قەیرانێکی مەترسیدار دروست بکەن نەک هەر تەنیا لە ڕێگەی پشتگیری کردنی زۆربەی هەرە زۆری پرۆژە سەرمایە دارەکان بەڵکو لە ڕێگەی سەرنەکەوتنی بەدەست هێنانی دەست مایە لە بەرهەمەکانی حکومەت بۆ سەرچاوە سروشتیەکان وەک کانزای ڕەق و سووتەمەنی و داری بینا دروستکردن. ئەو دەستمایانەی کە دەبێ بچێتەوە نێو بودجەی حکومەت، بەپێچەوانەوە، لە ڕێگەی گەندەڵیەوە دەچێتە نێو گیرفانی بەرپرسێک و بەڵێندەرە تایبەتییەکان. بۆ نموونە، هەندێ لە وڵاتان بەرهەمی داری خانوویان بەنرخێکی زۆر زۆر هەرزانتر لەوەی بازاڕیان فرۆشتووە. گویانا و سورینام لە باکووری ئەمریکای باشوور و هەروەها پاپوا نیو گینیا و دوورگەکانی سۆلۆمۆن لە زەریای هێمن هەموو ئەمانە گرێبەستی لامەرکەزیان مۆر کردووە لەگەڵ کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان.

## کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان

ئێستا با باسی بڕیاردەرانی گۆڕینی ڕێژەی وەگەڕخەرانی دەرەوە بکەین. گەندەڵی بەرپرسان لایەنێکی تری پڕ لە گومان بۆ کەش و هەوای وەگەڕخستن زیاد دەکات. بەرپرسان ڕەنگە بەزەحمەتی بزانن پابەندبوونێکی باوەڕپێکراو دروست بکەن بۆ ئەوەی هەر بمێننەوە لە پۆستەکەیان، هەروەها دەوڵەتیش هەمیشە بەرژەوەندی تاوانەکانی زاڵ دەبێت بەسەریدا کە ئەمەش دەبێتە هۆی سەپاندنی نرخی زیادە لە سەر شەرعیەتی کارەکان لە فۆرمی داواکانی پاراستنی پارەدا. نەبوونی میکانیزمی پابەندبوونێکی باوەڕ پێکراو ڕەنگە زۆر ئاستەنگی هەبێت لە بەردەم قایل کردنی وەگەڕخەران لە وەگەڕخستنی سەرمایە چونکە ڕەنگە ترسیان هەبێت لەوەی سوودە تایبەتییەکانیان بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت یان دووچاری باجێکی زۆر ببنەوە. تەنانەت گەر بەرپرسێک حەزی بەچەواشەکاری تۆڕی سوودەکان نەبێت و داشکان لە ڕێژەی داهاتووی هاوڵاتی نەکات، ئەوا وجوودی ئەو کەسە وەک سەرۆک دەوڵەتێک کار لە حیساباتی وەگەڕخەران دەکات. تەنها ئەو وەگەڕخەرانەی کە ئامادەن پابەند بن بەفەند ڕەنگە هەر ئەوانە بن کە لەگەڵ ماوەی کورت و کاتین و بەکورترین ماوە خۆیان دەوڵەمەند بکەن و گیرفانیان لە سەری بڕژێت.

به کورتی، ئەنجامی ئەمەش، ئاشکرایە کات لە بەرژەوەندی سوودی گشتی نییە بەڵکو لە بەرژەوەندی تاکێکدایە. بەرپرسەکە کەیفی بەو پرۆژانە دێت کە سوودیان هەیە و لە ماوەیەکی کورتیشدا تەواو دەبن، بۆیە هەر ئەم جۆرە پرۆژانەن کە لە بەرژەوەندی وەگەڕخەرە فرە نەتەوەییەکانن. شازەکانیش ئەو وڵاتانەن کە تیایدا بەرپرسێک توانیویەتی متمانەیەک بۆ خۆی دروست بکات و لە کارەکەی هەر بمێنێتەوە و لانەدرێت، ئەمە متمانە بەوەگەڕخەرەکانیش دەبەخشێت. ئەو وڵاتانە دەتوانن گەشە و وەگەڕخستنی بەرزیان هەبێت هەرچەندە شێوازی وەگەڕخستنەکان لە نێو کەرتەکاندا بەشێواوی بمێنێتەوە. ئەندەنووسیا لە ژێر دەستی سەرۆک سوهارتۆ دیارە نموونەیەکی باشی ئەم حاڵەتەیە کە تیایدا گەلێ کاری وەرگەڕخستن، هەرچەندە نرخیان پڕ بەپێستی خۆی نییە، بەڵام بەلایەنی کەم لە ئارادایە. لە ساڵەکانی دواتری ڕژێمی سوهارتۆ هەرکە مەسەلەی جێگرتنەوە سەری هەڵدا، گەڕان بەدوای سوودی تاک کەسی لە لای مناڵەکانی سوهارتۆ و دارو دەستەکانیان ڕوو لە زیاد بووندا بوو، کە نیگەرانیان زیاتر دەبوو لە بارەی داهاتووەوە.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە گەندەڵی نێو کۆمپانیا هەرە گەورەکان ئەوە بەنموونە دەهێنینەوە کە کۆمپانیایەک لە ڕێگەی بەرتیلەوە پرۆژەیەک بەدەست دێنێت و پێشبڕکێکانی بەپارە دەکشێنێتەوە. ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە کاتێ گەندەڵی بازاڕ شتێکی لە بارە تاوەکو بازاڕ کار بکات وەک پرۆسەیەکی نموونەیی پێشبڕکێ کارانە و ئەو ڕێژەیەی گەندەڵی بەرپرسێک لە کاتدا دەستی دەکەوێت بارتەقای سوودی یەک کۆمەڵگایە. بۆ نموونە، لە ئەنجامی گەندەڵیدا، حکومەت کەمتر لە بەهای بازاڕ بەدەست دێنێت بۆ ئەو سەرچاوانەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی دایە. گەر گەندەڵی سنورێکی بۆ دانەنرێت و بەرپرسانیش نەتوانن کار لە قەبارەی داشکان بکەن، ئەوا بەرتیل دەری گەورە ئەو کۆمپانیایە دەبێت کە زۆرتریت سوود دەستە بەر دەکات. هەروەها لە پێشترین کۆمپانیایە کە بەرزترین نرخ پێشکەش دەکات لە کاتی مەزاتدا. تەنیا بودجەی حکومەت بەدەستی زەرەرەکانەوە دەناڵێنێت ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەت باجی و زیاتر داوا بکات یانیش دەست هەڵبگرێت لە پرۆژە و پرۆگرامە گشتییەکان. بەڵام بەرپرسی ڕاستگۆ زانیاری چەواشە وەردەگرێت لە سەر



بەهای داشکان و لەوانەشە لە داهاتوو کەمتر پشتگیری داشکانی نرخ بکەن. لەم حاڵەتە سادە و پێشبڕکێ کاریە، بۆ براوە هیچ جیاوازی نییە کە بەرهەمەکە لە ڕێگای مەزاتێکی ڕاستگۆیانە یان بەفڕوفێل بەدەست هێنراوە.

بەڵام ئەم حاڵەتە ناڵەبارە بەدەگمەن سەردەکەوێت. لە کردەوەدا، بەرتیل بەدەست دێت لە بەشێک لە دەستمایەکان ئەگەرنا دەچێتەوە لای حکومەت و بەشێکی دیکەش لە سوودەکانی کۆمپانیای براوە. گەر بەرپرسێک دەسەڵاتی بەرزکردنەوەی زیاتر بوو لەوەی کە ڕاستگۆ بێت، ئەوا دەتوانێت بەشێکی زیاتر لە بەرتیل دەستەبەر بکات. وێڕای ئەمەش، بەرپرسی گەندەڵ ڕەنگە زۆرجار کاریگەری لە سەر مامەڵەکە و گرێبەستەکە هەبێت کە بەچەشنێک بەرزی بکاتەوە سوودی هەم بۆ خۆی و هەمیش بۆ کۆمپانیا هەبێت بەدوو قات. بەئەنجامدانی ئەم کارەش، نرخ و بەها دەبنە قوربانی کە گرێبەستێکی بەدانووسان و ڕاستگۆیانەی لێ دەکەوێتەوە. بۆ نموونە، لە گرێبەستێکی داری خانوو بەرەدا، ڕەنگە داری خراپ بەکار بێنن ئیتر لایەنی ژینگەیی و ڕووخانی ئەو خانووە و سەلامەتی خەڵک پشت گوێ دەخرێت، کەواتە کارەکە تەنیا پێکەوە دەنرێت. لە ئەندەنووسیا، بۆ نموونە، ڕووخانی خانووبەرە بەهۆی خراپی جۆری دارەکە گەلێ زۆرە.

ئێستا با باسی ئەوە بکەین گەر کۆمپانیایەک پرۆژەیەکی درێژ خایەنی وەرگرت و لە ڕێگای زیاد کردنی بەرتیلیشەوە داشکانی زۆر بۆ کرا لە نرخەکەی. گەر کار بکات لە نێو بازاڕی نێودەوڵەتیدا، ئەوا دەرەنجامی کارەکانی دەبێ بوەستێتە سەر بازاڕی داری خانووبەرە. ئەو واقیعەی کە بووە هۆی داشکانێکی زۆر نابێت بەهیچ شێویەک کار لە بڕیارەکانی بەرهەم هێنان بکات. بەڵام کۆمپانیاکە هەر چاوی لە سوودێکی یەکجار زۆرە، هەروەها پارەی ئەو داشکانەش چوو لە ئاو! زیانی گەندەڵی لە لایەن خەزێنەی حکومەتەوە درکی پێکراوە، بەڵام هیچ جۆرە نەشیاویەک بەبازاڕی نێودەوڵەتی داری خانوو بەرە ئاشنا نەکراوە. تەنانەت گەر تەواوی نرخەکە لە سەرووی ئەوەی چاوەڕێ دەکرێت بێت لە سیستەمێکی ڕاستگۆیانەوە، ئەوا نابێت هیچ کاریگەریەکی هەبێت.

بانگەشەی نەبوونی کاریگەر لە سەر هەڵسوکەوتی کۆمپانیا زۆر ئاسانە بۆ

ڕەنگدانەوەی واقیع. زاراوە کردەییەکان مسۆگەر کردن و ماوەی درێژخایەنن. سروشتی گەندەڵی ڕێکەوتنێک چەند گومانێک دروست دەکات کە کاریگەری دەبێت لە سەر ئەو ڕێگایەی کە کۆمپانیا گەورەکان گرتوویانەتە بەر بۆ کار کردن. ئاستەنگەکان ڕەنگە سەرهەڵ بدەن هەتا گەر شیاوترین کۆمپانیا بیباتەوە. سروشتی گەندەڵی ڕێکەوتنێک ڕەنگە ئاڕاستەیەکی ماوە کورت ببەخشێت بەکۆمپانیاکە. بۆ ئەمەش ئەم دوو هۆیە هەن: یەکەم، بەڵێندەرەکە ڕەنگە لەوە بترسێت کە ئەوانەی لە سەر دەسەڵاتن ڕەنگە پاش ماوەیەکی کورت لە سەر کارەکە لادرێن لە بەر گەندەڵی. دووەم، هەتا گەر ڕژێمی هەنووکە هەر لە سەر دەسەڵات مایەوە، براوە ڕەنگە لە سەپاندنی یاسا و حوکمی هەڕەمەکی داوا داراییەکان بترسێت کاتێ وەگەڕخستن دەچێتە ژێر ئاو و دەخنکێت. ڕەنگە خەمی ئەوەیان بێت نەوەک بەرپرسەکە ڕێگە بەپێشبڕکێ کاران بدات بێنە نێو بازاڕەوە یاخود نیگەران بن لەوەی کە گرێبەستەکەی هەڵبوەشێتەوە لە بەر هۆکاری سیاسی یاخود لە بەر چاوچنۆکی و چڵێسی. لە ڕابردوو گەر بەرتیل هەبوایە، کۆمپانیاکە موعەرەز بوو بۆ داوای چاوەڕێ نەکراو لە داهاتوودا. لە بەر هەموو ئەو هۆیانە، کۆمپانیایەکی گەندەڵ لە سەر گرێبەستی داری خانووبەرە ڕەنگە درەختەکان زۆر بەخێرایی ببڕێتەوە لەوەی کە لە وڵاتە ڕاستگۆیەکاندا هەیە. وەک وەگەڕخەرەکانی تر لە بارودۆخە مەترسیدارەکاندا، ڕەنگە دوودڵ بن لە وەگەڕخستن لە سەرمایەکی نەجووڵاو چونکە ئەرکی هاتنە دەرەوە لەوڵات زەحمەت دەبێت یاخود دەبێت مەرجەکان بگۆڕێت. بۆ نموونە، یەکێک لە ڕێگایەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە لە ناوچەیەکی کارەبادا دەبێ وێستگەیەکی کارەبا دروست بکرێت لە سەر کەشتییەکی گەڕۆک. ئەم جۆرە وێستگانە لە شوێنێک دانراون لە گەڵێ وڵاتانی پێشکەوتوو بۆ چوونە دەرەوە بەشێوەیەکی ڕێژەیی هەرزان. بەکورتی، هەردوو کاتی دانانی بەرهەم هێنان و دەرامەتی تێکەڵ ڕەنگە بەچاوێک هەڵبژێردرابن بۆ ئەو مەترسییە تایبەتییانەی کە لە لایەن سروشتی گەندەڵی سیستەمەکەوە ئاشنا دەکرێن.

وێڕای ئەمە، گەندەڵی بەدەگمەن دیار دەکرێت لە یەک جار پارەدان بەبەرپرسە بەرزەکان. لە بری ئەوە، ڕەنگە کۆمپانیایەکی براوە زیاتر ئامادەیی هەبێت لەوانی تر



بۆ ئەوەی بەردەوام بەرتیل ، زۆر یان کەم، بدات، ئەوەی گرینگە ئەو بەردەوام بێت لە سوود و قازانجەکانی لە ڕێگەی گەندەڵییەوە. بۆ نموونە، گەر داشکاندنی داری خانوو بەرە قەدی داری هەرە جۆرە باشەکە بێت، ئەوا کۆمپانیاکە پارە وەک بەرتیل دەدات بەپشکنەران تاوەکو جۆری دارەکەی نەپشکنن چونکە داری خراپ بەکاردەهێنێت لە پرۆژەکەدا. هەروەها کۆمپانیاکە لەوانەیە داری زیاتریش ببڕێتەوە لەوەی کە داشکانەکە ڕێگەی پێ دەدات. لە ژێر گرێبەستێکی بیناسازیدا، بەرتیلدەری هەرە ئاست بەرز ئەوانەن کە پارە دەدەن بەپشکنەران تاوەکو چاو لە کارە خراپەکەی بپۆشێت و کارەکەیان نەوەستێنێت کە پێوەری سەلامەتی نەتەوەیی نەگرتۆتە بەرچاو. لە ڕاستیدا، پێشبینی پەیوەندییەکی بەردەوام بۆماوەیەکی درێژ دەبێتە هۆی هۆکارێکی سەرەکی گرێدانی گرێبەستی گەندەڵی ئاست بەرز. لە ڕووی ئەلتەرناتیڤەوە، کۆمپانیای گەندەڵ خۆی هەندێ جار ئەو بەڵێنەی کە دابووی بۆ پارە دان وەک بەرتیل ڕادەگرێت تاوەکو بەرپرسەکە بەتەواوی کارەکەی بۆ ڕێک دەخات ئینجا پارەکەی دەداتێ. بۆیە ڕەنگە کۆمپانیایەک گرێبەستێک بکات لە سەر هێنانی چیمەنتۆ بۆ ئاژانسێکی شۆستە و شەقام دروست کردن بەڵام جارێ بەرتیل نادات تاوەکو پارە لە دەسەڵاتی گشتی وەرنەگرێت. زۆجار، ئەم جۆرە ڕێکەوتنانە فۆرمێک تەنها بەناو وەردەگرن بۆ ڕاوێژکاری گرێبەست لەگەڵ ئەو پارەیەی کە پەیوەستە بەفەندەکە لە ژێر گرێبەستەکەدا.

## تایبەتمەندێتی (بەتایبەت کردنی موڵکی حکومەت)

تایبەتمەندێتی دەتوانێت گەندەڵی کەم کاتەوە لە ڕێگەی دوورخستنەوەی هەندێ موڵکی دیاریکراو لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە و گۆڕینی کارە زۆر و فەرمییەکان بۆ کاری تایبەتی و ئیختیارەکانی کە لە بازاڕەوە سەرهەڵدەدەن. بەڵام، پرۆسەی گواستنەوەی موڵک بۆ خاوەنێتی تایبەت پڕبووە لە دەرفەتی گەندەڵی و چاوچنۆکی. گەلێ لە پاڵنەرەکانی گەندەڵی بەراورد دەکرێن لەگەڵ ئەوانەی کە سەر هەڵدەدەن لە بەخشینی گرێبەستەکان و داشکانەکان. لە بری ئەوەی کۆمپانیای دەوڵەتێک گرێبەستەکان بەدەست بێنێت و مامەڵەی باش بکات، ئەوا مەزاتکەرەکانی

کۆمپانیایەکی گشتی دەتوانێت بەرتیل بداتە بەرپرسان لە دەسەڵاتی تایبەتمەندێتیدا یان بەرپرسە گەورەکانی حکومەت. بەرتیل دان وا لە مەزاتکاران دەکات کە لە پێش هەموو کەسێکەوە بن و کۆمپانیا دەتوانێت پارە بدات مەزات کارانی تری کۆمپانیاکان دوور بخاتەوە لە پێش برکێ. بەڵام، پاڵنەرە گەندەڵیەکانی تر زۆر پەیوەستن بەپرۆسەی تایبەتمەندێتییەوە. سێ هۆکار هەیە لەم بارەیەوە زۆر گرینگن.

یەکەم، کاتێ پرۆژەی گەورەی دەوڵەت تایبەت دەکرێت، ڕەنگە هیچ ڕێگەیەکی باوەڕپێکراو نەبێت بۆ بەهای موڵکەکانیان، هەروەها باج و ئەو ڕژێمە نیزامیەی کە سەرکەوتوو دەبێت لە پۆستی ڕابردوو ڕەنگە بەخراپی دەستنیشان بکرێت. گومانەکانی پرۆسەکە دەرفەت دروست دەکات بۆ گەندەڵ کردنی ناوەوە لە ڕێگەی دانی زانیاری کە لە گشتیدا نەبێت، زانیاری پێشتر بدەیت بۆ ئەوەی بەرتیل وەرگریت، یان مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ کۆمپانیا گەندەڵەکان بکەیت لە کاتی پرۆسەی مەزاتدا. تەنانەت پرۆسەی بەموڵک کردنیش دەکرێ گەندەڵی تیا بکرێت لە ڕێگەی ئەوانەی ناوەوە یان لە ڕێگەی خاوەن موڵکەکانی دەرەوە کە پەیوەندی بەهێزیان هەیە لەگەڵ فرە نەتەوەکان کە نیازی مەزاتیان هەیە لە سەر موڵک. لەو پەڕی حالەتەکاندا هیچ موڵکێک وەرناگیرێت و هیچ کاری مەزاتیش ناکرێت. کۆمپانیاکە پرۆژەکەی پێ بەخشراوە لە لایەن ئەوانەی کە باشترین پەیوەندی سیاسیان هەیە. فرۆشتنی بەکۆمەڵ، لە نرخێکی ناجێگیردا، هەندێ جار دراوەتە کڕیاری بەهێز، وەک سەرکردەی حیزبێکی سیاسی و ئەوانەشی کە ئەزموونی بازرگانی و ئیش و کاریان نییە.

لە بەڕازیل، کاتێ ڕوون بۆوە کە هاوپەیمانێکی سەرۆک" فێرناندۆ کۆلەر دی مێلۆ" لە سەر خەت بوو بۆ وەرگرتنی کۆمپانیایەکی تایبەت، ئەوانی تر داواکانیان کێشایەوە. کۆلەر، نیازی بەکارهێنانی چاکسازی بازاڕ بوو بۆ دروستکردنی ئیمپڕاتۆرێکی دارایی تایبەت بەخۆی. لە یۆنان، کۆمپانیایەکی ئیتاڵی تاوانبار کرا بەبەرتیلدان بەسەرۆک وەزیران بۆ ئەوەی مامەڵەیان لەگەڵ بکات و لەگەڵیان ڕێک بکەوێت لە سەر بەتایبەتی کردنی کۆمپانیایەکی یۆنانی بۆ چیمەنتۆ. هەمان نموونە هەن لە وڵاتانی ئەرژەنتین و پیرۆ و زایر و ساحل حاج و تایلاند و سلۆڤاکیا ئەمانە چەند نموونەیەکی کەم بوون ناومان هێنان.



یاسا بێ هێزەکان ململانێی بەرژەوەندی ڕێکەوتن لە ناوەوە ئاسان دەکات. لە ئەرژەنتین، چەندین بەرپرس پرۆژەی هێڵی خێرایان لە مەزاتدا بەخشی بەیەکێک کە دواتر کۆمپانیاکەیان کردە کۆمپانیایەکی تایبەتی خۆیان. لە فەنزوێلا، کۆمپانیایەکی ڕاوێژکاری ئەمریکی تایبەتمەندێتی هێڵی ئاسمانی دەوڵەتی ڕێک خست سەرەڕای پەیوەندی نزیکی بەهێڵی ئاسمانی ئیسپانی ئیبێریا. پاشان، ئیبێریا چووە نێو بەخشینی بەهای هێڵە ئاسمانییەکە سەرەڕای ئەو واقیعەی کە پلانی دانا بوو لەسەر کۆمپانیاکە زیاد بکات و لە ئەنجامدا کۆتایی بەمامەڵەکە هێنا بەکڕینی هێڵە ئاسمانییەکە. بەگوێرەی پارێزەرێکی گەورەی ڕووسیا، پرۆسەی تایبەتمەندێتی لەو وڵاتەدا کۆنترۆڵ کراوە لە لایەن بانقەکانەوە کە لە نێوە خۆیان ڕێک دەکەون و مەزاتی تایبەتمەندێتی دەبەنەوە.

دووەم، بەرپرسی گەندەڵ ڕەنگە زانیاری بدات بەدەستەوە بۆ کەسانی تر کە وا نیشان دەدات کۆمپانیاکە بێ هێزە کاتی ئاشکرا کردنی بۆ ئەوانەی ناوەوە کە بەڕاستی وا نییە و کۆمپانیاکە کاری خۆی بەباشی جێ بەجێ دەکات. بۆیە ئەوانەی ناوەوە پارەدەری ئاست بەرزن، لەوەوە بەدیار دەکەوێت کە پرۆسەیەکی کراوە و ئاشکرا لە نێوە خۆیاندا هەیە و لەوانی تری دەشارنەوە. بەهەمان شێوە، مەزات کارانی گەندەڵ ڕەنگە دڵنیا بن لە چاودێریەکی نیزامی تۆکمە، هەندێ شت کە یەکێکی دەرەوە ناتوانێت پشتی پێ ببەستێت. هەڵسەنگاندنەکانی ڕابردوو ئەوە ئاشکرا دەکەن کە تایبەتمەندێتی پرۆسەیەکی زەبەلاحە لەگەڵ کۆمپانیا تایبەتیە نوێیەکان کە سەرمایەی زۆر بەدەست دێنن. چاودێران لە هەردوو وڵاتی چین و ئیکوادۆر سەرنجی ئەم جۆرە حالەتانەیان داوە. لە فەنزوێلا، بانقێکی سەرەکی بەکارهێنرا بوو بۆ بەرژەوەندی وەزیری وەگەڕخستنی نەتەوەیی کە گوایە لە ڕێگەی بەرتیلەوە چەند کارێکیان ئەنجام داوە.

سێیەم، کۆمپانیای تایبەت سوودمەنتر دەبێت گەر هەرچی کارێکی کۆمپانیا گشتییەکان هەیە بخاتە ژێر دەسەڵاتی قۆرخکردنی خۆیەوە. بەپێی ئابووریناسێک، دەسکەوتی قۆرخکردن گوێ نادات بەپاساوەکانی تایبەتمەندێتی. لە دەوڵەتێکی کەم دەرامەتدا و بەلای مەزات دەرەکانی ئەم دەوڵەتە، دەسەڵاتی قۆرخکردن لە بەرژەوەندی هەردوو لادایە. بۆیە ململانێی نێوان ئەوپەڕی دەرامەت و پێشبڕکێی

بازاڕ سەرهەڵدەدات لە گرێبەست و ڕێکەوتنە تایبەتییەکان. گەر دەوڵەتێک کەمێک ڕێگا خۆش بکات بۆ بنەما پێشبڕکێ کاریەکان، ئەوا ئەستەمە بتوانێت هاوکاری و پشتگیری قورخ کردن بکات بەکراوەیی. مامەڵەکانی کەناڵی دواوەی گەندەڵی دەتوانێت ئەو ئامانجە بەدەست بێنێت، بەڵام هەندێ لە سوودەکانی دەگوازرێتەوە بۆ تاک نەک بۆ حکومەت. لوگی مانزێتی باسی ئەوە دەکات کە تایبەتمەندێتی لە ئەمریکای لاتین لە بری کەم بوونەوە ڕوو لە زیادبوونە لە ڕووی تەرکیز کردنە سەر بازاڕاوە. ئەو پێی وایە کە تایبەتمەندێتی کۆمپانیایەکی تەلەفۆن لە ئەرژەنتین و سوودی وێستگەی کارەبایی لە چیلی بەشێوەیەک کەوتنە سەر کار کە براوەکان هەموو سوودێکیان بۆ خۆیان قۆرخ کرد. چاودێری ڕاستەوخۆی لایەنی بەرپرس زۆر بێ هێز بوو. ئەم جۆرە مامەڵانە ماقوڵ نین و لە شوێنی خۆیان نین. ئاشکرایە، تایبەتمەندێتی گواستنەوە و گەیاندن لە چیلی هەروەها وزەی کارەبا لە ئەرژەنتین هانی پێشبڕکێیان دا و دەسەڵاتی قۆرخ کردنیان سنووردار کرد.

هەرچەندە، لایەنی بەرپرس بەڵگەی ڕاستەوخۆ نادەنە بەردەست لە سەر گەندەڵی، جۆن نێلیس و سۆنیتا کیکێری چەند نموونەیەک لیست دەکەن لە سەر ئەو کۆمپانیانەی کە سوودی تایبەتی وەردەگرن:

لە یەکێک لە وڵاتانی ئەفریقیا... کارگەیەکی تایبەتی جگەرەی نوێ بەتووندی پارێزرا، لەگەڵ دەست بەسەرا گرتنی باج و بەرهەمی پێشبڕکێ کاران و قۆرخکردنی هاوردە. ١١ ساڵ قۆرخ کردنی بەرهەم هێنانی کۆکە کۆلا تەنیا لە لایەن یەک کۆمپانیای تایبەتیەوە ئەنجام درا، لە هەمان کاتدا سنووری بەرهەمە ساردەمەنییەکانی تر دەسەپێنرا لە لایەن کۆمپانیاکانی ترەوە. ڕێژەی بەرزی پاراستن بەخشرا بەکارگەیەکی پۆڵا لە وڵاتێکی دیکەی ئەفریقیا.

هەرچەندە گەندەڵی لە کاتی پرۆسەی تایبەتمەندێتی دا ڕوودەدات، ئەنجامی کۆتایی هێشتا دەکرێ پێشبڕکێیەکی تایبەتی بێت لە نێو بازاڕدا. بەڵام چوونی کۆمپانیایەک بۆ نێو کەرتێکی تایبەتی ئەم ئەنجامە دووپات ناکاتەوە. یەکەم، کۆمپانیاکە بەتایبەتی گەر هەندێ دەسەڵاتی قۆرخکردنی هەبێت، ئەوا ئاشکرایە پەیوەندیەکی نزیکی دەبێت لەگەڵ دەوڵەت. پاش هەموو شتێک، لە دەرەوەی وڵاتە سۆشیالیستەکانی پێشوودا، زۆربەی پرۆژە گشتییەکان لە نێو پیشەسازیەکاندایە



لەگەڵ ئابووریەکی بەرچاوی لەو ناوچانەی کە لە نزیکەوە پەیوەستن بەبەرژەوەندی نەتەوەییەوە، وەک سوودی گشتی یان گواستنەوە. بەرتیلدان ڕەنگە بەئاسانی ببێتە بەدیلێک بۆ مامەڵەی بەتەنیا کە لە ژێر خاوەنێتی دەوڵەتدا سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

دووەم، زۆرجار دەوڵەت تەنها بەشی کۆمپانیاکە دەفرۆشێت، بەلایەنی کەم لە ساڵانی پێشوودا،

زۆرجار کۆنترۆڵی دەگرتە دەست. ئەم جۆرە حاڵەتانە ڕەنگە ببنە هۆی گەندەڵی لە نێو کاروباری حکومەتدا. شەریکە تایبەتییەکان لە کۆمپانیایەک کە بەشێکی هی دەوڵەتە زەرەر لە حکومەت دەدەن تەنیا بۆ بەرژەوەندی خۆیان و چەند بەرپرسێک. ئەمەش لە سەر حیسابی بەرژەوەندی هاوڵاتی دەوەستێت. بۆ نموونە، لە ئیتاڵیا، کۆمپانیایەکی گشتی هاوبەش لە پیشەسازی کیمیاییدا پێدەچێت دووچاری گەندەڵی بووبێت تەنیا لە ڕێگەی گواستنەوەدا. بەرتیل دان و وەرگرتن لە هەردوو حاڵەتدا ڕوودەدات واتە بۆ سوودی کۆمپانیا هاوبەشەکە کاتێ کە دادەمەزرێت و دواجاریش بۆ بەدەست هێنانی نرخی بەرز بۆ هەمان موڵک کاتێ کۆمپانیا هاوبەشەکە بێ پارە دەبێت و دووبارە بەسەر بەرنامەکانیدا دەچێتەوە،

پاڵنەرە گەندەڵەکان ڕەنگە مانای ئەوە بێت کە شیاوترین مەزات کار زەرەر دەکات لە بەر گەندەڵێکی ناوەوە. هەتا گەر شیاوترین کۆمپانیا بباتەوە، گەندەڵی لە پرۆسەی تێندەر بەخشین ئەوە دووپات دەکاتەوە کە حکومەت زۆر کەم وەردەگرێت لە فرۆشتنەکە. ئەمەش دەبێتە هۆی باجی بەرزتر یانیش تێچووی گشتی کەمتر دەبێت.

## ئەنجامەکان

ئەو گەندەڵییەی کە بەرپرسە پلە بەرزەکان دەیکەن دەتوانێت ببێتە هۆی چەواشەکاری جدی لەو ڕێگا و مامەڵەیەی کە حکومەت و کۆمەڵگا دەیکات. دەوڵەت زۆر پارە دەدات بۆ بواری فراوانی خاوەنێتی و زۆر کەم وەردەگرێت لە تایبەتمەندێتی و بەخشیشی داشکاندندا. واتە سەرمایەی دەوڵەت سەری دەست مایەکەی دەخوات. بەرپرسی گەندەڵ ئیختیاری کەرتی حکومی چەواشە دەکات بۆ ئەوەی سوودێکی زۆر بۆخۆیان گل دەنەوە و سیاسەتی نەشیاو و نەزۆک بۆ ئەوانی تر بەجێ بێڵن. حکومەت ئێجگار زۆر پرۆژەی هەڵە بەرهەم دێنێت و زۆریش سەرف دەکات لە سەر ئەو پرۆژانەی کە لە ژێر جێبەجێ کردندان. گەندەڵی قازانجەکانی دەرامەتی تایبەتمەندێتی و بەخشیشی داشکاندن کەم دەکاتەوە. ئەو کۆمپانیانەی کە دەسەڵاتی قۆرخ کردن بەدەست دێن لە ڕێگەی بەرتیل دان و واستە و خزمایەتی سوود و قازانجەکانی حکومەت نەزۆک دەکەن و ژێرخانی حکومەت بۆ پرۆژەی گشتی وێران و خاپوور دەکات.



## کەمکردنەوەی پاڵنەرەکان و زیادکردنی خەرجیەکان

پاڵنەرە گەندەڵییەکان وجودی هەیە چونکە بەرپرس و فەرمانبەرانی دەوڵەت دەسەڵاتیان هەیە لە کەمکردنەوەی سوود و قازانج و سەپاندنی خەرجییەکی زۆر و زەوەند. لە بەرئەوەی کەموکوڕی دەکەوێتە نێو جەرگەی مامەڵە گەندەڵییەکان، بۆیە ئەوەی لە ناوەوە لە لایەن ئابووری ناسانەوە هەیە یارمەتی ئەوە دەدات کە کۆشش بخەینە گەڕ بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی. ئەم بەشە و بەشی دواتریش جەخت دەکەنەوە سەر چاکسازییەکانی پەیوەست بەپاڵنەرەکان کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی سوودەکان یانیش زیادکردنی خەرجییەکان. ئەم بەشە، باسی ئەم چاکسازییانەی خوارەوە دەکات:

* نەهێشتنی بەرنامە
* تایبەتمەندێتی
* چاکسازی بەرنامە گشتییەکان
* چاکسازی ئیداری
* کاریگەری نەهێشتنی یاساکانی دژە گەندەڵی
* سیستەمەکانی پاشەکەوت

## نەهێشتنی بەرنامە

دروستترین ڕێگا بۆ سنووردار کردنی گەندەڵی نەهێشتنی بەرنامە ئیفلیجەکانی گەندەڵییە. گەر دەوڵەت دەسەڵاتی نەبێت پێوەندێک دابنێت بۆ هاوردە و مۆڵەتی کار و بازرگانی، ئەوا ئەمە خۆی یەکێ لە سەرچاوەکانی بەرتیلدان و وەرگرتن ناهێڵێت. گەر بەرنامەی پاڵپشتی دارایی نەمێنێت، ئەو بەرتیلدانەی کە لەگەڵ ئەو پاڵپشتییەیە دەستبەجێ نامێنێت. گەر کۆنترۆڵەکانی نرخ بەرزکرایەوە، ئەوا نرخەکانی بازاڕ خۆیان بەهای کەم دەردەبڕن. بەگشتی، ئەو چاکسازییانەی کە پێشبڕکێ و ململانێی ئابووری زۆر دەکات یارمەتی کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵییەکان دەدات.

هەندێ لە بەرنامە گشتییەکان زۆر بەخراپی کار دەکەن کە هەر خۆیان وەک ئامێرێکی بەرهەمهێنانی بەرتیلدان و وەرگرتن کار دەکەن بۆ بەرپرسان. ئەو پێکهاتانەی کە ڕێگە بەبەرپرسان دەدات و دەسەڵاتیان لە بەردەم والاّ دەکات هەر ئەمانە سەرچاوەی دروستبوونی بەرتیلدان و وەرگرتنن، بەتایبەتی گەر هاولاّتیان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان هیچ سەرچاوەیەکیان نەبێت. لەم جۆرە حاڵەتانەدا نەهێشتنی بەرنامە هەندێ جار باشترە لە ستراتیژییەکانی چاکسازییەکی هێواش. بۆ نموونە، مۆڵەت و ڕێگە پێدان پێویستن بۆ دروستکردنی کار و بەردەوامییان پێ ببەخشێت لە کارکردندا، ڕەنگە ئەمە هیچ سیاسەتێکی نەبێت بۆ ئاشکرا بوون و پاساو هێنانەوە، توێژینەوەکانی ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین و ئەوروپای ڕۆژهەلاّت ئەوە دەخەنە ڕوو کە هەمان ئەم حاڵەتە لە گەلێ ولاّتی تردا دووبارە دەبێتەوە و وجوودی هەیە، هەروەها زۆربەی ئەو بەرنامانە گەندەڵن. نەهێشتنی هەندێ یاسا و ڕوونکردنەوە و هەموار کردنی هەندێکی دیکە وەک وەلاّمێک و سیاسەتێکی باش دێتە بەرچاو.

بەرنامەکانی پاڵپشتی دارایی شان بەشانی گەندەڵی بلاّو دەبێتەوە و کاریگەری خراپی لە سەر هەموو شێوەکانی گەندەڵی هەیە. گەر بەرتیلدەر و وەرگر هەردووکیان چاوپۆشی لە سیستەمی ناڕاستگۆیی بکەن، ئەوا لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە کارێکی ئەستەم دەبێت، لەو کاتەشدا نەهێشتنی بەرنامە تاکە ئیختیاری بەردەست و بێ هێز دەبێت. بۆ نموونە، بەرنامەیەکی ئەرژەنتینی بۆ هاندانی گەشە و پێشکەوتنی هەرێمە دواکەوتووەکان لە ڕێگای هاوردە و پاڵپشتی دارایی، بەرنامەیەکی زۆر لاواز و بێ کەڵک بوو لە بەر ساختە و گەندەڵی. بەرهەمێکی بەخشراو دەکرێت چەندین جار هەنارده بکرێت لە ڕێگەی بەندەرەکانی باشوورەوە. هەروەها ئەو کارگانەی کە نزیکن لە ساختە و فرۆفێڵەوە لەو ناوچانە دامەزراون کە کارێکی کەم یان هەر هیچ بەرهەمێکیان نەبووە لە هیچ شوێنێکی دیکە. توێژینەوەیەکی چاودێری بانقی جیهانی گەیشتە ئەو ئەنجامی کە بەرنامەکە بەرنامەیەکی نەشیاو بوو لەگەڵ خەملاّندنی لە سەدا ٢٥ ی پاڵپشتی دارایی کە لە ڕێگەی ساختەوە بەزەرەر چوو. ئەمە نموونەیەکی بەرنامەیەکە کە حکومەت دەبوایە زۆر بەئاسانی قەدەغەی کردبا.

ڕێگایەکی تر بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی بەیاسایی کردنی ئەو چالاکیانەیە کە



پێشتر بەنایاساییی ئەنجام دراون. زۆرجار، کاتێ بەرهەمێک نایاساییە، بەرهەمهێنان بەردەوام دەبێت بەلاّم لەگەڵ کاری نایاسایی و پارە دان بەپۆلیس تاوەکو چاوپۆشی لەم کارە گەندەڵ و نایاساییە بکات. پاشان بەرپرسان پێویستە پرسیار بکەن گەر سوودەکانی کاری نایاسایی خەرجییەکان کەم بکەنەوە. بۆ نموونە، پاش کەمێک ئەزموون لە قەدەغەکردن، ویلایەتە یەککگرتووەکان بۆ هەژدەهەمین جار دەستووری هەموار کردەوە و دروستکردن و فرۆشتنی ماددەی شلەی ژەهراوی قەدەغە کردو لە دەرەوەی یاسای دانا. کاتەکەی لە نێوان ١٩١٩ و ١٩٣٣ دا ماوەی بلاّوبوونەوەی بەرهەمی نایاسایی بوو و ماوەی فرۆشتنی عارەق و جۆرە گەندەڵییەک بوو کە سەراپای هێزەکانی سەپاندنی یاسای داپۆشیبوو.. مشتومڕی بەرفراوانی جیهانی لە سەر بەیاسایی کردنی ماددە بێ هۆش کەرەکان دەوەستێتە سەر بێ هێزی کۆنترۆڵکردنی دروستکردنی لە ڕێگای یاسای تاوان کاتێ دەسەلاّتەکانی سەپاندنی یاسا زۆر موعەرەزن بۆ گەندەڵی. قومار کردن پێشتر خرابووە دەرەوەی یاسا و بەکارێکی نایاسایی دادەنرا لە زۆربەی دەسەلاّتەکانی ئەمریکیدا، هەروەها لە هەمان کاتدا قومار کردن سەرچاوەیەکی گرینگی گەندەڵی بوو بۆ پۆلیس. وەلاّمی گەلێ لەو دەسەلاّتانە ئەوەبوو کە قومار کردن بکەن بەکارێکی یاسایی، ئەنجام بدرێت بەئاشکرا بەلاّم لە ژێر چاودێرییەکی توندی دەوڵەت و تەنانەت لە هەندێ جاریشدا لە ژێر خاوەنێتی دەوڵەتدا ئەنجام بدرێت.

هەندێ جار، لابردنی کۆمەڵێک پاڵنەری گەندەڵی ڕەنگە دەرفەتی نوێ لە شوێنی تر بڕەخسێنێت. نەهێشتنی نۆ لە دەی مۆڵەتەکان پێویستی بەوە دەکرد کارێک بکرێتەوە کە ڕەنگە ئاسانکاری زیاتر بەبەرپرسان بکات بەرەو ئاستی گەندەڵی بەرزتر. لابردنی بەربەستەکان بۆ کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان ڕەنگە وا لە بەڕێوەبەر بکات بەرتیل بدات بەپۆلیس بۆ بێزار کردن و ناچار کردنی پێشبڕکێ کارانی ئەو کۆمپانیایە. هەڵوەشاندنەوەی یاسایەک لە ناوچەیەکدا ڕەنگە گەندەڵی لە شوێنی تردا زۆر بکات. ئەمە ڕاست دەبێت گەر چالاکییەکی بەقازانج پێویست بکات بەنێو چەندین بازگەی یەک بەدوای یەکدا بڕوات. بۆ نموونە، هەوڵێکی سەرکەوتوو درا لە لایەن ئاژانسی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە پێناو گەشەپێدانی نێودەوڵەتی بۆ

کەمکردنەوەی گەندەڵی لە گواستنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە وڵاتێکی ئەفریقی بووە هۆی زیادبوونی گەندەڵی لە وڵاتە دراوسێکان لە سەر هەمان شت کە گواستنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانە. پرۆژەکە ژمارەی ئەو بازگانەی کەم کردەوە کە لە لایەن بەرپرسانی پۆلیس و گومرگەوە دانرا بوو بۆ وەرگرتنی بەرتیل لە گواستنەوەی پیاز لە Niger . بەداخەوە، ئەمە لە بری کەمکردنەوەی بووە هۆی زۆربوونی گەندەڵی و ئاستەکانی باج لە کۆتدیڤوار چونکە پیاز نزیک بوو لە شوێنی ئەوان، واتە نزیک بوو لە بازاڕی خواردنی ئەبیدجان. ئەم جۆرە نموونانە، گرینگی گرتنە بەری هەوڵێکی سیستەماتیکی دووپات دەکەنەوە، کە ڕەنگە ماناکەی جێهێشتنی کاریگەری لە نێو سنووورە نەتەوەییەکاندا بێت.

هەرچەندە نەهێشتنی بەرنامە چروپڕەکانی گەندەڵی دەتوانێت پاڵنەرەکان بۆ پارەدان وەک بەرتیل سنووردار بکات، بەڵام بەرنامەیەک بۆ بچووک کردنەوەی قەبارەی حکومەت مانای ئەوە نییە گەندەڵی کەم بکاتەوە. با ڕەچاوی پاڵنەرە گەندەڵەکان و کەمی بەرهەم بکەین، هەروەها سەرنجی ئەوە بدەین کە فرۆشتن بەنرخێکی هەرزان و داشکاندن لە نرخەکان لە لایەن حکومەتەوە دەبێتە هۆی کەمی بەرهەم کاتێ بەرنامەکانی سەرفکردن دەوەستێت یان کاتێ بودجە نیزامیەکان کەم دەکرێنەوە بەبێ گۆڕان بەپێی یاسای دیاریکراو. تەنانەت خراپتریش لەمە ئەوەیە گەر حکومەت لە ژێر فشارێکی ئابووری دابێت هەموو خەرجیەکان دەبڕێت، لەو کاتەدا حکومەت ڕەنگە بیر لە درێژەپێدانی کاریگەری خۆی بکاتەوە بەهۆی زۆرکردنی ڕێسا و یاسای قورستر. لە ئەنجامی ئەوەشدا گەندەڵی زۆرتر دەبێت.

نەهێشتنی بەرنامە پاڵنەری گەندەڵی دەسڕێتەوە کە هەمیشە لە نێو خودی بەرنامەکە دایە، بەڵام بڕینی بودجە ڕەنگە پاڵنەری گەندەڵی نەسڕێتەوەو بەرنامەکەش هەر وەک خۆی و بەهێزتریش دەمێنێتەوە. بۆ نموونە، گریمان پاڵپشتە داراییەکان بۆ خوێندنی باڵا پێشتر واڵا بووە بۆ هەموو ئەو قوتابیانەی کە لە تاقی کردنەوەی وەرگیران دەرچوون، بەڵام ئەو پاڵپشتە داراییە ئێستا تەنها دراوەتە لە سەدا ٥٠ ی دەرچووەکان. کەمبوونەوە و کەموکوڕی بەهۆی بڕینی پارەوە پاڵنەری گەندەڵ دروست دەکات کە پێشتر هیچ پاڵنەرێک وجوودی نەبووە. کەواتە تا تاقیکردنەوەکە بەدەر بێت لە کاریگەری خراپ، ئەوا ڕێگەچارەی کەمکردنەوەی گەندەڵی لە دەرچوونی



تاقیکردنەوەدا سەرهەڵدەدات تاوەکو بەرنامە بچووک کراوەکە بودجەی خۆی وەردەگرێت لە لایەن حکومەتەوە. ڕێگاکانی تری کەمکردنەوەی داوا، وەک داواکارییە ئاڵۆزەکان، سڕەیەکی درێژ، بڕینی پارە لە سەر بنچینەی پێداویستییەکان، هەموو ئەمانە دەبنە هۆی پەیدابوونی پاڵنەرە گەندەڵییەکان.

کاتێ خەرجییەکانی حکومەت دێتە خوارەوە، ئەو بەڵێندەرانەی کە لە ڕابردوو قازانجیان کردووە لە گرێبەستە گشتییەکان دەناڵێنن، بەتایبەتی ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانەی کە ناتوانن وەها بەئاسانی ئاڕاستەی خۆیان بگۆڕن. بەڵێندەرە سەربازییەکانی ناوخۆ هەمیشە لەم جۆرەن. کۆمپانیا فرە نەتەوەکان کەمتر کاریگەرییان لێ دەکات ئەمەش لە بەر هەمەجۆری و تێکەڵی بەرهەمەکانیان و هەروەها دەشتوانن لەوڵاتانی تردا بیفرۆشن. ئەو کۆمپانیایانەی کە کێشەیان هەیە لە گۆڕینی ئاڕاستەکانیان ڕەنگە بەرتیل بدەن تاوەکو بەشێک لە قازانجی کارەکانی حکومەت وەرگرن. کۆی گشتی بەرتیل ڕەنگە بێتە خوارەوە، بەڵام بەرتیل بۆ هەر پرۆژەیەک بەرزتر دەبێتەوە. هەرکاتێک حکومەت دەرگای داخست لە سەر بەڵێندەرێک لە مامەڵە کردن، بەرتیل هێشتا دەکرێت بەکار بهێنرێت بۆ وەرگرتنی نرخی داشکاو، بۆ چاوپۆشین لە کەرەستەکان یان بۆ بازدان و چاوپۆشین لە سەر جۆری کەرەستەکان.

بە هەمان شێوە، گریمان نیوەی بودجەی ئاژانسێکی نیزامی ببڕدرێت بەبێ گۆڕان کە ئەمەش بەپێی یاسا ڕێک دەخرێت. یەکەم، گریمان یاسایەک ڕێگە بەکۆمپانیا زەبەلاحەکان دەدات کار بکەن تاوەکو دەوڵەت سەرپێچییەکیان لێ بەدی دەکات و دەیانوەستێنێت. لەم حاڵەتەدا بازرگانێکی کەم نارەزایی دەردەبڕن لە سەر بڕینی بودجە. پشکنین و چاودێریەکانی تر کەم دەبێتەوە، کە ئەمەش سوودێکە بۆ کۆمپانیاکان. بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک پاڵنەرێکی هەر هەیە بۆ بەرتیلدان بەپشکنەرێک بەڵام زۆر کەمتر دەیکات چونکە پشکنەران کەمتر دێنە سەر کارەکان.

دووەم، گریمان یەکێک لە یاساکان داوا لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەکات مۆڵەت دەربکەن. پاشان بڕینی بودجە بەبێ گۆڕان بەپێی یاسا پاڵنەرە گەندەڵییەکان زۆرتر دەکات. کۆمپانیا زەبەلاحەکان و هاوڵاتی ناچار و هان دەدرێن بۆ ئەوەی بەرتیل بدەن تاوەکو کەمترین سەرنجی دەسەلات بۆ ئەوان هەبێت یاخود بچنە پێشی پێشەوەی

ڕیزەکە. ئەو بەرتیلەی کە دەدرێت لە لایەن هەندێکەوە کاری ئەوانی تر زیاتر دوا دەخات، ئەمەش ئەنجامێکە کە ڕەنگە ئەوانی تریش پاڵ پێوە بنێت بۆ گەندەڵی و پەنا بەرنە بەر بەرتیل، ئیتر بەم شێوەیە سوڕێکی زیان بەخش دروست دەبێت. هەر لە حالەتی برینی پاڵپشتی دارایی بەرنامەکان، چالاکیە بچووک کراوەکانی حکومەت ڕەنگە ببێتە هۆی زۆربوونی ، نەک کەم بوونی گەندەڵی تاوەکو یاساکان نەگۆڕێن بەشێوەیەک کە بگونجێت لەگەڵ کۆی گشتی بودجەی کەمتر.

بە کورتی، نەهێشتنی بەرنامە نیزامییەکان و سەرفکردن یەکێک لە ستراتیژییە هەرە گرینگەکانی کەمکردنەوەی گەندەڵییە. بەڵام، بەرپرس و حاکمان دەبێ ئەوە تاکید بکەن کە بەرتیل لە هیچ شوێنێکی تر دووبارە نابێتەوە. وێڕای ئەمەش، کەمکردنەوەی تەواوی قەبارەی بودجەی حکومەت زۆر بەئاسانی سوود و قازانجی حکومەت کەم دەکاتەوە. دواجار ڕەنگە گەندەڵی وەک پێشبڕکێیەکی سوود وەرگرتن زۆر بکات بۆ سوودە زۆر و زەوەندەکانی ناوەوەی گەندەڵی. برینی خەرجییەکان بەهۆی زۆربوونی نیزامەکان زۆر بەئاسانی سەنتەری گەندەڵی دەگۆڕێت. بۆ وڵاتێک تەنیا وەرگرتن کۆی گشتی دەرامەتی ئابووریەکەی بەس نییە شان بەشانی ڕێبەرەکانی وەگەڕخستنی ڕاستەوخۆ لە دەرەوە، نەتەوەکان دەبێ خەمێک لە پێکهاتەی گرینگی بەرنامە گشتییەکان بخۆن، نەک هەر تەنیا خەم لە قەبارەی حکومەت بخۆن.

## دامەزراندنی پرۆسەیەکی باوەڕپێکراوی تایبەتمەندێتی

هەروەک لە بەشەکانی پێشتر ڕوون کراوەتەوە، تایبەتمەندێتی چاکسازییەکی دژی گەندەڵییە و سەرچاوەیەکی بەهێز و نوێی دەسکەوتە گەندەڵییەکانە! هەرچەندە تایبەتمەندێتی لە ئاقاری بەرفراوانی حاڵەتەکاندا شتێکی ویستراو بووە، بەڵام چاکسازەکان دەبێ نەخشە بۆ پرۆسەیەک بکێشن بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرەکانی گەڕان بەدوای پارە کۆکردنەوە لە ڕێگەی گەندەڵییەوە. پرۆسەکەش دەبێ فراوانترین ئاستی بەشدارکردن دڵنیا بکاتەوە نەوەک تەنیا کۆمەڵە کۆمپانیایەک یان بازرگانێک کە پەیوەندیەکی بەهێزیان لەگەڵ نوخبەیەکی ناوخۆ هەیە و هەروەها پرۆسەکە دەبێ



ئاشکرا و شەفافیەتی تیا بێت و بەباشی و ڕوونی بڵاو بکرێتەوە، بەتایبەتی لە ڕووی هەڵسەنگاندنی حاڵەت و کەرەستەکان. کاتێ ڕێکەوتنێکی ناوەوە بەدیار دەکەوێت، تایبەتمەندێتی شتێکی بەسوود نابێت چونکە چاودێریکردنی کۆمپانیایەکی گشتی ئاسانترە لەوەی کۆمپانیایەکی تایبەت. بەڵام، هەندێ جار تەنانەت گواستنەوەیەک بۆ ناوەوە ڕەنگە بازاڕی خۆی هەبێت گەر خاوەنە نوێیەکە لە لایەن یەکێک لە فشارە سیاسییەکان قەڵغانی بۆ دروست کرابێت و بپارێزرێت بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری گرینگ وەربدات.

گەر کۆمپانیای زەبەلاحی تایبەت دەسەڵاتی قۆرخکردن بگرێتە دەست، ئەوا پێویستە دام و دەزگای نیزامی نوێ پێک بهێنرێن کە خۆیان کاریگەرییان لە سەر دروست نەبێت. شتێکی گرینگە چێوەیەکی نیزامی پێک بهێنرێت بەرێگایەکی باوەڕپێکراو پێش ئەوەی تێندەر بەخشین دەست پێ بکات. ئابوورییە پێشکەوتوو ئینتیقالیەکان لەگەڵ سوودی نوێی تایبەتی دەبێ هەڵی سیاسی زۆر بەهێز پێک بهێنن لەگەڵ پرۆسەی کاری کراوەو ئاشکرا و پڕ لە شەفافیەت. ئەمە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی گومانی پەیوەست بەتێندەر بەخشین و ئەگەری بردنەوەی ئەو مەزاتکەرەی کە پرۆسەکە قۆرخ دەکات لە کاتێکدا دەزگای نیزامیشی بۆ دامەزراوە.

ڕێچکەی یاسایی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان نابێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بگوازرێتەوە بۆ ئەوانەی کە کەمتر توانای بیرۆکراتیان هەیە و مەترسی زیاتری گەندەڵی و گرتنیان هەیە لە ڕێگەی کومپانیایەکی نیزامییەوە. دەزگا نوێیەکان پێویستە دامەزرێت لە سەر بنچینەی ئەم جۆرە حاڵەتانە. دەسەڵات دەبێ سنووردار و کۆنترۆڵکراو بێت. ئاژانسە نیزامییە نوێیەکان پێویستییان بەرێبەری ڕوون و سادە و بەهێز هەیە.

دیراسەی حاڵەتەکانی گەیاندن و گواستنەوە لە شەش وڵاتی جیا جیادا، گرینگی و پێویستی کۆنترۆڵ لە سەر دەسەڵات و بارودۆخێکی جێگیر و یاسایی و دەزگای بەهێز باوەڕپێکراو دەخاتە ڕوو. نووسەرەکان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ مەرجێکی زۆر پێویستە بۆ نیزامێکی کاریگەری پیشەسازیە تایبەتییەکان. تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ هەبێت،

کاریگەری خۆی نابێت هەتا پرۆسەی سیاسی نەتوانێت کۆنترۆڵە یاساییەکان پێکەوە گرێ بدات. گەر هەر یەکێک لەو مەرجانە ون بوو، تایبەتمەندێتی ڕەنگە سوودێکی کەمی هەبێت بۆ هاوڵاتییان. تەنها کۆمپانیا زەبەلاحەکان ئەوانەی کە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە سەرکردە سیاسییەکانەوە هەیە بۆ گەندەڵی ئامادەن پارە زیاد بکەن کاتێ کۆمپانیا گشتییەکان دەچنە نێو مەزاتەوە. ئەنجامەکەش بەپارەیەکی کەم و مامەڵەیەکی نەگونجاویش لە داهاتوودا دێتە ئاراوە.

لە کۆتاییدا، گەر ئیلتیزاماتی باوەڕپێکراو شیاو بن، ئەوا هێز و سیفەتی بیرۆکراسی دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە وڵاتێک پێویستە یاسا و حوکمی نیزامی سادەی هەبێت. بۆ نموونە، جامایکا دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆی هەیە ڕێزیشی لێ دەگیرێت، بەڵام توانای بێ هێزی ئیداریەکەیەتی کە یاسا و حوکمە سادەکان بەڕێوە دەبات. هەندێ قۆرخکردنی دەسەڵات هەر دەمێنێت. بۆیە دەبێت بەرپرس بپارێزرێت و دووربخرێتەوە لە کاریگەری دەم شیرین کردن و پەیوەست بێت بەپرۆسەیەکی شەفاف و دوور بێت لە بەرژەوەندی و کاریگەری فشاری سیاسی. هەندێ پێشنیاری ئەوە دەکەن کە یەک ئاژانس دەبێ دەسەڵاتێکی یاسایی فراوانی پێ بسپێردرێت لە سەر کۆمەڵێک پیشەسازی تاوەکو چاودێری سەرچاوەکان و پسپۆریەتی کارەکە بکات و نەهێڵێت دەسەڵاتێکی سیاسی لابەلا دەستی بخاتە نێو کاروبارەکەوە. لە حکومەتێک لەگەڵ هەندێ پلەی بەرپرسیارێتی گشتییەوە، ئاژانسێکی فراوان سوود لە پرۆفایلێکی سیاسی بەرز وەردەگرێت تاوەکو قازانجەکانی بەهۆی دەستێوەردانێکی سیاسی نەگونجاو بەرزتر بێت. سیستەمی یاسایی دەکرێ ڕێک بخرێت بەشێوەیەک کە بتوانێت نرخی ئارەزوومەندانە بەسیستەمێکی نیزامی کاریگەر پێشکەش بەموشتەرییەکان بکات. بۆ نموونە، بەرپرسانی گواستنەوە و گەیاندن لە نیوزلەندا و شانشینی یەکگرتوو سیستەم دادەمەزرێنن بۆ دانەوەی باقی بەموشتەرییەکان گەر کۆمپانیاکان سەرکەوتوو نەبوون لە جێبەجێ کردنی مەرجەکان بەپێی یاسا. ئەم جۆرە لێپێچینەوانە لە سەر بیرۆکراسیەت زۆر گرینگن چونکە تەنانەت ئەرکی نیزامی سادەش کاریگەری گەندەڵی کاری لێ دەکات.

یەکڕیزی پرۆسەی تایبەتمەندێتی خۆی مەسەلەیەکی تایبەتیی و لە حاڵەتی



گواستنەوەدایە لە وڵاتان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت. لەو دەوڵەتانەدا، بەشی زۆری گەنجینەی نەتەوەیی تایبەت کراوە. بۆ سنووردار کردنی گەندەڵی لە هەردوو خاڵی فرۆشتن و حاڵەتی ئێستای نێو بازاڕدا بایەخی زیاتر دەبوایە بەهەند وەرگیرابوا بۆ هێنانە کایەی باروودۆخێکی شەفاف و باوەڕپێکراو لە ڕووی یاساوە. ئەمە لە زۆربەی وڵاتاندا ڕووندادات و ئەنجامی پێشبینی کراویشی لێ ناکەوێتەوە. هەرچەندە یەکێک لە دیراسەکان بەم دواییە تاوتوێی ئەوە دەکات کە تایبەتمەندێتی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بەهاوسەنگی سوودمەند بوونە، نووسەرەکان ئاماژە بەناشایستەیی و نەشیاوی جدی لە سیستەمەکەدا دەکەن. تاوتوێی ئەوە دەکەن کە کەفالەت کردن لە سەر بنچینەی تایبەتمەندێتی گەندەڵی دەشارێتەوە و دایدەپۆشێت و دەبێتە هۆی ئەوەی فەرمانبەری ئیدارە بەکەیفی خۆیان حوکم بکەن لە سەر فرۆشتن، چونکە دەسەڵاتی قۆرخکردنیان گرتۆتە دەست لە پەنای تایبەتمەندێتی و نەبوونی شەفافیەت. پێشکەش کردن و تێندەرە سەرەتاییە گشتییەکان و بازرگانی فرۆشتن ئیختیاری هەنووکەیین و کە هێواشی و پشت گوێ خستن لە کارەکانیان دژی شەفافیەت و ئیدارەیەکی سەربەخۆیە. ئەو وڵاتانەی لە نێو پرۆسەی فراوانی تایبەتمەندێتیدا پێویستە خێرایی کارکردن هاوسەنگ بکەن دژی بەهای درێژخایەنی یاسا ڕوون و بەجێکان و پرۆسەی بەهاداری گواستنەوە کە لە لایەن دانیشتوانەوە بەپرۆسەیەکی شەرعی سەیر دەکرێت.

## چاکسازی بەرنامە حکومییەکان

گەلێ لە بەرنامە نیزامی و خەرجییەکاندا پاساوی بەهێزیان هەیە و دەشبێت چاکسازییان تیادا بکرێت لە بری ئەوەی نەمێنن و بسڕێنەوە. گەندەڵی لە کۆکردنەوەی باجەکان ناکرێ بەهۆی سەرنەکەوتنی کۆکردنەوەی دەرامەت چارەسەر بکرێت، هەروەها بەرنامەکانی تر وەڵامن بۆ ژێرکەوتنی بازاڕ و داواکانی هاوڵاتیان بۆ کاڵای گشتی و دادوەری کۆمەڵایەتی. یەکێک لە چارەسەریەکان بۆ ڕوونکردنەوەی پێوستی یاساکان کەمکردنەوەی دەسەڵاتی قۆرخکردنی بەرپرسەکانە و دروستکردنی چاودێری ساناترە و کەمکردنەوەی کاری هەڕەمەکیە. دەکرێت یاسا و

حوکمەکان ڕوونتر بکرێنەوە لەگەڵ پاساوی گشتی و باوەڕپێکراو. لەوانەیە حکومەت نیازی باجی سادەو بێ دەسەڵاتی قۆرخکردن و خەرجی و سەپاندنی یاسا نیزامیەکان بێت.

## کۆکردنەوەی دەرامەت

چاکسازی باج گەلێ جار مانای سادە کردنەوەی باجەکانە و بەدەسەڵاتێکی یاسایی داوا بکرێت و کۆکرێتەوە لە سەر بنچینەی ئەوەی ئەو شاردنەوەو نەخەملاندنی ئەو باجانە کارێکی ئەستەمە. باجی کار و بازرگانی دەکرێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ جێگیر بکرێت لەو قازانجە ڕاستەقینەی کە کۆمپانیایەکی زەبەلاح دەستی دەکەوێت. کەمکردنەوەی نەدانی باج گەندەڵی بازرگانی پێوە دەکرێت دژی داشکانێکی یەکسان و شیاو. بۆ نموونە، مەکسیک کەمترین ئەڵتەرناتیڤی باجی لە سەر بەهای کاڵای کۆمپانیایەکی زەبەلاح کرد بە لە سەدا ٢, کۆمپانیایەک بەزرترین بەهای ئەم باجە دەدات و هەمیشە پێیەوە پابەندیش دەبێت. کار و بازرگانییە بچووکەکان باجێکی کەم لە بەرامبەر هەر فەرمانبەرێک دەدات، هەروەها کار و بازرگانییە مام ناوەندیەکان باجیان لێ وەردەگیرێت لە کاتی فرۆشتنی بەرهەمەکانیان یاخود کاتی جێ گۆڕینی فەرمانبەرانیان. هەموو ئەو چاکسازیانە دەرامەتی زیادە گڵ دەداتەوە لە ڕێگەی کەم کردنەوەی نەدانی باج و گەندەڵی. هەندێ لە کۆمپانیاکان نارەزایی دەردەبڕن لە بەرامبەر مامەڵەی نایەکسان لەگەڵیان، بەڵام بڕیاری باج لە دادگادا لە سەری ڕێکەوتوون و یەکلایی کراوەتەوە. بەڵام، ئەم جۆرە چاکسازییانە بەپێچەوانەوە دەبێت گەر کۆکەرەوەی باج پاڵنەرێکی ئەوتۆیان نەبێت بۆ ئەوەی کاری خۆیان بەباشی بکەن و هەروەها گەر کەمی دانی باج سزا نەدرێت. بۆ نموونە، سووک کردنی باج لە فلیپین بەئاشکرا سوودێکی زۆر کەمی گل دایەوە چونکە هیچ هەنگاوێک نەگیرایە بەر بۆ باشتر کردنی پاڵنەرەکانی باری کۆکەرەوەی باج و باجدەر.

لە پرۆسەی چاکسازی گومرگی مەکسیکدا، ژمارەی هەنگاوەکان لە پرۆسەی گومرگ کردندا لە فرۆکەخانەی شاری مەکسیک کەم کرایەوە لە ١٦ هەنگاو بۆ سێ



هەنگاو. سیستەمەکە باش بەڕێوەدەچوو بۆ کەمکردنەوەی دواخستنی کارەکان و هەروەها ستافی فەرمانبەرانیش تەواو کەم کرانەوە. ئەو فەرمانبەرانەشی کە مانەوە مووچەیەکی باشیان وەردەگرت، بۆیە زۆر بەمتمانە و بێ پێچ و پەنا و فرو فێڵ کاری خۆیان بەباشی دەکرد و کاریگەرییەکی باشیان لە چاودێریکردندا هەبوو. هەرچەندە ئەزموونی ڕابردووی مەکسیک ئەوە دەخاتە ڕوو کە بەدەستهێنانی دەسکەوت لە سەرەتادا زۆر ئەستەمە، بەڵام یەکێک لە فەرمانبەرانی حکومەت ڕایگەیاند کە لە ڕێگەی ئەو چاکسازییانەوە دەرامەتی گومرگ بەشێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە، هەروەها بازرگان و خاوەن کاریش وتیان کە چاوەڕێکردن و گەندەڵی و دواخستنی کار و دزی کردن نەماوە.

چاکسازی سەرکەوتوو لە سیستەمی کۆکردنەوەی دەرامەتی وڵاتێک دەبێ ڕێگە بۆ کەمکردنەوەی ڕیژەی ئەو باج و تاریفانە خۆش بکات کە تەنیا بەناو وجوودیان هەیە و ناچێتە نێو گیرفانی حکومەتەوە. ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی ڕاکردن لەو تەڵەیەی کە دەبووە هۆی نەدانی باج، هەروەها نەدانی باجیش دەبووە هۆی بەرزکردنەوەی ڕێژەی وەرگرتنی باج بەناو و دزی کردنی زیاتریشی بەدوادا دەهات. دیراسەیەکی هیندستان حاڵەتێکی کلاسیکمان دەخاتە بەردەست. وێڕای زۆربوون لە ڕێژەکان، کۆی گشتی دەرامەت دابەزی چونکە گەندەڵی زیادی کردو گۆڕانێک بەسەر چالاکیە ڕاستگۆکاندا هات. لەم حالەتانەشدا، کەموکوڕیەکی زۆری چاکسازی لە پێکهاتە و ئیدارەی سیستەمی باج ڕێگە دەدات ئەمانە ڕووبدەن. زۆر بەسادەیی دەکرێت ئەمە چارەسەر بکەیت ئەویش لە ڕێگەی زیاد کردنی مووچەی کۆکەرەوەی باج و چاودێری و لێ پێچینەوە.

## حوکمی حکومەت و دابینکردنی خزمەتگوزاری

ئابووری ناسان چەند چاکسازییەکی یاساییان پێشنیار کردووە کە دەسەڵاتی دەسەڵاتداران سنووردار دەکات. بۆ نموونە، پشتگیری لە هەندێ لایەنی بازاڕ دەکەن وەک ڕێگە پێدانی بازرگانی و بەرپرسیارێتی پاشماوەی ئاوەڕۆی نێو بازاڕ. هەروەها پێشنیاری ئەوە دەکەن کە حکومەت پارە لە هاوڵاتی وەرگرێت لە بەرابەر ئەو

خزمەتگوزارییەی کە بۆیان دابین دەکات. ئەم جۆرە چاکسازییانە زۆرجار سوودی زیاتریان هەیە وەک کەم کردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵییەکان بەهۆی پارە وەرگرتن بەشێوەیەکی یاسایی لە بری بەرتیلدان و وەرگرتن. فرۆشتنی ئاو و مافەکانی تەرخانکردنی شوێنی لەوەڕ و مافەکانی ژینگە و بەخشینی مۆڵەتی هەناردن و هاوردە دەتوانن کارەکانی حکومەت بەرەو بارێکی باشتر ببەن کاتێ حکومەت سەرگەرمی کەمکردنەوەی گەندەڵییە. سرە گرتن لە سەر هەر شتێک دەکرێ بەڕێوە بچێت لە ڕێگەی دانانی کرێی جیاواز بەگوێرەی خێراییەکەی ئەو کەسەی کە سرەی گرتووە. واتە کێ شایەنی وەرگرتنە با بۆ ئەو بێت و سرە بری نەکرێت. بۆ نموونە، نووسینگەی پاسەپۆرتی ویلایەتە یەکگرتووەکان خزمەتگوزاری زۆر بەخێرایی پێشکەش دەکات لە بەرابەر کرێ. ڕووپێوەکانی هاولاتی و کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان لە پاکستان و هیندستان ئەوە دەخەنە ڕوو کە کاتێ گەندەڵی پەرت و بڵاو دەبێتەوە، کار و بازرگانی ناوخۆ و خەڵکی هەژار ئامادەن پارە بدەن بۆ باشتر کردنی خزمەتگوزارییەکانی حکومەت. لە هەموو ئەو باوردۆخانەدا، خزمەتگوزارییەکان بۆ ئەوانە دەبێت کە باشترین ڕێز و بەهای بۆ دادەنێن، لە هەمان کاتدا پارەدان نرخی یاسایین نەوەک بەرتیل.

پاڵنەرەکانی پلان دانان، گەر بەباشی و ئاشکرا دابڕێژرێن، هەمیشە پاڵشتی یاسا دەگرێت نەوەک پشت گوێ خستنی یاسا، ئەو یاسایەی کە بتوانێت ئامانجەکانی دادوەری و یەکسانی بەدەست بێنێت. زۆری بەکارهێنانی میکانیزمی لامەرکەزی بۆ نیزام دانان دەبێتە هۆی دروست بوونی جیاوازی هەم لە کاری ئاژانسە سادەکانو و هەمیش لە گلدانەوەی بەرژەوەندییەکانی کار و بازرگانی. لەو ناوچانەی کە ئاو و هەوا تیایدا پیسە و پاک نییە، بازاڕ و شایستەیی کار دەبێت بەپێی یاسا ڕێک بخرێت نەوەک هەرکەسەو بەئارەزووی خۆی هەر شوێنێکی بوێت عارەبانەیەکی لێ دابنێت و پاقلە بفرۆشێت. بەکارهێنانی پاڵنەرە داراییەکان ڕەنگە بەمانای ئەوە بێت کە ئاستە بەرزەکانی پاک کردنەوە شیاوترن لە حوکمی کۆنترۆڵ کردن و گشتی و بەس قسە نەک کردار. ئەم جۆرە پلانانە دەتوانن چاکسازی ڕاستەقینە بێننە بەرهەم، نەک چەند یاسایەک تەنها بۆ بەرژەوەندی کۆمپانیا زەبەلاحەکان. لە ئەنجامدا، ڕەنگە ئەو کۆمپانیانەی کە ستایشی لایەنە چاکەکانی بازاڕ دەکەن لە



دیوەکانی تری بازاڕدا بەتووندی دژی ئەو پلانانە بوەستنەوە. یاسای بەجێ و شیاو خەمێک لە نرخ و قازانج دەخوات و سنوورێکی دیاریکراویان بۆ دادەنێت. یاسای کەمتر لەوە ناسەپێنن.

لە سیستەمە گەندەڵییەکاندا، بازاڕ لە سەر بنچینەی چاکسازی پارە دانی یاسایی ناهێڵێت و بەرتیل لە شوێنی دەڕوێنێت. بەداخەوە، ئەو کۆمپانیایانەی کە بەپێی یاسا کار دەکەن ڕەنگە نارەزایی دەربڕن لە بەرامبەر ئەو چاکسازییانەی کە لە وڵاتە کەمتر گەندەڵەکان بەکەمکردنەوەی نرخ سەیر دەکرێن. بۆیە لە مەکسیک، کار و بازرگانییەکان بەشێوەیەکی گشتی هیچ جۆرە پرۆپۆزەڵێکی پاڵپشتکردنیان نییە بۆ ئەوەی پلانە بێ هێزەکان بگۆڕنەوە بەیاسای کۆنترۆڵکردن و پاراستنی ژینگە لە پیسبوون. بەڕای یەکێک لە پسپۆران " گەندەڵی پەرت و بڵاو لە نێو پشکنەراندا واتە، بازرگانێک دەڵێت، هەمیشە ئەو پارەیەی کە دەیدەین بەفەرمانبەرێک یان بەرپرسێک هەرزانترو کەمترە لەو پارەیەی کە سەرفی دەکەین لە پابەند بوون بەیاسا" وێڕای ئەمەش، گەندەڵی چڕە دووکەڵێکی ڕەش دەخاتە سەر هەوڵەکانی چاکسازی هەروەک چۆنیش دەتوانێت هەوڵ و کۆششەکانی بنبڕکردنی گەندەڵی وەلانێت و داپۆشێت. کۆمپانیا زەبەلاحەکان ڕەنگە هێشتا بەرتیل بدەن بەبەرپرسان تاوەکو ڕاپۆرتی پشکنینیان لە سەر نەنووسێت یاخود گەر بشنووسێت لە باسی خراپەکارییەکان نەکات. شتێکی ئاشکرایە، کە فەرمانبەرە مەدەنییەکان دەبێ هەمیشە چاودێریان لە سەر بێت و پاڵنەریان هەبێت تا کارەکەیان بەباشی بکەن. بەڵام، سیستەمی بوودەڵە و چاوچنۆک هەمیشە کاری ئەو بیرۆکراتانە ئاسان دەکات کە دەستیان لەگەڵ کۆمپانیاکان تێکەڵ کردووە. بۆ نموونە، لە شوێنێکی ژینگەییدا، حکومەت پێویست ناکات فەرمان بدات بەتەسک کردنەوەی ڕێگای کارەکانی کۆمپانیا. ئاژانسی گشتی هەڵدەستێت بەئەنجامدانی کاری خۆی ئەویش چاودێری کردنی بەرپرسیارێتی پیس بوون و پارەی کرێیە. ئاژانسە تایبەتییەکانیش هەڵدەستن بەیارمەتیدانی ئیدارەی بەرنامەکە. بۆ نموونە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، دەستەی شیکاغۆ بۆ بازرگانی لیژنەیەک بۆ کڕین و فرۆشتن دادەنێت لە حکومەتی فیدراڵ بۆ نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی دوانە ئۆکسیدی گۆگرد.

ئەو چاکسازییانەی کە ئالییەتێکی یاسایی پارەدان دەبەخشن بەکۆمپانیاکان لە بەرابەر قازانجەکانیان یان کەمکردنەوەی نرخ دەتوانێت پاڵنەرە گەندەڵییەکان سنووردار بکات. هەتا ئەگەر کۆمپانیاکان زیان بەئەوانی تر بگەیەنن، هەروەک لە ناوچەیەکی ژینگەییدا، چاکسازییەکانی بازاڕ دەتوانن یارمەتی تەرخانکردنی ئامێر بدەن بۆ پاککردنەوە و سنووردار کردنی گەندەڵی. بەڵام، کەسی گەندەڵ هیچ پاڵنەرێکیان نییە پشتگیری بکەن لەو چاکسازییانە گەر هەموو ڕێگەیەکیان لێ دابخرێت بۆ بەرتیل. پێش ئەوە ئەگەری ئەو چاکسازییانە لە ئارادا بن، دەوڵەت دەبێ متمانەی خۆی پتەو بکات لە ڕێگەی چاودێری کردنی یاساییەوە.

## چاکسازی بەرنامەکانی سوودە کۆمەڵایەتییەکان

کرێی بەکارهێنەر ( ئەو کەسەی خزمەتگوزاری حکومەت بەکار دەهێنێت) ڕێگایەکی گونجاو نییە بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاریەکان بۆ هەژاران تا سوودی لێ وەرگرن. بەڵام گەر خزمەتگوزارییەکە پێشتر دابین کرابێت لە ڕێگەی بەرتیلەوە، ئەوا سیستەمێکی یاسایی غەرامە کردن ڕەنگە دووەم باشترین وەڵام بێت بۆ کەمکردنەوەی خزمەتگوزاری. وەک بەدیلێک، خزمەتگوزارییە گشتییەکان دەکرێ بدرێتە ئەو کەسانەی کە پێویستن و دەتوانن بیفرۆشنەوە گەر نیازیان بوو. بەپێچەوانەوە، گەر ئامانجەکە بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوە بێت کە خەڵکی هەژار بەڕاستی سوودی حکومی بەکار دەهێنێت، وەک چاودێری تەندروستی و پەروەردە، ئەوا لەم کاتەدا تەکنیکی دژە گەندەڵی زیاتر پێویست دەکات.

جارێکی دیکە، سادە کردنەوەی بەرنامە دەکرێ ببێتە ستراتیژیەتێکی بەهێزی دژە گەندەڵی. جۆرێک لە سادە کردنەوە ئەوەیە کە کێ تەواو پێویستە خزمەتگوزارییەکە بدرێتە ئەو، هەموو حوکمدانێکی کراوە و داخراو گەندەڵی دەخاتە مەترسییەوە. گەر بەوردی سەیر بکەین، کاتێ خزمەتگوزارییەک لە ڕێگەی یانەسییەوە دابین دەکرێت یا دابەش دەکرێت، وێڕای ئەوەی ئەمە کارێکی یەکسان و دادوەرانە نییە بۆ ئەو کەسانەی کە نایبەنەوە و بۆیان دەرناچێت، بەلایەنی کەم ئەو کەسەی بەختی باشەو دەیباتەوە و بۆی دەردەچێت ڕەنگە زۆر پێویستیش نەبێت کەچی هەر بۆی



دەردەچێت. ئەوەشی ماڵوێرانەو زۆر پێویستە هەر دەناڵێنێت و هەرگیز بۆی دەرناچێت!

دووەم جۆری سادە کردنەوە تەواو سروشتی نێو بەرنامەکەیە. گەر جۆرێک لە سوودەکانی بەرنامە تێکەڵ بوو بەگەندەڵی، هەبوونی پارە دانەوەیەکی ڕاستەوخۆ بەو کەسەی کە زیانی لێ کەوتووە لە بەر گەندەڵی ئەوا ڕەنگە پاڵنەرە گەندەڵیەکان کەم بکاتەوە. بۆ نموونە، لە پیاچوونەوەی بەرنامەکان بۆ کەم کردنەوەی خزمەتگوزاریە زۆر و بۆر و زەوەندەکان لە وڵاتانی پێشکەوتوو، بانقی جیهانی پێشنیاری ئەوە دەکات کە قەرەبووکردنەوەی ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی پارە دانەوە هەبێت بۆ ئەو کەسەی کە کارەکانیان لە دەست داوە. بانق تاوتوێی ئەوە دەکات ئەم جۆرە قەرەبوو کردنەوانە دەبێتە پەندێک بۆ بیرۆکراتەکان کە هەندێ جار خۆیان لە پلانی بانق و ئەم جۆرە سەریەشانە بەدوور دەگرن.

گەر قەرەبووی ڕاستەوخۆی بەپارە ئیختیارێکی گونجاو و شیاو نەبوو، ئەوا زەحمەتی چاودێریکردنی پاشەکەوت کەران ڕەنگە پاڵ بەحکومەتەوە بنێت بۆ ئەوەی بەرەو سادەیی یاخود زەحمەتی بڕوات لە تەزویر کردنی ئەو پێوەرانە. هەرچەندە نابن بە شتێکی میسالی لە بیرۆکراسیەت بەهۆی چاودێریەکی بەهێزەوە، ڕەنگە ببن بەتاکە ئیختیاری بەردەست. هەندێ جار، سیستەمە پاڵنەرەکان کە پێوەری بازاڕ– ژیان بەکار دەبەن دەکرێ یارمەتی دەر بن. بۆ نموونە، گەر حکومەت دابین کەری تایبەتی دامەزرێنێت بۆ پاشکەوت کردنی پاڵپشتی ماددی خزمەتگوزاریەکان ئەوا دەتوانێت سیستەمێکی کڕین و فرۆشتنی بەوەکالەت دامەزرێنێت. ئەو کاتە دابینکەر (بەخشەر) یەک کرێی یەکسان لە بەرابەر خزمەتگوزاری لە هاوڵاتی وەردەگرێت تەنها گەر توانی سەرنجی موشتەریەکان ڕابکێشێت. موشتەریەکانیش دەتوانن وەک کڕیارێکی پێویست پابەند بن بەپارە دانیان. ئەم میتۆدەی چاودێریکردنە سەرکەوتوو دەبێت تەنها گەر موشتەریەکان داوای هەمان جۆری خزمەتگوزاری بکەن کە پێویستیان پێی هەیە و هەروەها ئەو موشتەریانە وەک هەژار دووچاری ترس و ڕاڕایی نەکرێنەوە کە پارەش بدەن و خزمەتگوزاریش بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ و خراپ پێیان بگات و سوودی لێ وەرنەگرن. هەروەها پێویستە لە سەر بەخشەر یا دابینکەر

که جیاکاری نەکات لە نێوان پارە دەر و پارە نەدەر لە بەرابەر خزمەتگوزاریەکاندا. هەروەها نابێت دەسەڵاتی ئەوەیان هەبێت کە ڕێگە بەموشتەری بدەن پارەی کەمتر بدەن و فێڵ لە بریکارەکە بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەنگە ئەگەری ئەوەش شیاو بێت گەر هەموو ئەو مەرجانە دووبارە بکرێنەوە لە مەودایەکی فراوانتری وەک باری پزیشکی و پەروەردەیی. بەڵام، هەتا ئەگەر شتێکی بێ هێزیش بێت، کڕین و فرۆشتن بەوەکالەت وەلامێکە بۆ جۆرێک لە جۆرەکانی ساختە و تەزویر کردن. پاشەکەوت کەران بەزەحمەتی دەزانن کە لایەنی چۆنایەتی پشت گوێ بخەن و هێشتا هەر لە سەر پارە دانی لابەلا بن. بەڵام پلانەکە هیچ شتێک ناکات بۆ دیاریکردنی هەوڵی ساختە کارانە لە مەڕ سوود و قازانجەوە کە دەکرێ بەئالیەتی تر چارەسەری ئەمە بکرێت.

ئاشکرایە، بەهای ئەو چاکسازییانە پشت دەبەستێت بەخەرجییەکانی دیاریکردنی ئاسانکاری فەرمانبەرە گشتییەکان. هەندێ جار، مەترسییەکی دیاریکراوی گەندەڵی دەبێ لێی ببووردرێت لە بەر سوودەکانی حاڵەت بەحاڵەت بۆ ئیدارەی بەرنامەکە. بەڵام تەنانەت لەم حاڵەتانەدا شەفافیەت و ئاشکرایی دەتوانن یارمەتیدەرێکی باش بن بۆ پاڵنەرە گەندەڵییەکان.

## فشارە پێشبڕکێکارییەکانی ئیدارە

گەندەڵی زۆرجار لە پێکهاتەی ئەندازەیی بیرۆکراسیەتدا پێگەی خۆی پتەو دەکات. فەرمانبەری پلە نزم بەرتیل کۆدەکاتەوە و پشکێکی ڕەوانەی فەرمانبەرە پلە بەرزەکان دەکات (بەرپرسان)، بێ گومان لە فۆرمێکی ڕووکەشی پارەدانی نێو کارەوە ئەنجام دەدرێت. بەپێچەوانەوەش، بەرپرسە بەرزەکان سیستەمی گەندەڵی ڕێک دەخەن و جوانکاری ماقوڵی بۆ دەکەن بۆ لەناوبردنی پێشبڕکێی بێ کەڵک و بێ سوود لە نێوان فەرمانبەرە پلە نزمەکان. بەرپرسە بەرزەکان پاشان دەسکەوتەکان بەش دەکەن لەگەڵ ئەوانەی خوار خۆیان، بگرە بەکاریشیان دێنن بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان (موهیمەکانیان) و گواستنەوەی فەند و ئەنجامدانی کاری مەترسیدارتر کە وایان دەردەخات بۆ ئەوەی بگیرێن. شکاندنی ئەم جۆرە پێوەندانگەش پێویستی بەکۆششێکی ڕیشەیی ڕێکخستنەوە هەیە.



یەکێک لە تەکنیکەکان بەکارهێنانی داهێنەرانەی فشارە پێشبڕکێکاریەکان لە نێو حکومەت دەخاتە گەڕ. وێنەی ئاسایی بیرۆکراسیەت دارێکە لەگەڵ هەر فەرمانبەرێکی بەرپرس لەوانەی ژێر دەستی بۆ تەواو کردنی ئەرکە بێ وێنەکەی. بۆ نموونە، بەرپرسان ڕەنگە هەموویان هەمان خزمەتگوزاری پێشکەش بکەن، بۆ نموونە خزمەتگوزاری وەک دەرکردنی مۆڵەت پێدانی بونیاتنان، بەڵام هەریەکەیان بەپێی ناوچەی جوگرافی جیا جیا. بەدرێژایی ئەو کاتەی کە فەرمانبەران مومارەسەی دەسەڵاتی خۆیان دەکەن، ئەم جۆرە فۆرمەی ڕێکخستن پلەی دەسەلاتی قۆرخکردن بەسەر کڕیارەوە دەبەخشێتە هەر فەرمانبەرێک یان بەرپرسێک. هەیکەلی ئیداری ڕوون و باش ڕێکخراوە، بەڵام ئەنجامەکەش گەندەڵییەکی سەراپاگیرە. ئەم ڕەوشە نالەبارە دەکرێت لە ناو ببرێت گەر فەرمانبەرەکان هەمان جۆری خزمەتگوزاری کارلێکراو پێشکەش بکەن. دەکرێ دەسەلاتێکی دادوەری تەواویان پێ بدرێت کە مۆڵەتی ئیختیارێک بەکڕیار بدەن کە لە ڕێگەیەوە بیرۆکرات نزیک بێتەوە. چونکە کڕیار دەتوانێت پێشکەشی هەر ژمارەیەک بەرپرس بکات و هەروەها دەتوانێت بچێت بۆ لای دووەم گەر ئەوەی یەکەم پشتیان بدات بەئەرز، هیچ فەرمانبەرێک دەسەلاتێکی زۆری قۆرخکردنی نییە. بۆیە کەس ناتوانێت بەرتیلێکی زۆر وەدەست بێنێت.

بە پێی چ مەرجێک بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێ کار ستراتیژیەتێکی واقیعی چاکسازیە؟ باشترین حالەت سوودی گشتییە کە بەردەستە بۆ هەموو ئەو ڕکابەرانەی دەست پێشخەری دەکەن بۆ بەدەست هێنانی. شتێک بێنە بەرچاوی خۆت کە بەقەد فرۆشتنی پولی پۆستە کارێکی نەخوازراو بێت. هەر کەسێک کە دەیانکرێت ئەوا بەهای خۆی وەک هاولاتیەک ناخاتە ڕوو. ئەمە مانای ئەوەیە کە دەسەلاتی فەرمانبەر کەمە. گەر فەرمانبەرێک داوای بەرتیل بکات، ئەوا موشتەریەکان دەتوانن بەئاسانی بچنە دووکانێکی تر یان پۆست ئۆفیسێکی تر. بێ گومان، فەرمانبەران دەتوانن بەخشیش وەرگرن لە بەرابەر بەخشینی پوولێک بەبەلاش، بەڵام سروشتی بەرهەمەکە کۆنترۆڵی دارایی دروست دەکات بەشێوەیەکی وەها ئاسان کە دابمەزرێت. ئەم حاڵەتە سادەیە داواکاریە بنەڕەتییەکان ڕوون دەکاتەوە بۆ ئاشنایەتییەکی سەرکەوتوویی بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێکارانە. خەڵک

دەبێ هەموویان لە بازنەی سوود وەرگرتندا بخولێنەوە، هەروەها دەبێ فەرمانبەران و بەرپرسانیش نەتوانن وەها بەئاسانی لەوە زیاتر بکەن کە کرِیار شایەنییەتی. ئەگەری پێشکەش کردنەوەی بەبەرپرسێکی نوێ ئەو کاتە هێزی بەرتیل سنووردار دەکەن بۆ هەر تاکە بیرۆکراتێک. گەر ئەو هەل و مەرجانە ڕوو نەدەن، ئەوا کرِیار و بەرپرس لە پەیوەندیەکی سەراپاگیر دان و هەردوو لا پێیان خۆشە بەردەوام بن. قەبارەی بەرتیل بچووک دەبێتەوە بەهۆی وجوودی بەرپرسە گەندەڵەکانی تر، بەڵام زەرەر و زیانی دەوڵەت هەر بەگەورەیی دەمێنێتەوە. بۆیە، ئەگەری ڕوودانی بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێکارانە دەوەستێتە سەر، بەشێوەیەکی گرینگ، توانای ئاستە بەرزەکانی بیرۆکراسی بۆ چاودێریکردنی ئەنجامەکان. پێویست بەوە ناکات بتوانن بەخۆیان تێبینی بەرتیل بکەن، بەڵام دەبێ بتوانن چاودێری دەرهاویشتەکە بکەن. هەر لە نموونەی پولی پۆستەییدا، دەسەڵاتە بەرزەکان دەبێ بزانن چەند دانە پول فرۆشراوە و هەروەها دەبێ بزانن چۆن بەرپرس و فەرمانبەری پلە نزم بەرپرسن لەو دەرامەتەی کە کۆکراوەتەوە. ئەندازەی هەرِەمی ئێستاش هەر پێویستە. بەڵام ئەرکەکەی دەگۆڕێت بەرەو چاودێریکردنی ئەنجامەکان نەک هەڵسوکەوت.

لەو حاڵەتانەی کە بەرپرسەکان پێوستە برِیار لە سەر ئەوە بدەن کە ئایا پێشکەش کارێک دەشێ بۆ وەرگرتنی سوودێک وەک مۆڵەتێک یان ڕێگە پێدانێک، هەروەها بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێ کارانە هەندێ کاری هەیە بەپێی چەند مەرجێکەوە. گریمان سوودێکی وەک پاسەپۆرت یاخود مۆڵەتی لێخورِێن زۆر و زەوەندە بەڵام بەستراوەتەوە بەشایستەیی داواکار. پێوەرەکانی وەرگرتنی ئەو سوودەش ڕوونە و ئاشنایە بەکرِیار و بەرپرس. داواکاری ناشایستە ناتوانێت سوودەکە دەستەبەر بکات بەبێ بەرتیل، هاوکات داواکاری شایستە و شیاو دەتوانێت ڕاپۆرت لە سەر داوا گەندەڵەکان بنووسێت و دووبارە پێشکەشی بەرپرسێکی تری بکاتەوە گەر ئەوەی یەکەم داوای بەرتیلی زۆر کرد. گریمان هاوڵاتیان نازانن کە ئایا بەرپرسێک یان فەرمانبەرێک گەندەڵە یان نا تا ئەو کاتەی بەڕاستی داوای بەرتیلیان لێ دەکەن. لەگەڵ بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێ کاردا، داواکاری شایستە هیچی پارە نادات زیاتر لە تەقدیم کردنی بۆ بەرپرسێکی تر، بەلە بەر چاو گرتنی ئەوەش کە بەرپرسەکەی تریش



ڕەنگە داوای بەرتیل بکات. ئێستا ڕاستگۆیی هەندێ لە بەرپرسان خەرجی زۆر دەکات بۆ داواکاری ناشایستە و ڕەنگە دووریان بخاتەوە، هەروەها ببێتە هۆی کەمکردنەوەی دەرامەتی بەرتیل و هاندانی هەندێ لە بەرپرسە گەندەڵەکانی پێشوو بۆ گۆڕان و زیاتر کردنی مەترسی لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە ئیتر بەم شێوەیە. بەرتیل وەک قومار وایە بۆ هاوڵاتیان و بۆ بەرپرسانیش کە دەبێ ڕەچاوی ئەو ئەگەرە بکەن کە ڕەنگە هاوڵاتی ڕاپۆرت لە سەر داوای گەندەڵ بنووسێت. گەر ئەو پارەیە هیچ بەهایەکی نەبێت، ئەوا بەرپرس و فەرمانبەرانیش هیچی تر داوای بەرتیل ناکەن و خزمەتی داواکاری ناشایستە ناکەن. نموونەیەک بۆ ئەم حالەتە لە ئەندەنووسیا ڕووی دا لە سالآنی حەوتاکان لە نێو ئەو بەرپرسانەی کە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئیمتیازی ڕەزامەندی پێشکەشکارانی وەگەڕخستن لە دەرەوە. پێشبڕکێ ئەوەندە گەورە بوو کە سوودەکانی پارە دانی واتە " پارەی خێرا" لە ناوچوو، هەروەها داوا گەندەڵییەکان هیچی تر درێژەی نەکێشا. دواتر سەرۆک سوهارتۆ دەرکەوت و ئەو کێشەیەی چارەسەر کرد بەهۆی زیاد کردنی ئەو جۆرە برِیارانە لە نێو ئۆفیسی تایبەتی خۆی.

تەنانەت گەر بەرتیلدەران و وەرگران شایستە نەبن بۆ ئەو سوودەی بەدوای دەکەون، بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێ کارانە ڕەنگە هێشتا هەندێ سوود وەبەر بێنێت. هەرچەندە ناشایستە هەر بەرتیل دەدات، تەنانەت برِێکی زۆر نادەن چونکە دەتوانن ڕوو لە بەرپرسی تر بکەن. بەداخەوە، بۆ نموونە، گەندەڵی لە بەخشینی مۆڵەتی شوفێریدا. ڕاستگۆیی هەندێ لە بەرپرسان لە بەشی سەیارەدا دەسکەوتەکانی گەندەڵی زۆر دەکات، بەبەرپرسی زیاتریشەوە کە لە ماوەی داهاتوودا ڕوو لە گەندەڵی دەکەن. هەرکە زۆرێکی تریش بوونە گەندەڵ، دەسکەوتی قبوڵ کردنی بەرتیل سەرناکەوێت تاوەکو چارەسەرێکی گونجاو و جێگیر ئەنجامی نەبێت. ئاستە نزمەکانی بەرتیل کە لە ڕێگەی پێشبڕکێ وە وەبەر دێت، هانی داواکاری ناشایستەی زۆرتر دەدات بۆ بەرتیلدان. زیانە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم جۆرە سیستەمە زۆر زۆرە، هەرکە ناشایستەکان ڕێگا بەخۆیان و مۆڵەتە نوێیەکە دەگرنە بەر.

بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێکارانە بەهای دیاریکراوی هەیە لەو حاڵەتانەی کە

بەرپرسان و فەرمانبەرانی وەک کۆکەرەوەی باج و ئەفسەرەکانی پۆلیس خەرجی بەسەر سوودا دەسەپێنن. لەگەڵ ئەوەشدا، بەلایەنی کەم دەتوانێت ئاستی بەرتیلدان کەم بکاتەوە. ئەفسەرەکانی پۆلیس بەنیازی کۆنترۆڵ کردنی کارە نایاساییەکانیان هەیە لەو ناوچانەی کە ئەو کارانە زۆر ڕوودەدات. ئەو ڕێگایەی قومارچییەکان و ئەوانەی مامەڵە بەمادده سڕکەرەکان دەکەن زۆر پارە نادەن بەتاکە پۆلیسێک چونکە ڕەنگە ئەوەی دووەم پاشان بێت و ئەویش داوای بەرتیل بکات. هیچ پۆلیسێک بەتەنیا ناتوانێت ڕەوشەکە بپارێزێت و ناتوانێت بڕێکی یەکجار زۆر لە بەرتیل داوا بکات. ئەو خەڵاتە بچووکانەی کە دەدرێت بەپۆلیسان ڕەنگە هانی کەمێکی تریان بدات بۆ مانەوەیان بەڕاستگۆیی پاش هاوسەنگ کردنی مەترسیەکان و سوودەکانی قبوڵ کردنی بەرتیل.

ئەو بەرپرسانەی کە پابەند کراون بەیاساکان یاخو بەبەرنامەکانی سوودی ئیدارە کەمێک بەپۆلیس دەچن. بەرپرسان دەتوانن پارەیان پێ بدرێت لە لایەن چەند بازرگانێک بۆ ئەوەی چاو بپۆشن لە سەرپێچییەکان، هەروەها بەڕێوەبەری بەرنامەکانیش دەتوانرێت پارەیان پێ بدرێت بۆ پێشێلکردن و سەرپێچی کردنی حوکمەکانی دابەشکردن. بۆیە ئەو ناوچانەی کە یاسا باش تیایاندا حوکم دەکەن دەکرێت لێرە وەک چارەسەرێک سەیر بکرێن. بۆ نموونە، لە بەڕازیل لە سالآنی حەوتاکان گەندەڵی کۆنترۆڵ کرا لە بەرنامەیەکی چاکسازی خاکدا لە یەکێک لە قەزاکان ئەمەش لە بەر پێشبڕکێیەکی ئاڵۆز و توند. هەموو ئەوانەی کە نارەزاییان لە بەرابەر فەرمانبەر و بەرپرسی چەواشەکەر دەردەبڕی لە یەکێک لە ئاژانسەکان دەیتوانی بچێت بۆ بەرپرسێکی تر لە ئاژانسێکی تر بەنیازی ڕاست کردنەوەی ئەو حالەتەی هەڵەیەی بەرپرسی یەکەم.

بێ گومان، پۆلیس و پشکنەرانی کارگە و بەڕێوەبەرانی بەرنامە ڕەنگە وەڵام بدەنەوە لە ڕێگەی خۆڕێکخستنیان بەنهێنی لە نێوە خۆیان بۆ چەواشە کردنی بەرتیل لە بازرگانەکان و هاولاتیان. ئەمە زۆرجار ڕوویداوە وەک مەسەلەیەکی واقیعی. بەڵام هەندێ جار شکاندنی ئەمانە ئەگەرێکی پێشبینی کراوە بەهۆی ئەفسەرانی سەپاندنی یاسا یان پشکنەران لە یاسا سیاسییە هەمەجۆرەکان وەک



مەحەلی و دەوڵەتی و فیدڕاڵی. هەرچەندە ڕێکەوتن بەنهێنی لە نێوە خۆ ڕوودەدات لەم هەل و مەرجەدا، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕێکەوتنیان زەحمەتترە. لەو حالەتەی بەڕازیل کە لە سەرەوە باس کرا ڕێکەوتنی لە ژێرەوە و بەنهێنی سنووردار بوو چونکە بەرپرسان لە ئاژانسی جیا جیاوە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی کەمیان هەبوو. لە شارۆچکەی دووەمدا، کە ئەمە تیایدا ڕاست نەبوو، گەندەڵی زۆر خراپ بوو.

هەرچەندە بیرۆکراسیەتی پێشبڕکێکارانە ڕەنگە ئاستی بەرتیل دەهێنێتە خوارەوە، هەروەها لەوێدا هەندێ لە بەرپرسە گەندەڵە بەرپرسەکان سست دەکاتەوە، هەروەها نرخی کەمی بەرتیل هاولاتیان و بازرگانەکان زیاتر هان دەدات بۆ چوونە نێو بازاڕی نایاسایی. پرسیاری هەرە سەرەکی لەم حالەتەدا ئایا ئەوەیە کە نرخی کۆمەلایەتی بەرتیل بەتەواوی پەیوەستە بەقەبارەی بەرتیلەوە. بۆ نموونە، حالەتی بەرپرسانی باج لە هیندستان.

هەر نووسینگەیەکی باج ڕێک دەخرێت تاوەکو بەرپرسان یاسای بەردەستیان هەبێت. ئەو نووسینگانە لەگەڵ پاڵپشتییەکی فراوانی ستاف بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئەو نووسینگانەی کە ستافێکی کەمتریان هەیە. پسپۆران پێیان وایە کە لە نووسینگە گەورەکاندا بەرپرسان ڕکابەری یەکتر دەکەن بۆ ئەو بەرتیلەی دەدرێت لە لایەن باج دەرانەوە بۆ کەم کردنەوەی بەرپرسیارێتی و متمانەیان. ئەمە ئاستی بەرتیل دادەبەزێنێت. بەخشینی کەمترین دەرفەتی سزا دان، بەرتیلی کەم بەرپرسان هان نادەن بەڕاستگۆیی هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام بەدڵنیاییەوە باج دەران هان دەدەن بۆ ئەوەی بەرتیلیان بدەنێ بۆ کاری تایبەتی. بارودۆخێکی لەم شێوەیە باس کرا لە نیپاڵ کە تیایدا ئەفسەرانی گومرگ کەوتنە ڕکابەری یەکتر بۆ ئەوەی گومرگ کەم وەرگرن و لە بری ئەوە بەرتیل وەرگرن. بازرگانەکانیش چوونە لای ئەو ئەفسەرانەی کە بەکەمترین بەرتیل ڕازی دەبوون. هەندێ لە ئەفسەران هەوڵیاندا ڕکابەرێتیەکە سنووردار بکەن لە ڕێگەی بەکرێ گرتنی کەسانی تر بۆ بێزار کردنیان و واز هێنان لە بەکارهێنانی ئەفسەرەکانی تر. سەرنجی ڕێگایەکی گرینگ بدە کە تیایدا ئەم جۆرە حاڵەتانەدا جیاوازە لە حاڵەتی سەپاندنی یاسادا. قومارچییەک یاخود تلیاک فرۆشێک هەرگیز هەست بەزەمانەت ناکات چونکە پۆلیسێکی نوێ لە

هەر کاتێکدا بێت دەگاتە سەری و دەستگیری دەکات یان ئەوەتا دەبێ بەرتیلی بداتێ. لە حاڵەتی باجدا، بەرپرسەکان پێشبڕکێ لە سەر ئەوە دەکەن کە نرخی باج لە بەرابەر بەرتیلدا دابەزێنن، بەڵام هەرکە باجدەرێک بەرتیلی دا بەبەرپرسێکی پلە نزم، هیچ کەس لە هەمان ئاستدا دەسەڵاتی ئەوەی نییە خۆی لێ بدات. چاودێریکردن لە سەرەوە پێویستە بۆ زۆرکردنی مەترسییەکان دێنە پێشەوە بەهۆی فەرمانبەرە مەدەنییە گەندەڵەکان.

## کاریگەری نەهێشتنی یاساکانی دژە گەندەڵی:

هەموو وڵاتەکان هێڵێک لە شوێنێکدا دەکێشن لە نێوان بەرتیلی نایاسایی و دیاری پەسەند کراوی ویستێکی باش. بەڵام سنوورەکە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی جیاواز، بەڵام لەم بەشەدا من باسی ئەو حوکمە دەکەم کە دراوەو بەدوای ستراتیژیەتێکی کاریگەردا دەگەڕێت. ئەو ستراتیژیەتە کە من جەختی لە سەر دەکەمەوە لە سەر چاک کردنی کاریگەری کۆششی دەست گیر کردن و سزادان لە سەر هەموو ئەو کەسانەی کە دێنە پێشەوە بەبەڵگەی کاری گەندەڵییەوە.

دوا خاڵی گەندەڵی سفر نییە هەتا ئەگەر یەکێک هیچ بەهایەک نەدات بەو سوودانەی وەردەگیرێن لە بەرتیلدەرانەوە. هەرکە یەکێک نرخەکانی قەدەغەکردن دەخاتە بەرچاو، ئاستی بەربەستی سەرفکردن دەبێ دیاری بکرێت لەو شوێنەی کە سوودە پەراوێزخراوەکان یەکسان دەبن بەنرخە پەراوێزخراوەکان. بەربەست لە بەردەم هەڵسوکەوتی تاوانکاریانە دەوەستێتە سەر ئەگەری گرتن و سزادان و جۆری ئەو سزایەشی بەسەر تاوانباردا دەسەپێت، ئەوانەی کە سەپێنراون بەسیستەمێکی یاسایی و ئەوانەشی کە زیانی لێ دەکەوێتەوە وەک زیان لە ناوبانگ و شکۆمەندی. دەسەڵاتەکانی سەپاندنی یاسا جۆراوجۆرن، بەڵام ئێمە بەڵگەی بەهێزمان بەدەستەوە نییە لە سەر گرینگی کامە یاسا بۆ جێبەجێ کردنی.

لێکۆڵینەوەی سەرکەوتوو لە گەندەڵی دەوەستێتە سەر ئەوانەی ناوەوە کە ڕاپۆرت بنووسن لە سەر هەر خراپەکارییەکی کە بەدی بکەن. زۆرجار ئەمە پێویستی بەفەرمانبەرانە کە بەڵێن بدەن ئاسانکاری بۆ یەکێک لە بەشدار بووان بکەن. ئەمە



هاودژیەکی ئەوتۆ دروست دەکات بۆ هەوڵەکانی سەپاندنی یاسا. سزای زۆری چاوەڕێکراو دەبێتە هۆی نەهێشتنی گەندەڵی، بەڵام ئەگەری هەرە بەرزی لێکۆڵینەوە دەکرێ دەستە بەر بکرێت تەنها گەر هەندێ بەڵێنی سزایەکی کەمیان پێ بدرێت. بەتاوتوێکردنی قەدەغەکردن لە سەر بنچینەی سزای چاوەڕێکراو دواجار ڕەچاوکردنی ئەو ستراتیژیانەی کە هەڵوەستە دەکەن لە سەر تێکەڵ بوون لە نێوان سزا و ئەگەری لێپێچینەوە.

لە بەر ئەوەی ڕێکەوتنێکی گەندەڵ پێویستی بەدوو لایەن هەیە، ئەوا تاوانەکە ڕوونادات گەر یاسا بتوانێت بەلایەنی کەم پێشی یەکێ لەو لایەنە بگرێت و قەدەغەی بکات. لە هەندێ وڵاتدا، بەرتیلدەرەکان بەسادەیی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت لەوەی لەگەڵ موراجیعەکان. تەنانەت هەندێ وڵات بەرتیل بەتاوان لە قەڵەم نادەن. لە هەندێ وڵاتی تردا پێچەوانەکەی ڕاستە، یاسای تاوان گەندەڵی چالاک ناچالاک لە یەکتر جیا دەکاتەوە. ئەم جیاکردنەوانە هەموو حاڵەتە دەوڵەمەندە جۆر بەجۆرەکان ناگرێتەوە. زۆرجار فەرمانبەرێکی حکومی دەکرێ وەک لایەنێکی چالاک سەیر بکرێت کە سەرچاوەی چەواشەکاری بەرتیل و پارەدانە. لە ڕووی کردەییەوە، جیاوازی نێوان گەندەڵی چالاک و ناچالاک هەروەها لە نێوان بەرتیل و چەواشەکاری مانایەکی کەم دەبەخشێت چونکە هەردوو لا پێویستە پێش ئەوەی گەندەڵییەکە ڕوو بدات لەگەڵ یەکتر ڕێک بکەون و مامەڵەکە ببڕێننەوە.

لە بری ئەوە، بەرتیل دەکرێ باشتر جیابکرێتەوە لە سەر بنچینەی زیانە کۆمەڵایەتیەکانی. بەڕەچاو گرتنی ئەوە دەست پێ دەکەم ئایا بەرتیلدەر دەچێتە قاڵبی سوودەوە، هەروەها ئایا کەمی سوود وجوودی هەیە؟ ئەمە سێ پۆلێن بەرهەم دەهێنێت: سوودێکی نایاسایی، سوودێکی یاسایی بەڵام سوودێکی کەم، هەروەها سوودێکی یاسایی کە کەم نەبێت گەر بەڕاستگۆیی دابین بکرێت. گەر سوودە دابینکراوەکە نایاسایی بوو، ئەوا زیانی کۆمەڵایەتی گەندەڵی چەواشەکاریەکە بەهۆی بەرتیل و گەندەڵییەوە دروست دەبێت. گەر سوودەکە یاسایی بێت بەڵام کەم بێت، بەرپرسی گەندەڵ بەرتیلدەران فەرز دەکات بەسەر سوودەکانی ترەوە. زیانی کۆمەڵایەتی تۆڕێکی زەرەر کردنە لە ڕووی دابینکردنەوە بەهۆی ئامادەیی بۆ

بەرتیلدان لە بری ئەوەی بەهۆی پێوەرێکی بەرنامەی گەندەڵ بێت. لە کۆتاییدا، ڕەنگە سوودەکە یاسایی بێت بەڵام زۆر کەم دەردەکەوێت تەنها لە بەر بەرپرسی حکومی گەندەڵ. دواجار زیانی کۆمەڵایەتی چەواشەیە دروست کراوە لە لایەن هەوڵ و کۆششەکانی بەرپرسەکانەوە بۆ بەدەستهێنانی بەرتیل. لە بڕیاردانی ئەوەی چۆن سەرچاوەکانی سەپاندنی یاسا تەرخان بکرێت، ئەوا دەبێ پلە جۆراوجۆرەکانی زیانی کۆمەڵایەتی گرینگترین و یەکەمین شت بن کاریان لە سەر بکرێت. بەگشتی، لە ڕووی چارەسەر کردنەوە، بەرزترین پلە دەبێ بدرێت بەگەندەڵی لە گلدانەوەی سوودە نایاساییەکان. لە ڕووی مەعنەوییەوە، کارێکی زەحمەتە پلە لە سەر مامەڵەکانی گەندەڵی دابنرێت کە کار لە گلدانەوەی سوودە یاساییەکان دەکات. زیانە کۆمەڵایەتیەکان دەوەستێتە سەر ئەو زەرەرەی دەکەوێتەوە بەهۆی بەکارهێنانی پارەدان وەک بەرتیل، ئەمە لە لایەک، بەرامبەر ئەوەش ناشایستەیی و نەشیاوی و ویژدانی چڵێسی هەوڵی بەرپرسەکان بۆ داڕشتنی پلانێک بۆ سستی گەشەسەندن و کەمی کاڵا لە لایەکی ترەوە.

با ئێستا بچینە سەر ستراتیژیەکانی سزادان. ئاستی زیانە کۆمەڵایەتیەکانی جۆری جیاوازی گەندەڵی دەتوانێت یارمەتی پێشینەی سەپاندنی یاسا بدات. بەڵام، ئەو سزایەی کە دەسەپێت بەسەر گیراوێک نابێ بەو زیانە کۆمەڵایەتیانە ببەسترێتەوە، بەڵکو دەبێ بەو سوودانەوە ببەسترێتەوە کە بەهۆی گەندەڵیەوە وەریگرتووە. با وا دابنێین کۆمەڵگا کێشێکی پۆزەتیف بەدەسکەوتەکانی گەندەڵی نابەخشێت، ئەوا ئامانجەکە کەم کردنەوەی گەندەڵیە بەپێی توانای سەرچاوەکانی سەپاندنی یاسا کە تەرخان کراون. بۆ قەدەغە کردنی گەندەڵی بەلایەنی کەم یەکێک لە لایەنەکانی مامەڵەکانی گەندەڵی دەبێ دووچاری سزادان ببێتەوە کە ڕەنگدانەوەی سوودە تایبەتییەکانی بێت. لەبەرئەوەی هەلی لێپێچینەوە و دەستگیرکردن زۆر کەمە، ئەوا دەبێ ئەوانەی کە دەستگیر دەکرێن ببنە قوربانی هەموو دەسکەوتەکانیان. لە ڕوانگەیەکی بێ خەوشی قەدەغەکردنەوە، هەر لایەکی مامەڵەی گەندەڵی بێت دەبێ ببێتە خاڵی سەرەکی کاری هەوڵەکانی سەپاندنی یاسا. بەڵام لە ڕوانگەی پەسەندکردنی گشتییەوە، ئەو بەرتیلدەرانەی بەنیازی سوودی یاسایین پەنا بۆ سۆزو



بەزەیی گشتی دەبەن و نابنە مایەی گلەیی و نارەزایی. بەرپرسە گەندەڵەکان هەرچیەک بن دەبێ دووچاری ئەو سزایە ببنەوە کە بەرستراوەتەوە بەو سوودانەی کە وەریان گرتووە لە سەرەنجامی گەندەڵیەوە.

سزای بەرپرسەکان دەبێ بەگوێرەی قەبارەی ئەو بەرتیلە بێت کە وەریان گرتووە و هەروەها بەگوێرەی لێپێچینەوەکەش بێت. گەر بێت و سزا بەقەد قەبارەی بەرتیلەکەوە نەبێت، ئەوا ڕێچکەی دژە گەندەڵی زۆر بەخێرایی ئاوەژوو دەبێتەوە. سزایەکی جێگیر و بەرز حاڵەتی کەشفبوونی گەندەڵی کەم دەکاتەوە و قەبارەی پارەدان وەک بەرتیل زۆر دەکات. گەر سزایەکە بەرز بێت، بەرپرسەکان دەبێ لە بەرامبەر ئەوەدا شتێکی بەرزیان وەرگرتبێت بۆیە وەها بەئاسانی بەپەرۆشیەوە چووەتە پاڵ گەندەڵیەوە. بۆیە دەبێ سزای چاوەڕێکراو بەقەد هەر دۆلارێک زیاد بکات کە بەرپرسی گەندەڵ وەک بەرتیل وەری دەگرێت. ئەم کارەش ئەنجام دەدرێت لە ڕێگەی سەپاندنی سزا بەسەر گیراوەکە بەپێی قەبارەی بەرتیلەکە یاخود لە ڕێگەی زۆرکردنی مەترسی گرتن وەک قەبارەی زۆری بەرتیلەوە. واتە گرتن ئەوەندە زۆر بێت کەس لە ترسی گرتنەوە نەوێرێت خۆی لە گەندەڵی بدات. گەر بێت و ئەگەری گرتن کەمتر بوو بۆ بەرتیلی بچووک، ئەوا دەبێ سزا بۆ هەر کەسێکی تاوانبار ڕەنگدانەوەی ئاشکرا کردنی ڕووداوی بچووک بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەوانەی بەتۆمەتی بەرتیلی بچووک دەستگیر کراون سزای زۆر توندتر وەرگرن لە چاو ئەوانەی کە بەتۆمەتی وەرگرتنی بەرتیلێکی زۆرەوە ئاشکرابوونە.

لە لایەکەی دیکەی مامەڵەی گەندەڵیدا، گەر سزایەکی جێگیر بسەپێنرێت بەسەر بەرتیلدەران ئەوا ئەم سزایە داوای خزمەتگوزاریە گەندەڵیەکان و ئاستی بەرتیلدان کەم دەکاتەوە. بەڵام، هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی نابێت هەرکە بەرتیلدەر پێشتر دەستی بەگەندەڵی کردووە بەنهێنی. بۆ ئەوەی سزایەکە کاریگەریکەی ئەوتۆی هەبێت ئەوا ئەو سزایەی دەسەپێنرێت بەسەر بەرتیلدەردا دەبێ بەقەد دەسکەوت و قازانجەکەی بێت، نەک بەقەد قەبارەی بەرتیلەکەوە. بەرتیلدان وەک خەرجیەکە بۆ ئەوانەی کە دەیدەن بەیەکێک، بۆیە سزاکان نابێت ببەسترێنەوە بەو خەرجیانە تاوەکو بەرتیلەکە سوود و قازانجێکی باشی بۆ بەرتیلدەر دەستەبەر نەکردبێت.

یاسای ئەمریکی تا ڕادەیەکی کەم ئەم دوو ڕووەی نێوان بەرتیلدەر و بەرتیل وەرگر لە یەکتر جیا دەکاتەوە لە سزا وەسف کراوەکانی نێو یاساکەی. سزای تاوانەکەی هەردوو لا، واتە بەرتیلدەر و وەرگر بەقەد یەکە، کەواتە هەردووک بەرتیلدەر و وەرگر غەرامە دەکرێن تا سێ جار بەقەد بەهای بەرتیلەکە یاخود ١٥ ساڵ حوکم دەدرێن و بۆ بەندیخانە یانیش هەردوو سزای بەسەردا دەسەپێت هەم غەرامە و هەمیش گرتن بۆ ماوەی ١٥ ساڵ، ئەمەش یاساکەیە "a" 18 USC S 201. ئەمە گونجاوە بۆ بەرپرسان کە بەرتیل وەردەگرن جگە لەوەی جارانی سێ دەکرێت و ڕەنگە پێوەرێکی خراپی مەترسی لێکۆڵینەوە و سزادان هەبێت. ئەگەری ڕاستەقینەی گرتن نزیکەی کەمترە لە سێ یەک. بەڵام، یاساکە، حاڵەتەکانی مامەڵەی گەندەڵی لە یەکتر جیا دەکاتەوە بەهۆی ڕێگە دان بەسەرۆک بۆ بەتاڵ کردنەوەی هەر گرێبەستێک یان هەر سوودێکی تر گەر تۆمەتێک خرابێتە پاڵ بەپێی یاسای بەڕێوەبردنی بەرتیلدان و گەندەڵی و ململانێی بەرژەوەندییەکان. ویلایەتە یەکگرتووەکان، وێڕای هەر سزایەک، دەتوانێت بڕی پارەی سەرفکراو یا شتی گوێزراوە یاخود شتێک لە بری ئەودا پێشکەش کرابێت یاخود بەهای تەواوی شتەکە بگێڕێتەوە. ئەم مافی گێڕانەوەیە فەراهەم کراوە بۆ نەهێشتنی زەرەر کەوتن بەحکومەت. ئەم یاسایەش یاسایەکی بێ هێزە بۆ قەدەغەکردنی گەندەڵی و بەرتیل چونکە گێڕانەوە تێکەڵی ئەو فاکتەرە نەکراوە کە ڕەنگدانەوەی لە سەر ئەگەری لێپێچینەوە هەبێت.

گەر سزای چاوەڕێکراو بۆ بەرتیلدەر و بەرتیل وەرگر شان بەشانی سوود و قازانجەکانی گەندەڵی و بەرتیلدان زیاد نەکات ئەوا حکومەت ڕەنگە بکەوێتە داوێکەوە کە تیایدا ئاستە بەرزەکانی گەندەڵی دەبێتە هۆی زیاتر بەرزبوونەوەی ئاستە بەرزەکانی گەندەڵی و دواجار سەری حکومەت دەخوات. ڕێکەوتنی بچووک بچووکی گەندەڵی هەر وجوودی هەیە لێرەو لەوێ بەڵام بەهەنگاوی بچووک بچووکی نێو یاسادا ناگیرێت و ئاشکرا ناکرێت. ڕێکەوتنی گەورەی گەندەڵی ڕوودەدات کاتێ تۆڕی قازانجەکانی گەندەڵی زیاد دەکات بەقەد زۆری ڕووداوەکانی گەندەڵی. بۆ نموونە، ڕەنگە ئەمە ڕوویدات گەر بەرپرسانی سەپاندنی یاسا ڕێکەوتنی بچووکی گەندەڵی ئاشکرا بکەن کاتێ ڕووداوی گەندەڵیەکە بەرزە، لە هەمان کاتیشدا گەر ئەو



سزایانەی کە بەسەر تاوانباردا دەسەپێنرێت جێبەجێ نەکرێن لەمەڕ بەرپرسیارێتی لە تاوانەکەیان. دەکرێت حاڵەتی ڕێکەوتنی گەورەی گەندەڵی کەم بکرێتەوە بەهۆی تەواو جێبەجێ کردنی ستراتیژیەکانی سەپاندنی یاسا و گۆڕان لە گواستنەوەی مەرجەکاندا . ستراتیژیەکانی سزای چاوەڕێ کراو بۆ دەسکەوتی گەندەڵی دەتوانێت کۆمەڵگا لە چاڵێکی قووڵی گەندەڵیدا دەربهێنێت. بەڵام ئەنجامدانی ئەم کارە ڕەنگە پێویستی بەژمارەیەکی زۆری سەرچاوەکانی سەپاندنی یاسا بێت بۆ سیستەمێک تا بەرەنگاری گەندەڵی ببێتەوە. هەوڵە خۆشەکە لێرەدایە کە زۆربوونی سەرچاوەکانی سەپاندنی یاسا پێویست ناکات درێژخایەن بن واتە بۆ مایەوەیەکی درێژ بێت. پێویستە بەشی ئەوە بکات کە بتوانێت سیستەمەکەی پێ بەڕێوە بچێت لە دژی گەندەڵی. فیکرەی ئەمەش بۆ گۆڕانی پێشبینییەکانە. هەڵمەتێکی چڕوپڕی پاکردنەوەی گەندەڵی پێشبینی ئەوانی تر دەگۆڕێت و دەبێتە زەنگێک بۆیان کە لە ژێرەوە سەرگەرمی مامەڵەی گەندەڵین. هەرکاتێک ئاستی گەندەڵی ڕوو لە کەم بوون بکات، ئەوا دەکرێت سەرچاوەکانی سەپاندن کەم بکرێنەوە ئەمەش بەیارمەتی ئەوانەی کە کار دەکەن دەبێ زۆر بەڕاستگۆیی ڕاپۆرت لە سەر کەسی گەندەڵ بەرز بکەنەوە، دواتر دەستبەجێ بەرپرسیانی سەپاندنی یاساش لە ڕاپۆرتەکە بکۆڵنەوە و لێپێچینەوە بکەن.

هەڵمەتێکی کاریگەر بۆ قەدەغە کردن مەحاڵە تا پۆلیس بەڵگەی تەواوی دەست نەکەوێت، ئەمەش کارێکی زەحمەتە چونکە زۆرجار ئەوانەی گەندەڵی دەکەن تەنها ئەو کەسانەن کە ئەزموونێکی زۆر چاکیان لەم بوارەوە هەیە و ئاشکرا نابن. ئەگەری لێپێچینەوەش ئەو کاتە کارێکە بۆ زانینی ئەوەی ئایا یەکێ لەو کەسانە ڕێی لێ بگۆڕێت و ڕاپۆرت بدات بەپۆلیس. لەم هەلومەرجەدا ، پۆلیس دەبێ بەڵێنی سزای سووک بدات یاخود تەنانەت گەر ئەو کەسەی کە خەبەر لەوانی تر دەدات پاداشتێک وەرگرێت. پێش هەموو شتێ، وادانێ کە سوودەکە یاساییە و بەئازادی دەست دەکەوێت لە جیهانێکی ڕاستگۆدا بۆ ئەوانەی کە ئێستا بەرتیل دەدەن. ئنجا لە بەرئەوەی بەرتیلدەران سوودمەند دەبن بۆیە باوەڕ بەوە دەکەن کە ئەوان قوربانی چەواشەکار دەبن و دواتر بیر لەوە دەکەنەوە کە بۆ ئەوان باشترە گەر ئەو سوودە

بەڕێگەیەکی یاسایی وەرگرن، ئیتر دەسبەجێ پۆلیس لەوانی تر ئاگادار دەکەنەوە. ئەم جۆرە بەرتیلدەرانە هاوپەیمانێکی بەهێزن لە هەوڵەکانی دژە گەندەڵی و ئەوانەی کە کار دەکەن بۆ بنبڕکردنی بەرتیلدان. گەر لە لایەن حکومەتەوە بەڵێنی ئەوەیان پێ بدرێت کە گەر خەبەر لە هەر یەکێکی گەندەڵ بدەن ئەوا پاداشتێکی چاک وەردەگرن ئەوا زۆر بەئاسانی هان دەدرێن کە ڕاپۆرت و زانیاری لە سەر گەندەڵکاران بدەن بەپۆلیس و هەروەها دەبێتە پەندێکیش بۆ سوودمەندانی بەرنامە حکومییەکان تاوەکو داوای ئەو جۆرە خزمەتگوزارییانە بکەنەوە کە بەدەر بن لە بەرتیلدان و گەندەڵی.

دواتر باسی ئەوە بکەین گەر سوودێکی کەم بەڵام یاسایی بەهۆی گەندەڵییەوە بگوازرێتەوە بۆ چەند کەسێک، چونکە گەر بەم شێوەیە نەبێت ئەوا سوودەکەیان پێ ناگات چونکە شایەنی ئەوە نین. ئەوا ئەو کاتە نە بەرتیلدەر و نە بەرتیل وەرگریش بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە خەبەر لە مامەڵەی گەندەڵی دەدەن. بەڵام ئەوانەی کە بەدەر نراون لە پرۆسەکە سکاڵایان هەیە. بۆ نموونە، ئەو بێئومێدانەی تەقدیمی گرێبەستێکیان کردووە دەتوانن کارئاسانی بۆ دانانی سنوورێک بۆ گەندەڵی بکەن. بەڵام دەبێ پاداشتیان پێ بدرێت کاتێ کە بەڵگەی ڕاست دەدەن بەدەستەوە، چونکە کە پاداشتیان پێ بدرێت ئەوا دەیکەن چونکە ئەوان لە گرێبەستەکەیان نەبردۆتەوە و بەرتیلیشیان نەداوە، کەواتە خەبەر لەوانە دەدات کە مافی ئەوی خواردووە لە ڕێگەی بەرتیلدانەوە. ئەم کارەش ئەنجام دەدرێت بەڕێگەدان بەکۆمپانیا زەبەلاحەکان سکاڵا پێشکەش بکەن لە کاتی زەرەر کردنیان لە سەر حیسابی گەندەڵی. ڕووپێوێک لە سەر یاساکانی دژە بەرتیلدان لە سیانزە وڵاتی پێشکەوتوودا ئەوەی دەرخستووە کە پێشکەش کردنی ئەم جۆرە سکاڵایانە ڕێگەیان پێدراوە لە نێو زۆربەی یاساکاندا.

ئەو بەرتیلەی بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییە نایاساییەکاندا دەدرێت زەحمەتترین جۆری بەرتیل دانە بۆ کۆنترۆڵکردن. ئەو بەرتیلدەرانەی زۆرجار دەستیان خستۆتە نێو چالاکی نایاسایی تر و ئەوانەشی کە لە هەوڵەکانی گەندەڵیدا سەرناکەون زۆر بەگرانی دەردەکەون و زۆر بەزەحمەت ئەوە ئاشکرا دەکەن کە ئەوان سوودی نایاساییان بەدەست هێنا بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بێ هێزی بەرتیلدەران دەکرێ بەکاربهێنرێت لە ئاشکرا کردنی گەندەڵی. ڕەنگە بەرتیلدەرەکان مامەڵەیەکی



سادە و ئاسانکاریان پەسەند بێت و ڕێزیش لەوە دەگرن کە پێیان دەوترێت ئێوە سەرپێچی یاسای ماددە سرکەرەکانتان کردووە لە بەرامبەر دابینکردنی بەڵگە لە سەر گەندەڵی لە دادگاییکردندا.

لە جیهانی بازرگانی و کارکردندا، زۆربەی حاڵەتەکانی بەرتیلدان لە سەر فەرمانبەر و بریکارەکان دەرکەوتووە نەک لە سەرەوەی ئەواندا. گەر پارەدان وەک بەرتیل یارمەتی کۆمپانیایەک بدات پرۆژەیەک وەرگرێت، ئەوا ڕەنگە بەڕێوەبەر و خاوەن کۆمپانیاکان بەهیوای کارئاسانی بن بۆ شەریکە بەرتیلدەرەکانیان لە کاتێکدا بێ ئاگان لە وردەکارییەکان. گەر گەندەڵی وەک کارێکی تاوانکردن ئەنجام بدرێت لە لایەن فەرمانبەر و بریکارەکانیان ئەوا بەڕێوەبەرە گەورەکان نابن بەهاوکاری سیستەمی کاریگەری چاودێری کردن ناکەن. جێنیفەر ئارلین شرۆڤەی ئەم کێشەیە دەکات وەک حاڵەتێکی گشتی تاوانە گشتییەکان و دەگات بەو ئەنجامەی کە ژمارەیەک حوکمی بەدیل زۆر گرینگن بۆ بەدەر خستنی یاسای ویلایەتە یەکگرتووەکان کە بەرپرسیارێتیەکی تەواو بەسەر کۆمپانیاکاندا دەسەپێنێت. یەکێک لە ئەگەرەکان حوکمێکی زۆر کەمتەرخەم و نابەجێیە کە لە ژێر چاودێری ئەو یاسایەدا کۆمپانیاکان تەنها بەرپرسیارن گەر بەرپرسیارێتییەکانی سەپاندنی ناوەوەی خۆیان پشت گوێ خستبێت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم جۆرە یاسایانە کردەیی بن و کار بکەن دادگاکان دەبێ بتوانن هەڵسوکەوتی ناوەوەی کۆمپانیا هەڵبسەنگێنن کە ئەمەش کارێکی زەحمەتە. گەر هەر چارەسەرێک هەبێت دەبێ زۆر دەقیق و ورد بێت لە دەستنیشانکردن و چاودێری کردنی هەڵسوکەوتەکانی ناوەوە.

شان بەشانی ئەم یاسایانە، دەزگای ئەمریکا بۆ کارکردن لە سەر گەندەڵی دەرەوە FCPA قەدەغەکانی خۆی دەخاتە پەراوێزەوە دژی بەرتیلدان لەگەڵ حیسابکردنی ئەو دابینکردنانەی کە بەسەر کۆمپانیاکاندا جێبەجێ دەبێت لە چوارچێوەی یاساکانی ئاسایش و کۆمیسیۆنی ئاڵوێرکردندا. ئەم کۆمپانیایانە دەبێ سیستەمی ژمێریاری دابنێن کە زۆر بەوردی ڕەنگدانەوەی هەبێت لە سەر مامەڵەی کاڵاکان، هەروەها دەبێت سیستەمێکی کاریگەریان هەبێت بۆ کۆنترۆڵی حیساباتی ناوەوەی کۆمپانیا. کۆمپانیاکان و بەڕێوەبەرەکانیان موعەرەزن بۆ هەردوو سزای مەدەنی و

تاوانکردن لە بەرامبەر سەرپێچی کردنی دابینکردنی ئەو حیساباتانە. هیچ هەشیاریەکی ڕەسمی بەرگری نییە بۆ FCPA. بەڵام لە ڕووی کردەییەوە، ئەو کۆمپانیایانەی کە سیستەمێک دادەنێن بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوەوە لە ڕووی ئەزموونەوە وەک چارەسەری زۆر سادە دەردەکەوێت. ڕێبەرە فیدراڵییەکانی حوکمدان پاداشت دەداتە هەر کۆمپانیایەک کە هەوڵ دەدات لێپێچینەوە لەگەڵ ئەوانە بکات کە سەرپێچی یاسا دەکەن و سزایان بدات. هەر بۆیە یاسای ئەمریکی هەوڵ دەدات پاڵنەری بەڕێوەبردن بگۆڕێت بۆ ئەوەی خۆی هاندەری خۆی بێت لە ئاشکرا کردنی ئەو فەرمانبەر و بریکارانەی کە سوودیان بەڕێگەی گەندەڵییەوە دەست دەکەوێت.

سیستەمێکی بەدیل پاداشت دەدات بەوانەی کە پۆخڵەوات ئاشکرا دەکەن لە نێو کۆمپانیاکان و ئاژانسە گشتییەکان کە بەبەڵگەی دروستەوە بەدکاران دەستنیشان دەکەن. ڕاپۆرت نووسین لە سەر ئەو کەسانەی دزی دەکەن و لەگەڵ تۆشدا کاردەکەن کارێکی ترسناکە. گەر گەندەڵی سیستەماتیک بێت، گەر یەکێک لە گەندەڵکاران ببێتە مەترسی بەسەر ئەوانی ترەوە ئەوا دوور نییە هاوەڵانی خۆی هێرش بکەنە سەر ژیانی. یەکێک لە توێژینەوەکان لە سەر گەندەڵی لە وڵاتی چین دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەمە کێشەیەکی جدییە. ڕەنگە ئەوانەی کە خەبەر لەوانی تر دەدەن دواجار خۆشیان بەتۆمەتی گەندەڵی بکەونە چاڵەکەوە. بۆیە حکومەت دەبێ زۆر وردبینانە کار بکات و ئەو یاسایانە هەموار بکات کە تەنها ئەوانەی بەڵگەی دروستیان هەیە لە سەر یەکێکی گەندەڵ پاداشتیان پێ دەدرێت. یاسای ئاشکرا کردنی هەڵەکان پاداشت بەوانە دەبەخشێت کە ڕاپۆرت و زانیاری دەنووسێت لە سەر پۆخڵەواتەکانی نێو گرێبەستەکانی حکومەت، هەروەها ئاشکراکەری تایبەتی لە کەرتی تایبەت دەپارێزرێت لەوەی یەکێک تۆڵەی خۆی لەو ئاشکراکەرە بکاتەوە. هەروەها ئاشکراکەرانی نێو ئاژانسەکانی حکومەت دەپارێزێت لە تۆڵە سەندنەوە.

یاسای ئاشکراکردنی هەڵەکان بەشێک لە کۆی گشتی سزاکانی تاوانباران دەخاتە سەر ئەو کەسەی خەبەر لە هاوەڵانی نێو کۆمپانیاکە دەدات و هاوکات خۆیشی دەستی لەگەڵیانە و هەروەها بەشێکیش لەو زەرەرەی دژی کۆمپانیاکە کەوتۆتەوە گوایە کارێکی خراپی کردووە کە ئەم کارە خراپەش حکومەتی فیدراڵی



زامدار کردووە. پاداشت بۆ کەسی ناوەوە و دەرەوەی کۆمپانیاکەیە، بەڵام نەک بۆ فەرمانبەرانی حکومەت کە ڕاستەوخۆ بەرپرسیارن لە لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوەی سەرپێچییەکانی لە سەر گرێبەست کراون. گەر ئەو کەسەی خەبەر دەدات و سەرکەوتووش بێت لە بەڵگەکەی بەڵام خۆیشی دەستی لەگەڵدا بێت، ئەوا لە سەدا ٢٥ تا ٣٠ ی سزاکەی لە سەر لادەچێت. هەروەها گەر وەزارەتی داد دەست بخاتە نێو ئەو کارەوە ئەوا بەلایەنی کەم سەدا ١٥ کەم دەبێتەوە چونکە حکومەت خۆی زۆربەی زەرەرە یاساییەکان لە ئەستۆ دەگرێت. تاوانباری تایبەتی سەرنەکەوتوو دەبێ زەرەری یاسایی خۆی لە ئەستۆ بگرێت بەڵام پەیوەندی نییە بەوانەی کۆمپانیا تاوەکو دادگا ئەوە ئاشکرا نەکات کە سکاڵاکە فرۆفێڵ و درۆیە یان نا.

ژمارەیەک نارەزایی بۆ ئەم یاسایەی سەرەوە بەرزکرانەوە، بەڵام، یاساکە وا دەردەکەوێت خزمەتی مەبەستێکی لەجێ بکات و هەوڵەکانی چاودێریکردنی ناوەوە تەواو بەجێ بگەیەنێت. بەتایبەتی، ئەو فیکرەیەی کە یارمەتی ئاشکرادەران دەدات هەوڵەکانی کۆنترۆڵکردنی ناوەوە دەخاتە پەراوێزەوە. پسپۆران تانوپۆی ئەوە دەکەن کە ترسی ئاشکرا بوون بۆ سکاڵاکار وەک دەرەنجامێکی دەرەوەی ئاشکرا کردن ڕەنگە پاڵنەرێکی گرینگ بێت بۆ هەندێ گەندەڵی بۆ بەکار بردنی هەندێ سیاسەت و ڕێ و شوێنی باوەڕپێکراو بۆ ئەوەی پۆخڵەواتەکانی ناوەوەی ئاشکرا نەبێت. کێشەی سەرەکی لە وڵاتان لە پرۆسەی دامەزراندنی حوکمی یاسا ئەوە دەبێت کە دەبێ چ کارێک نایاسایی بێت و موعەرەز بێت بۆ سزادان. پاداشتدان یاخود پاراستنی ئاشکراکەران کارێکی بێ مانا دەبێت گەر بەتەواوی ئەوە ڕوون نەکرێتەوە کە دەبێ ئەوان چی ئاشکرا بکەن و کام کارە بەکارێکی نایاسایی دادەنرێت.

هەندێ جار بەرپرسە گشتییەکان دەڵێن کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەزۆری تووشی بەرتیلیان دەکەن. ئەمە پێدەچێت هەندێ دوور بێت لە ڕاستییەوە چونکە پارەدان وەک بەرتیل کولفەیەکە لە سەر ئەو کۆمپانیایانەی کە بەرتیل دەدەن. لەگەڵ ئەوەشدا، تا ڕادەیەک ئەم قسەیەی بەرپرسە گشتییەکان قسەیەکی ماقووڵە، بەرپرس و فەرمانبەری حکومی دێنە پێشەوە بەبەڵگەوە دژی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ کاری گەندەڵی بکەن و چاویان لە پاراستنی خۆشیانە لە ژێر یاسای پاراستنی ئاشکرا

کەرەکاندا. کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەشێوەیەکی چڕ و پڕ بەرگری لە خۆیان دەکەن چونکە دەتوانن زۆر بەسادەیی بڵێن " بەرپرسەکە یاخود فەرمانبەرەکە خۆی داوای بەرتیلی کرد ئێمە دەستپێشخەر نەبووین." ئیمتیازاتەکانی یاسای ئەمریکی ڕەنگە بەسوود بێت لێرە. لە یاسای ڕاگەیاندنی هەڵەوە، دادگا دەتوانێت پاداشتی ئاشکراکەر کەم بکاتەوە گەر خۆیشی دەستی لە گەندەڵییەکەدا هەبێت، بەڵام لە حاڵەتێک دادگا ناتوانێت ئەوە بکات گەر ئاشکراکەرەکە تەنها نیازی بووبێت یا پلانی بۆ دانابێت بەڵام بەئەنجامی نەگەیاندبێت و دواتر خەبەری دابێت. بەڵام نابێ پاداشتەکە نەدرێت و بسڕێتەوە تاوەکو ئاشکراکەرەکە بەتاوانێک دەستگیر نەکرێت. داواکاری گشتی لەگەڵ دەسەڵاتدا بۆ بەخشینی حەصانەی تاوان دەتوانن جۆرێک لە پێشبڕکێ دروست کەن بەوەی کامەیان یەکەم جار خەبەر بدات و مامەڵەیەکی گەندەڵی ئاشکرا بکات ئەوا پاداشت دەکرێت و لە کاتێکدا ئەوانی دوای ئەو سزا دەدرێن گەر دەستیان لە گەندڵییەکەدا هەبێت.

## چاکسازی فەراهەمکردن Procurement Reform

(واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد)

کارەساتەکانی گەندەڵی زۆرجار دزە دەکاتە نێو فەراهەمکردن (واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد)ی کاڵا و خزمەتگوزاریەکانی حکومەت. بەرتیلدان هەر تەنها یارمەتی ئەوە نادات کە کێ گرێبەستێک بەدەست دێنێت، بەڵکو قەبارە و تایبەتییەکانی کڕین لە حکومەتدا تێک و پێک دەدات. چاکسازییەکانی دژە گەندەڵی نابێ تەنها هەر جەخت بکەنەوە لە سەر کەمکردنەوەی کاری خراپ لە لایەن بەرپرسانەوە بەڵکو دەبێ کار لە سەر چاککردنی بڕیارە نەشیاوەکانی حکومەت بکەن لە کاتی کڕیندا.

چاکسازی فەراهەمکردن جەخت لە سەر ئاڵوێرکردنی نێوان نەهێشتنی گەندەڵی و ئەو ئاسانکارییە دەکاتەوە کە بدرێت بەبەرپرس و فەرمانبەر بۆ ئەوەی بەپشت بەستن بەزانیاری خۆیان بڕیار بدەن. ڕێز گرتن و دەسەڵاتی باڵا پاڵنەری گەندەڵی زۆر دەکات، بەڵام ڕەخنەگرانی شرۆڤە کردنی فەراهەمکردن ئاماژە بەتوندییەکی بێ



سنوور دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت سکاڵا کارەکانیش داوای وازهێنانی یەکجارەکی خۆیان ناکەن. گەلێ لە کارەساتەکان لەو بارودۆخانەدا ڕوودەدەن کە هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نییە یانیش دەستەی تێندەرەکان داپۆشراوە بۆ گەندەڵی و سەرکردە سیاسییەکان بۆ خۆیانیان قۆرخ کردووە. بەشێوەیەکی تایبەتی گەر دادگای بێ لایەن یاساکان بەهێز بکات و بخاتە گەڕ، نهێنییەکان پرۆسەکە دەپارێزن دژی کاریگەرییەکی ئاست بەرزی نابەجێ.

دواجار چۆن هاوسەنگییەکە ئەنجام بدرێت؟ لەم ساڵانەی دواییدا، ئەمریکا زۆر چالاک بووە لە چاکسازی فەراهەمکردن. هەرچەندە چاکسازییەکان گفتوگۆ هەڵگرن و ئێستاش لە ژێر دەستدایە، بەڵام هەر هەندێ دەرس و پەندیان تیایە بۆ وڵاتانی ئینتیقالی و پێشکەوتوو کە دووچاری هەمان ئەو کێشانەی نێو ئەمریکا دەبنەوە.

## چاکسازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

دەتوانین کێشەی فەراهەمکردن (واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد) دابەش کەین بەسەر چوار جۆر: ئەو کڕینانەی کە پێویستییان بەگەشەپێدان و توێژینەوەی تایبەت هەیە، وەک فڕۆکەیەکی سەربازی تازە دروستکراو و نوێ، ئەو کڕینانەی کە ئاڵۆزن یا پرۆژەکانی بۆ مەبەستی تایبەت وەک سەددە و شوێنی بەندەر کە وێڕای تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو پێوستییان بەبەهرەی ڕێکخراوەیی و ئیداری هەیە، کڕینی ئەو بەرهەمە ستانداردانەی کە لە بازاڕی تایبەتیدا دەفرۆشرێت وەک سەیارە و کەرەستەی پزیشکی و جۆری ئەو بەرهەمەی بەتایبەتی دەفرۆشرێت وەک سیستەمی کۆمپیوتەری تایبەت و سەیارەی پۆلیسی.

سیستەمی فەراهەمکردنی تەقلیدی پێشنیاری پرۆسەیەکی جیاواز دەکات بۆ سێ جۆری یەکەمی کڕین. یەکەم، کە بایەخی سەرەکی وەزارەتی بەرگری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، خۆی لەو پرسیارە زەحمەتە دەدات چۆن گرێبەستێک بنووسرێت بۆ بەرهەمێک کە هێشتا بەرهەم نەهێنراوەو ڕەنگە پێویستی بەتەواوی تەکنەلۆژیا هەبێت. ئەم جۆرەیان لە لایەکدا جێ دەهێڵم چونکە زۆر گرینگ نییە لە

ولاتە پێشکەوتووەکان. بەڵام جۆری دووەم، پرۆسەیەکی مۆرکراوی مەزاتکردن بەپێی بنەماکانی پێشبڕکێی مەزاتی نێودەوڵەتی پێوەرێکی پەسەند کراوی یەکسانی و توانستی ئابووریبە. ئەم جۆرەیان لە لایەن بانقی جیهانییەوە داوا کراوە بەپێی ژێرخانی قەرزەکانی و هەروەها کاریگەری هەبووە لەسەر گەشە سەندنی سیستەمی فەراهەمکردن (واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد) لە تەواوی جیهاندا. پرۆسەکە زۆر گونجاوە بۆ پرۆژەیەکی وەک سەددە دروستکردن کە پاڵنەرێکی سەرمایەیە و تەکنەلۆژیاش تیایدا بەکاردێت.

ناوەندی فەراهەمکردن لە جۆری سێیەمدا ڕاستەوخۆیە، کڕینی کاڵا بەکەمترین نرخ، هەروەها ڕەچاوکردنی داشکان بۆ کڕیارەکان. جۆری چوارەم، بەرهەمی گومرگکراو، بەتایبەتی فرۆشراو پێویستی بەهەوڵی نوێ هەیە. کێشەی فەراهەمکردن ئاسانترە لە جۆری یەکەمی کڕین چونکە گەشەپێدان و توێژینەوەی پێویستە، بەڵام نە مەزاتی مۆرکراو نە کڕین لە سەر ڕەفەکانی بازاڕدا شتێکی شیاوە. پرۆسەی فەراهەمکردن دەبێ چاوێکی پێدا بخشێنرێتەوە کاتێ حکومەت کاڵاو خزمەتگوزارییەکان دەکڕێت.

ئەو ناکۆکییە بەرچاوەی لە نێوان تەکنیکیەکانی فەراهەمکردن (واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد) و واقیعی کڕینی بەئاشکرا هەوڵێکی سەرەکی بوو لە هەوڵەکانی ئیدارەی کلینتۆن بۆ چاکسازی سیستەمی فیدڕاڵ. هەوڵەکەش لە لایەن ستیڤن کێلمان ( کە پرۆفیسۆرە لە قوتابخانەی کێنێدی لە هارڤارد) ورووژێنرا کە وەک بەڕێوەبەر کاری دەکرد لە نووسینگەی سیاسەتی فەراهەمکردن ی فیدراڵی ئیدارەی کلینتۆن. ئامادەکارییەکانی کێلمان بۆ کارکردن توێژینەوە قووڵەکەی بوو لە سەر بەدەستهێنانی کۆمپیوتەر لە حکومەتی فیدڕاڵدا. کۆمپیوتەر لە جۆری چوارەمی پرۆسەی کڕیندایە. لە بازاڕدا زۆر زۆرن، بەڵام تەکنەلۆژیا بەخێرایی لە گۆڕاندایە، هەروەها حکومەتیش هەمیشە پێداویستی تایبەتی هەیە کە وەک پێداویستی بازرگان و کارە تایبەتییەکان نین. نە فرۆشتن لە سەر ڕەفەکان و نە سیستەمێکی مەزاتی مۆرکراو بەباشی کار دەکەن. توێژینەوەکەی کێلمان زۆر گرینگە بۆ کارەکانی



حکومەت، کێلمان تانوپۆی ئەوە دەکات کە ئەو یاسایانەی لە ئارادان بەلای بیرۆکراتەکان گاڵتەجارییە گوایە تەمبەڵ و گەندەڵ دەبن گەر دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت. دواجار پرۆسەکانی فەراهەمکردن سیستەمێکی لێکچووی مەزاتی مۆرکراو بەکار دێن. کێلمان مشتومڕی ئەوە دەکات کە تاکە سەرچاوەی دانووسان لە سەر گرێبەست باشتر دەبێت و هەروەها جۆرەکانی چاکسازیش پێویستن بۆ هاندانی دەسەڵات و چاککردنی پاڵنەرەکان بۆ ئەوەی کاری باش بکەن. شتە بنەڕەتییەکان بۆ ئەم سیستەمە بەرپرسیارێتییەکی ڕەق بوو لە سەر وەڵامە نووسراوەکانی بەڵێندەران بۆ تایبەتمەندێتی. لە حاڵەتێکی ئاڵۆزی وەک فەراهەمکردن کۆمپیوتەر، کێلمان گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم سیستەمە ژێرکەوت لە چاودێری کردنی تۆمارەکانی مەزات کاران لە سەر گرێبەستەکانی پێشووی حکومەت و هەروەها هیچ پاڵنەرێکی نەبەخشی بەکۆمپانیا زەبەلاحەکان بۆ دەستنیشان کردنی کێشەکان لە تایبەتمەندێتی حکومەتدا. کۆمپانیا زەبەلاحەکانی کۆمپیوتەر ڕەنگە ئەزموونیان هەبێت لە چەسپکردنی ئەو سیستەمە هاوشێوانەی کە حکومەت دەیەوێت. دەبێ ئەوانە پاداشت وەرگرن چونکە حکومەت دوور دەخەنەوە لە هەڵە. وێڕای ئەمەش، گەر پاشەکەوتکەران بەوە بزانن کە کاری بەهێز و باش لە سەر گرێبەستێک پارمەتییان دەدات لە سەر بەدەستهێنانی پڕۆژەی تریش، ئەوا ئەو کاتە داهێنان و وەگەڕخستن دەکەن کە پەیوەستن بەکارەکەی حکومەتەوە.

وەک ئەندامێکی ئیدارەی کلینتۆن، کێلمان هەوڵی دا بۆچوونەکانی بخاتە نێو چوارچێوەی کارەوە واتە بەعەمەلی ئەنجامیان بدات. سیستەمێکی پێک هێنا بۆ ئەو بەڵێندەرانەی کە شیاون و لێهاتوون بخاتە نێو بازنەیەکەوە دواجار باشترین فرۆشیار بۆ پرۆژە تایبەتییەکان هەڵدەبژێردرێت. یەکێک لە تاقیکردنەوەکانی کێلمان وەک سەرۆکی OFPP چەند نیزامێکی نوێی کڕینی کۆمپیوتەر بوو لە لایەن وەزارەتی گواستنەوەدا. شەست تیم پێشکەشیان کرد، دواجار بیست تیم دەستنیشان کران و چوونە نێو پێشبڕکێوە بۆ فەرمانی دیاریکراو بۆ ماوەی زیاتر لە ٤ تا ٧ساڵ. فەرمانەکانیش لە گەڵێ ئاژانسی فیدڕالیەوە هاتوون نەک هەر تەنیا لە وەزارەتی گواستنەوەدا. هەروەها هاوکاری ئەزموونەکانی تری کرد کە کاریان لە سەر

گرێبەست کردبوو، هەروەها ژمارەیەکیشیان لە خزمەتگوزاریدا بەکاردەهێنران لە بڕینەوەی چیمەن بۆ ئامادەکردنی شوێنەکانی بەرهەمهێنانی چەکی ناووکی.

کێلمان مشتومڕی ئەوە دەکات کە ئەفسەرانی فەراهەمکردن دەبێ فەرمانی زۆر سنوورداریان پێ بوترێت لەبارەی ئامانجەکانی فەراهەمکردن و هەروەها ببن بەبەرپرسیار لە توانای بەڵێندەران لە جێبەجێ کردنی کارەکانیان. بەڵام دەبێ ئاسانکاری چاکیان بۆ بکرێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان. ئاژانسەکان ئێستاش داوای ئەوەیان لێ بکرێت بۆ بردنە سەری بڕیارەکانیان لە نووسین و لیژنەی فرە ئەندامی هەڵسەنگاندن ئێستا دەبێ بەکار بهێنرێن لە بڕیاردانی فەراهەمکردندا. گرێبەستەکان هەڵدەسەنگێنرێن لە ڕووی ئەنجامی کارەکانیان نەک قازانجەکانیان. ئاژانسەکان دەبێ بەوردی ئامانجەکان پێناس بکەن و بەلێندەرەکانیش پاداشت بکەن لە سەر بنچینەی ئەنجامدانی کارەکانیان. ئا لەو کاتەدا حکومەت باشترین بەڵێندەر لە ڕووی کارەوە بۆ دەرفەتەکانی داهاتووی بەخشینی گرێبەست دیاری دەکات.

بەکارهێنانی ئەزموونی کاری ڕابردوو وەک هۆکارێک بۆ بەخشینی گرێبەستێکی تر زۆر زەحمەتە کاری لە سەر بکرێت و دووبارە جێبەجێ بکرێتەوە چونکە هیچ تەکنیکێکی گشتی پەسەند کراو نییە بۆ هەڵسەنگاندنی کارکردن. نووسینگەی کێلمان کار دەکات بۆ دانانی سیستەمێک بۆ تۆمارکردنی سیفەتەکانی کار کردن و کات و کۆنترۆڵی نرخ و پەیوەندییە بازرگانییەکان و ڕازی کردنی موشتەری، بەڵام پرۆسەکە گفتوگۆیەکی زۆر هەڵدەگرێت، هەروەها هەوڵە زووەکانی ئاژانسەکان لە دادگا فیدڕالیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسەرکەوتوویی ڕووبەڕوویان بوونەتەوە. ئۆپۆزیسیۆن بۆ تەقدیری ئەزموون خاڵی هەرە سەرەکی کۆمەڵگای بازرگانییە. گەلێ لە بازرگانەکان کۆمپانیای تازە پێگەیشتوون کە هیچ تۆمارێکیان نییە، هەروەها گەر پەرەبسێنن، ڕەنگە تواناکانیان بەپێی تێپەڕبوونی کات باشتر بێت، ئەوا ئەزموونەکانی ڕابردوویان دەبێتە ڕێبەرێکی خراپ بۆ داهاتوویان. حکومەتی فیدڕاڵ چەند ڕێگایەکی پێشکەش کردووە بۆ دژی ئەو ناڕەزاییانە بەڵام نیگەرانییەکان هەر بەردەوامن.



جێبەجێ کردنی ئەو فیکرەیەی کە کێلمان دەڵێ با ڕێگە بە بەڵێندەران بدەین یارمەتی دڵنیاکردنەوەی تایبەتمەندێتییەکان بدەن کارێکی زەحمەتە. ئەمە بەشێکی گفتوگۆهەڵگرە لە نێو بەشی چاکراوی نیزامی فیدڕاڵی دەستەبەر کردن کە هەموو فەراهەم کردنەکانی حکومەت کە لە ڕێگەی دانووسانەوە بەدەست دەهێنرێن بەڕێوە دەبات. یاسا چاککراوەکان هانی پەیوەندی دەدەن پێش مەزات لە نێوان فرۆسیار و ئاژانسەکان بۆ ئەو فەراهەمکردنانەی کە لە ڕێگەی دانووسانەوە بەدەست دێن، ئەمەش پیادەیەکە کە پێشتر ڕێگەی پێ نەدرابوو. پێودانگەکانیش لە هێزدا دەمێننەوە بۆ کێبڕکێکردنی فەراهەمکردن. گفتوگۆ مشتومالّی "ئارەزوو" دەکات لە کردەدا. ڕەخنەگران لەوە نیگەرانن کە پێداچوونەوەکانی یاسا هانی خزم خزمانێ و واستە و واستەکاری و جۆرەکانی تری گەندەڵی دەدات، بەتایبەتی لە بەرئەوەی چەند فۆرمێکی دیاریکراوی ناڕەزایی لە سەر مەزات سڕانەوە پێودانگیان بۆ دانرا.

هەروەکو ئەو گفتوگۆیەی لە سەر پەیوەندییەکانی پێش مەزات ئەوە دەخاتە ڕوو، کێلمان بەتەواوی ڕووبەڕووی گەندەڵی نەبۆتەوە لە پێشنیارەکانیدا. کێلمان مامەڵەی لەگەڵ کاری خراپ کردووە وەک کێشەیەک بۆ یاسای تاوان نەوەک بۆ یاساکانی فەراهەمکردن (واتە: پرۆسەی کڕینی شت لە لایەن حکومەتەوە وەک فڕۆکە، کۆمپیوتەر هتد). مشتومڕی ئەوە دەکات کە سیستەمی هەنووکەیی تۆماری ئەمریکی بۆ فەراهەمکردن نزیکەی بێ کەڵکە دژی تاوانباران بەهەر پلەیەکی بەهرەوە بێت. کێلمان بۆچوونەکەی باس لەوە دەکات کە خەڵکێکی بۆگەن هەیە لە نێو خودی کێشەکە، هەندێ خەڵکی خراپ هەیە، هەروەها دەشبێت یاسای تاوان مامەڵەیان لەگەڵدا بکات. سزاکان بۆ گەندەڵی دەبێ زۆ بکرێن و هەروەها دەبێ سەرچاوەی زیاتر بخرێتە بەردەم لێکۆڵینەوەی گشتی. بێ گومان، زۆرکردنی نرخی چاوەڕێکراوی بەرتیلدان و وەرگرتن هێلێکی بەرگریکردنە دژی گەندەڵی، هەروەها کێلمان ڕەنگە زۆر ڕاست بێت لەبارەی بوودەڵەیی داواکارییەکانی پاراستنی تۆمار. بەڵام، ئەوە مانای ئەوە نییە کە باشترین چارەسەر ئەوەیە کە تۆ ستتراتیژیەکانی دژە گەندەڵی لە پیادەی بەدەستهێنانی فەراهەمکردندا بپچڕێنی.

لە بری هەڵوەشانەوەی کۆنترۆڵی کاری خراپ لە پیادەکانی تری دەستەبەر کردنی

فەراهەمکردن تایبەتمەندییەکانی کڕینی حکومەت دەبێ ڕەچاو بکرێت لە مەترسی گەندەڵیدا. ئەمەش دەکرێ ئەنجام بدرێت بەبێ قوربانییەکی زۆر کە کێلمان وای بۆ دەچێت. کاڵا فرۆشراوەکان لە بازاڕی نێودەوڵەتیدا دەبێ نرخەکانیان لە سەریان بنووسرێت بۆ هەموو بەرهەمەکان. بەهەقیقەت، کێلمان خۆیشی تەنها پێشنیاری ئەو گۆڕانە دەکات، باس لەوە دەکات کە ئەمە زۆر نزیکە لە مومارەسەکانی کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان. بۆ نموونە، ئیدارەی خزمەتگوزارییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئێستا لیستێک کۆمپیوتەر و بەرهەمی خزمەتگوزارییە تەکنەلۆژییەکانی هەیە کە دەتوانێت بیانکڕێت بەبێ پێشبڕکێی مەزات. چاکسازییە یاساییەکانی هانی لیژنەی کڕین دەدەن کە لە کاتی کڕیندا بچن تەواوی بازاڕ بگەڕێن و سەیری کاڵا بازرگانییەکان بکەن. دەوڵەت دەتوانێت سەیری نرخەکانی بازاڕی تایبەت بکات کە لە سەر کاڵاکان نووسراون هەروەها تایبەتمەندێتییان دیاری بکات لە ڕووی ستانداردی کاڵای نێو بازاڕ و بۆ دەبەزاندنی نرخی مەزاتکەران. کێلمان پێ داناگرێت لە سەر سوودەکانی دژی گەندەڵی و ئەو کاڵایەی کە بەنرخێکی یاسایی لە نێو بازاڕدا دەفرۆشرێت، هەر ئەو کاڵایانەن هۆکاری هەرزان بوونی بەرهەمە بۆ حکومەت. فیکرەی سەرەکی شوێنی پێشبڕکێی مەزات بەگەندەڵی پڕ بکرێتەوە بەمەرجی دانووسان و گفتوگۆکردن لە سەر بنەمای پێشینەی بازاڕدا. فشارەکانی پێشبڕکێ ئاشنا دەکرێن بەبازاڕی تایبەتی نەک بەپرۆسەی مەزات خۆی.

هەڵسەنگاندنی کارکردن کە کار لە داهاتووی تێڕامانەکان دەکات یەک دەگرنەوە لەگەڵ ئامانجەکانی دژە گەندەڵی. پرسەکانی ئەنجامدانی کاری خراپی پشت ئەستوور بەگەندەڵی و تاوانی نەخشە بۆ داڕێژراو فۆرمێکی فراوانە و بەکاردەهێنرێت لە هەڵسەنگاندنی کاردا. کێلمان جەخت لە سەر ئەو تاوانانە ناکاتەوە کە ئەنجامدراون بەڵکو پێ دادەگرێت لە سەر باشی و خراپی ئەو کارەی کە ئەنجام دەدرێت. ئەمەش دەکرێ ببێتە ناوەندێکی ناڕاستەوخۆی دژە گەندەڵی چونکە بەرپرسە گشتییەکان دوور دەخاتەوە لەو کۆمپانیایانەی کە کارەکانیان بەخراپی ئەنجام دەدەن و ئەوانیش چاوپۆشییان لێ بکەن. بەڵام، پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن



دەبێ پێوەری ئامانج پێکان بن و دەرگا بۆ بەشداربووی نوێ واڵا بکەن. ئەگینا دەتوانن پێگەی بەڵێندەرەکان کۆنکریت بکەن.

نیگەرانییەکان لە بارەی پەیوەندییەکانی پێش ئەنجامدانی مەزات وەها بەئاسانی چارەسەر ناکرێت. پەیوەندییە کراوەکان کە کێلمان وەک ڕێگایەک باسیان دەکات، دەکرێت ببێتە ڕێگایەکیش بۆ بەگەڕخستنی کاری نایاساییش. بێ گومان، گەر گرێبەستەکان گشتی بن، پەیوەندی شەرعی ڕەنگە شتێکی باش بێت بۆ ئەو کۆمپانیایانەی کە هیچ زانیارییەکیان دەربارەی ئەو گرێبەستەوە نییە و لێی بێ بەش نابن. کێلمان مشتومڕی ئەوە دەکات کە ئەم جۆرە پەیوەندییانە ئەنجامدانی گرێبەستەکە بەرەو باشی دەبات لە بواری بەدەستهێنان و کڕینی شتی گشتیدا، بەڵام هاوسەنگی لە حاڵەتێکی تاکدا دەوەستێتە سەر مەترسییەکان و سوودەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا جووڵەیەک لە ئاڕاستەیەکدا کە کێلمان پێشنیاری دەکات شیاوی ئەوەیە هەوڵی بۆ بدرێت گەر تێکەڵ بکرێت لەگەڵ هەوڵی بەهێزتر بۆ پاداشتی کۆمپانیا زەبەلاحەکان لە سەر بنچینەی قۆناغی کاری کۆتاییان.

## چەند پەندێک بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان

خاڵی بەهێز و لاوازی چاکسازیەکانی ئەمریکا دەبێ لە لایەن وڵاتانی ترەوە بەوردی سەیر بکرێن و گرینگیان پێ بدرێت کە وەک وانەیەک لێیان فێر بن. هەندێ لە پرۆپۆزەلەکانی کێلمان لە لایەن وڵاتانی پێشکەوتوو دەکرێ بەکار بهێنرێن، بەڵام ئەوانی تر گونجاو نین بۆ ئەو وڵاتانەی کە سیستەمێکی یاسایی پێشکەوتوویان نییە و بازاڕی تایبەتییان کزە.

پرۆپۆزەلی کێلمان لەبارەی بەکارهێنانی ئەزموونی ڕابردووی بەڵێندەران دەکرێ لە لایەن وڵاتانەوە بەکاربهێنرێن کە گەندەڵی پرۆسەی فەراهەمکردنیان تیادا زۆرە و مەسەلەیەکی جدییە. بەپێچەوانەوە، لە ژێر بینایی بنەماکانی ICB، نزمترین بەرپرسیارێتی مەزاتکەر دەبێ پەسەند بکرێت. گەر لە ڕووی میکانیکییەوە سەیری بکەین، ئەو یاسایە دەبێتە هۆی کارێکی ئاست نزم و ساختە کردنی عەرزی

پرۆژەکان بەنهێنی. بۆ ئەو وڵاتە بچووکانەی کە پشت بەخۆیان نابەستن و هەمیشە چاویان لە مشەخۆرییە، سومعەی مەزاتکەران دەکرێت لە ناوچە نێودەوڵەتییەکانەوە هەڵبهێنجرێت. رێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەتوانێت لیستی بەڵێندەران لەگەڵ زانیاری لە سەر کارەکانی رابردوویان بپارێزێت. ئەو مشتومڕەی لە سەر بەکارهێنانی تەقدیری کارکردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئەم جۆرە سیستەمە دەبێ جەخت بکاتەوە لە سەر ئەو گۆڕانکارییانەی کە دەکرێ بپێورێن و بەراورد بکرێن لە نێو وڵاتاندا. هەندێ ناوەندی ئاشکراکردنیش هەن رەنگە ئەمانە بگرێتەوە وەک، بەڵگەی ساختە و گەندەڵی و زێدەرۆیی نرخ و هەروەها دواخستنی کارەکە و کات بەفیرۆدان. دەکرێ ئەم جۆرە لیستە ئاوێتەی رێبەری پرۆسەی فەراهەمکردنی بانکی جیهانی بکرێت کە ئاماژە بەوە دەکات کە بانک ئەو کۆمپانیانە رادەگەیەنێت کە نەشیاون بۆ گرێبەستی بانک " یان ئەوەتا بەتەواوی یانیش بۆ کاتێکی دیاریکراو" گەر دووپاتی ئەوەی کردەوە کە کۆمپانیاکان دەستیان خستۆتە نێو گەندەڵی و پیادەی ساختەکاری بەپەیوەندی لەگەڵ پرۆژە داراییەکانی نێو بانک.

ئەو مشتومڕەی لە سەر پەیوەندییەکانی پێش مەزاتکردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەیە هەر هەمان کێشە لە وڵاتانی پێشکەوتوو سەدای دەگاتە ئەوسەری دونیا. لادانێکی گشتی نووسراوەکانی فەرمانی پرۆسەی فەراهەمکردن تێدەگلێنێت تاوەکو تەنیا یەک کۆمپانیا بتوانێت لەو ئاستەدا بێت کە پرۆژە وەرگرێت. بۆ نموونە، وڵاتێکی ئەفریقی گوایە جارێکیان چەند تایبەتمەندیەکی لە سەر داواکاریەکی تەلەفۆن داناوە و زۆر بەئاسانیش ئەو داواکاریانە بەساختەیی دابین کراون. تەنها یەک لە کۆمپانیا سکەندەناڤیەکان بۆ تەلەفۆن توانی بەپیر ئەو داواکاریانەوە بێت کە هەر دەڵێی بۆ ئەو دانرابوون چونکە هیچ یەکێک لە کۆمپانیاکانی تر نەیتوانی وەڵامی ئەو داواکاریانە بداتەوە. لە هەر سیستەمێکدا حکومەت بەشێوەیەکی گشتی بەرپرسیار بێت، ئەم جۆرە ویستانە مایەی گومانن گەر تایبەتمەندیەکان بەگشتی راگەیەنران. سەرکەوتنی گەورەی نێوان بەرپرسە گشتییەکان و بەڵێندەران دەبێتە هۆی گەندەڵی. ئەو سیستەمانەی کە زیاتر شەفافیەت پێیانەوە دەبینرێ و زیاتر خەمی بەرپرسیاریتیەکەیان دەخۆن دەتوانن



هەڵسن بەبەخشینی دەسەڵاتێکی تەواو بەلیژنەی کڕین نەک بەوانی تر کە کەمتر هەست بەبەرپرسیارێتی دەکەن. کێشەکە لە چڵەپۆپەی جدیەت دایە کاتێ هەڵبژردنی بەڵێندەرێک دەوەستێتە سەر سیفەتە تەکنیکیەکانی بەرهەم. بەپێچەوانەوە، گەر هەر حکومەتێک چەند بەرهەمێک دابنێت، یاخود ئامانجێک دوور لە بنەمای تایبەتمەندێتی دابنێت، ئەوا ئەمە کێشەی کاریگەری ناوەوە کەم دەکاتەوە. بەلایەنی کەم، چەواشەکاری هەر ئامانجێک زۆر روونتر و ئاشکرا تر دەبێت.

هەروەک کێلمان پێشنیار دەکات، چاکسازی پرۆسەی بەرهەم هێنان دەتوانێت چاکسازیەکانی خزمەتگوزاریە مەدەنییەکان تەواو بکات کە پاڵنەر بۆ بەرپرس دروست دەکات بەکاریگەریەوە کارەکەی خۆی جێبەجێ بکات. ئەو بەخشیشانەی دەست بەرپرسان و فەرمانبەران دەکەوێت کە هەر ئەمان ئامانجی پرۆسەی فەراهەم هێنان بەدەست دێن دەکرێ بەبەرتیلی نایاسایی بگۆڕدرێتەوە. بەڵام چاکسازیەکانی خزمەتگوزاریە مەدەنییەکان زۆر پێویستن نەک هەر تەنیا بەس بن بۆ سەرکەوتنی شێوازی رۆتینی پرۆسەی کڕین لە لایەن حکومەتەوە. بەم دواییە ئەم فەزاحەتی گەندەڵییە سەرکردە هەرە گەورەکانی نێو حکومەتەکانی گرتۆتەوە کە سوودیان لە زانیاری و پەیوەندیەکانی ناوەوە وەرگرتووە. پرۆپۆزەلەکانی کێلمان زۆر یارمەتیدەر نین لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم جۆرە گەندەڵییانە. بەڵکو لە بری ئەمە پرۆپۆزەلەکان جەخت دەکەنەوە لە سەر بڕیارەکانی کڕینی کەلوپەلی مام ناوەند لە رووی بەهاوە لە ژێر کۆنترۆڵی فەرمانبەرە پرۆفێشناڵەکانی دابینکردنی خزمەتگوزاری. بەڵام پرۆپۆزەلەکان سوورن لە سەر چاکسازی کە دەبێتە هۆی گۆڕانی بڕیارەکانی پرۆسەی شت کڕین بۆ بەرپرسی پیشەکار و دەستەی تێندەرەکانەوە. گەر دەسەڵاتداران نیازیان خۆ هاندان بێت لە داواکاریەکانی پشتیوانە سیاسییەکان، ئەوا دەبێ کەسی بێ لایەن دروست بکەن لەگەڵ دەسەڵاتێکی سەربەخۆی پرۆسەی فەراهەم هێنان.

ئاراستەی بنەڕەتی چاکسازیەکانی ئەمریکا دوور لە تەواوبوونی پرۆسەی مەزات بەرەو کاریگەر کردن و شیاوتر کردنی کەش و هەوای کڕین دەچێت کە ئەمەش گۆڕانێکی ریشەییە لە روانگەی چاکسازیەوە. وەک ئەزموونێکی زۆر بەهادار بۆ

ولاّتانی پێشکەوتوو دێتە بەرچاو، ئەو ولاّتانەی کە توانای دیار کراویان هەیە لە جێبەجێ کردنی ڕێنماییەکانی مەزاتی زۆر ئاڵۆز. هەرچەندە پێشبڕکێ لە مەزات بەفیکرەیەکی باش دەچێت، سەرنجی ئەوە بدەین کە مەزات هیچ ڕۆڵێک نابینێت لە بازاڕێکی ڕاستەقینەی پڕ لە پێشبڕکێ. لە بری ئەوە، نرخی بازاڕ دادەنرێت لە ڕێگەی کارلێک کردنێکی گونجاو لە نێوان کڕیار و فرۆشیار. بێ گومان، حکومەت پێویستی بەوە هەیە کە مامەڵەی تایبەتی دروست بکات بەبەکارهێنانی پرۆسەیەکی ڕێکوپێکی مەزات کردن بۆ کەم کردنەوەی نرخ. بەلاّم ئەزموونەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوە دەردەخەن کە زۆرجار دەتوانرێت سوودەکانی پێشبڕکێ بەدەست بهێنرێت گەر حکومەت ببێت بەبەشێک لە بازاڕ. بڕیارەکانی لەمەڕ چی بکڕدرێت و فەرهەم بێت گرینگە بەقەد بڕیارەکانی لە مەڕ چۆن پرۆسەی کڕین و فەرهەم هێنان جێبەجێ بکرێت. سیستەمە گەندەڵەکان نەک هەر تەنها پرۆسە خراپەکانی کڕین و فەراهەم بەکار دێنن بەڵکو زۆرجار شتی هەڵە فەراهەم دێنن و دەیکڕن. بۆ نموونە، گەر سیستەمێکی یەکسان و شەفافی مەزات ئەگەری نەبێت، ئەوا دەبێ ئەمە پاڵ بەئیختیارەکانی پرۆسەی کڕینەوە بنێت بەرەو کالاّکان و خزمەتگوزاریەکان کە نرخیشیان لە سەری نووسراوە یاخود دەکڕدرێن لە بازاڕی تایبەتدا. ئەو حکومەتەی کە داوای بەرهەمی گومرگ کراو دەکات خۆی دەخاتە نێو ژوورێکی دروستکراو بۆ بەرتیل و گەندەڵی.

نرخ دانان و نووسین لە سەر کالاّ و کەلوپەل ڕەنگە ئاسان بێت بۆ ئەو ولاّتانەی کە بچووکن لە ڕووی بازاڕەوە کە ئەوان تیایدا کار دەکەن. گەر لە پێوانەکانی کڕینی بەرهەم لە بازاڕە نێودەوڵەتییەکاندا، نرخی بازاڕ پێوەری زۆر چاک بوون ئەوا لەبەرئەوەیە کە داواکاری حکومەتی بچووک کاریگەری نییە لە سەر نرخەکان. یەکێک لە ڕێگاکانی نرخ دانان لە ڕێگای داتاوە دەبێت لە سەر بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکان. دوو توێژینەوە بەبەکارهێنانی ئامارەکانی بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکان نرخی ئاسایی و کالاّی هەمەجۆری دەرخستووە وەک ئەنجام. لە بەر هەمەجۆری بەرهەم تەنانەت لەگەڵ هەموو جۆرەکان بەووردەکاریشەوە، ئەو خەمڵاندنانەی نرخ هەمووی مەزندەن، بەلاّم دەتوانن وانەیەک بدەن بەولاّتانی



پێشکەوتوو تاوەکو فێر بن چۆن مامەڵە لەگەڵ نرخدا بکەن.

بێ گومان هەموو پرۆسەیەکی کڕین و فەراهەمکردن ناکرێت ئاڕاستەکەی بگۆڕدرێت بەرەو ئەو بەرهەمانەی بەپێوەری بازرگانی نێودەوڵەتی ناوزەند دەکرێت. ولاّتە پێشکەوتووەکان وەگەڕخستنی گەورە دەکەن بۆ مەبەستی تایبەتی ژێرخان لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا. ئەم پرۆژانە لەم پرۆژانە نین کە پێویستییان بەتەکنەلۆژیایەکی چاک هەبێت بەلاّم جۆرێکیشن لەمان. بۆیە کاریگەری پێشبڕکێ لە ڕێنماییەکانی مەزاتکردن وەک بایەخێکی سەرەکی لەم ناوەدا دەمێنێتەوە. پەسەندکردنی سەلاحیەتی بنەما بنەڕەتییەکانی ICB بۆ ئەم جۆرە پرۆژانە، ولاّتان هەر پێویستییان بەوە هەیە دڵنیا بن پێشبڕکێیەکی توند لە نێو مەزاتکەراندا لە ئارادایە.

ڕۆبێرت کلیتگارد باس لە ڕێکەوتنی نهێنی دەکات و بەم جۆرە وەسفی دەکات: چەند مەزاتکەرێک لە نێوەخۆیان بەکراوەیی و ڕوون و ئاشکرا ڕێک دەکەون لە سەر پرۆسەی مەزاتکردن بۆ ئەوەی لە نێوە خۆیان پرۆژەکە قۆرخ بکەن و لە سەر نرخێک ڕێک بکەون و شەریک بن لە بازاڕدا. ئەم حاڵەتە لە نێو سوپای ئەمریکی لە کۆریای باشوور لە سالاّنی شەست و حەفتاکان کالاّ و خزمەتگوزاریش دەگرێتەوە. بەڵێندەرە کۆرییەکان زۆر بەباشی ڕێکخرابوون و کۆبوونەوەیان ئەنجام دەدا بۆ ئەوەی بڕیار بدەن لە نێوە خۆیان کامە مەزاتکەر کەمترین نرخ دەڵێت و چۆنیش قازانجەکە بەسەر خۆیاندا دابەش بکەن. هەڕەشە و گوڕەشە بەکاردەهات بۆ بەهێزکردنی بڕیارەکان و سست کردنەوەی ئەو کەسەی کە ویستی ئەو کارەی هەبوایە. سوپای ئەمریکی لێپێچینەوەی لەگەڵ بازرگانە کۆرییەکان نەدەکرد بەخۆیان، هەروەها پیادەکردنی بلاّو کردنەوەی مەزات پاش ئەوەی کە مەزاتەکە دەکرێتەوە و تەنیا ئەنجامەکەش بەهەموو کەسێک دەوترێت.

لە ولاّتی ژاپۆندا، پرۆسەیەی نزیک لە فیکرەکەی کێلمان ڕووی دا بەوەی کە گروپێک کاری قۆرخکردنیان ئەنجام دا. بەرپرسانی پرۆسەی کڕین و فەراهەم هێنان ژمارەیەک مەزاتکەریان هەڵبژارد بەپشت بەستن بەئەزموونی ڕابردوویان. لە کردەدا، پرۆسەکە ژمارەی مەزاتکەرانیان سنووردار کرد بۆ گروپێکی بچووک و کۆمپانیا

نوێیە گەورەکانیان بەلا وەنا، بەتایبەتی ئەوانەی دەرەوە. هەموو ساڵێک تێندەرێک بەشێوەیەکی یاسایی ڕادەگەیەنرێت، تەنانەت بۆ پرۆژەکانی سەرمایەداری، ئەمەش فشار دەخاتە سەر بەشداربووان پەنا ببەنە بەر کاری نهێنی و ئیتر بۆ ماوەی چەند ساڵێک هەموو شتێک بۆ خۆیان بەم ڕێگایەدا قۆرخ دەکەن. گروپێکی بچووکی هەمان مەزاتکەری جاران گرێبەستەکەیان دابەش کرد و هەموویان بۆ خۆیان قۆرخ کرد.

لە حاڵەتی کۆریادا نرخ ئاشکرا کردن لە لایەن سوپای ئەمریکی یارمەتی ئەوەی دا لە سەدا ١٠ تا ٣٠ ی نرخی زیادە ئاشکرا بکات کە ئەمەش لە ئەنجامی قۆرخ کردندا ڕوودەدات. لەبەرئەوەی سوپا سەرنەکەوت لە ئاشناکردنی پێشبڕکێ لە پرۆسەی گرێبەستەکاندا، لە بری ئەوە هەڵسا پشتی بەست بەدانووسان لەگەڵ سەرچاوەیەکی باش. مەبەستی زۆر لە مەبەستی چاکسازیەکەی کێلمان دەچوو، مەبەستەکەش بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی سوپا بوو بۆ مسۆگەر کردنی نرخێکی گونجاو. زانیاری لە سەر نرخەکان لە بازاڕی تایبەتدا یاخود بۆ کاڵاو خزمەتگوزاری هاوشێوە لە وڵاتانی تر یارمەتی ئەوەی دا ئەو وڵاتانە قۆناغێک دابنێن بۆ دانووسان. حاڵەتی سوپای ئەمریکی لە کۆریا، ڕەنگە حاڵەتێکی تایبەت لەو شوێنەی کە ڕێکخراوێک نوێنەرایەتی حکومەتێکی دەرەوە دەکات ڕاستەوخۆ دەستی لە پرۆسەی کڕین و فەراهەمکردن هەیە.

پرۆسەی نهێنی لە حاڵەتی وڵاتی ژاپۆن ڕەنگە زەحمەتتر بێت بۆ نەهێشتنی لە بەرئەوەی بەرپرسە حکومییەکان شان بەشانی کۆمپانیا زەبەلاحەکان یارمەتیدەر و ڕێگەخۆشکەرن بۆ داپۆشین و کپکردنی ئەو نهێنییانە. تاکە ڕێگە چارە پرۆسەیەکی کراوە و پێشبڕکێ کارە کە ئاوێتەی سەپاندنی یاسا بێت. لە ڕاستیدا، ژاپۆن هەوڵی هەردوو ستراتیژیەکەی داوە. لە ساڵی ١٩٩٥دا داواکارە گشتییەکان، لە هەوڵێکی بێ وێنەدا نۆ کۆمپانیایان تۆمەتبار کرد بەڕێکەوتن بەنهێنی لە سەر پرۆژەیەکی کارەبا. لە حاڵەتێکی تاوانکاریدا کە لە ژێر یاسای دژە قۆرخکردنی ژاپۆندا، کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەستگیر کران و غەرامەش کران. لە هەمان کاتدا، حکومەت مەزاتێکی کراوەی ڕاگەیاند بۆ گرێبەستەکانی کاری گشتی بەمەبەستی زەحمەت کردنی هەلی کاری گەندەڵی نهێنی. کۆمپانیا سەرەکییە مەزاتکەرەکان لە سەدا



بیستی خەملاندنی وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە دێننە خوارەوە، بەڵام بەشێک لە هاتنەخوارەوەکە بەهۆی نالەباری باری ئابووری بازاڕە نەک بەهۆی کەمبوونەوەی ئارەزووی کاری گەندەڵی بەنهێنییە. بەڵام، بەلایەنی کەم یەکێ لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان ئەوەی ئاشکرا کرد کە بەشێکی زۆری ئەو داشکانە لە فەندەکە بەلاوەنرا بۆ بەرتیل.

کێشەی دووەم سەبارەت بە"ترسە" کە ژمارەیەکی زۆر کەمی کۆمپانیای گەورە مەزات دەکەن لە سەر پرۆژە سەرەکییەکان. بەڵام، زانیاری لە سەر ژمارەی ڕاستەقینەی مەزاتکەران ڕەنگە هێمایەکی دەسخەرۆ بێت بۆ مەرجەکانی پێشبڕکێ کردن. پێشکەش کردنی تێندەرێک کارێکە خەرجی دەوێت. کۆمپانیا گەورەکان نرخە جێگیرەکان بەراورد دەکەن لەگەڵ مەزاتەکە و لەگەڵ سوودێکی چاوەڕێ کراو، واتە، قازانجی چەندجارەکراوی هەلی بردنەوەی تێندەرەکە. گەر قازانجی گرێبەستەکە زۆر کەم بوو، ئەوا ژمارەی مەزاتکەران دێتە خوارەوە. بۆ نموونە، بەپێی چاودێرێکی بەئەزموون، کاتێ قازانج لە گرێبەستە نێودەوڵەتیەکان لە بواری ئاوەدان کردنەوە بۆ سەدا ٤ بەرەو خوار دێت، گەلێ لە فرە نەتەوەکان مەزاتەکەیان زۆر پێ گرانە گەر بێت و پێشبڕکێ بکەن دژی پێنج یان زیاتر ڕکابەری بەتوانا و شیاو. گەر کەمی قازانجی چاوەڕێ کراو وا لە ژمارەی مەزاتکەران بکات کە زۆر کەم ببنەوە، ئەوا کارێکی زەحمەت دەبێت بۆ بەدەستهێنانی هەر شتێک لەبارەی هێزی فشاری پێشبڕکێیەکە لە ڕێگەی تەنها سەیر کردنی ژمارەی مەزاتکەران لە سەر پرۆژە بەتاکەکان. ژمارەیەکی کەمی مەزاتکەران مانای ئەوەیە کە وڵاتی پیشکەوتوو وا سەیر دەکرێت کە زۆر جەخت دەکاتەوە لە سەر پرۆسەی پێشبڕکێ کردن لە کاتی مەزاتەکاندا.

گەر ژمارەیەکی زۆر لە مەزاتکەران بەشداری بکەن، ئەوا ئەمە وا دەردەخات کە قازانجی زۆر شتێکی چاوەڕوان کراوە ڕەنگە لە ڕێگەی ڕێکەوتنێکی گەندەڵ لەگەڵ بەرپرسانەوە. بەڵام، گرێبەستێک بەڕێژەیەکی بەرزی سەرمایە و ژمارەیەکی کەمی مەزاتکەران دەبێ گومانی لێ بکرێت چونکە ڕەنگە ڕێکەوتنێک هەبێت لە سەر گەندەڵی یاخود پارەدان و بەرتیل. کۆمپانیا زەبەلاحەکان مشتومڕ لە سەر داشکاندن

دەکەن بۆ ئامادەکاریەکانی مەزات یان زەمانەت بۆ نرخی مەزاتەکە. ئەمە بەکارێکی بێ ئەقڵانە دەچێت. ئامانجی سەرەکی دەبێ نەهێشتنی ڕێکەوتنی نهێنی بێت و زیادکردنی دەسەڵاتی مامەڵە بێت نەک هەر تەنها چەند جارە کردنی ژمارەی مەزاتکەرەکان. گەر تایبەتمەندێتی بەشێوەیەکی زۆر چاک و ڕێکوپێک بێ فرو فێڵ پێشتر دانرابێت و گەر ڕێکەوتنی نهێنی نەهێڵرێت، ئەوا پرۆسەیەک بە سێ یان چوار مەزاتکەر خراپتر نابێت لە پرۆسەیەک بەحەوت یان هەشت مەزاتکەر. کێشەی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دەوڵەتێک زۆر بێ هێزە یاخود نازانێت بەسەرکەوتوویی مامەڵە لەگەڵ بەڵێندەرەکانی دەرەوەی خۆی بکات. دواجار بەرتیلدان قازانجی قۆرخکراو مسۆگەر دەکات بۆ مەزاتکەرە سەرکەوتووەکان سەرەڕای ئەوەی بەشێک لەو دەسکەوتە بۆ بەرپرسە گەندەڵەکانە.



# ئەنجام

چاکسازی پێکهاتەیی دەبێ یەکەم هێڵی هێرشبردن بێت لە هەڵمەتی دژە گەندەڵیدا. گەر بەرنامەیەکی گشتی لە خزمەتی ئامانجێکی گشتی ڕەوادا نەبوو، ئەوا ئەو پێودانگەی کە دەسەپێت هیچ شتێک ناکات جگە لە ڕەخساندنی دەرفەتی گەندەڵی. چارەسەرەکە لێرەدا قەدەغە کردنە نەک چاکسازی. گەلێ لە بەرنامەکانی دیکە لە خزمەتی ئامانجەکاندا هەن ئەوانە دەبێ دووبارە نەخشە داڕێژ بکرێنەوە و دەسەڵاتی بەرپرس سنووردار بکەن. لە هەندێکی دیکەدا، سیستەمی ئیداری دەبێ ڕێک بخرێتەوە بۆ کەم کردنەوەی ئەو دەسکەوتانەی بەشێوەیەکی تایبەتی دەستی بەرپرسان دەکەون.

یاسای تاوانکاری دووەم بەشی بنەڕەتی ستراتیژیە روونەکەیە. دۆزینەوەی تێکەڵەیەکی باش لە سزادان و پادەشت کردن و هەروەها سەپاندنی یاسا کارێکی وەها ئاسان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، وانەیەکی گرینگی شرۆڤەکردنی تاوان لە رووی ئابووریەوە وانەیەکی بێ گرفتە: سیاسەتی دژە گەندەڵی نابێ هەرگیز بەتەمای ئەوە بێت کە ڕاستگۆییەکی تەواو فەرهەم دەکات، ئەمە شتێکی مەحاڵە. ئەوانەی کە پێگەیەکی ڕەها وەردەگرن هەمیشە هەوڵ دەدەن پێو ودانگی توند بسەپێنن کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادکردنی پاڵنەری گەندەڵی نەک کەمکردنەوەی. ئامانجەکانی سەپاندنی یاسا دەبێ بۆ پەراوێز خستنی ئەو سیستەمە گەندەڵیانە بن کە زۆرترین زەرەر بەکۆمەڵگا دەگەیەنن و دواجاریش دەبێ بۆ ڕێکخستنی هەوڵی قەدەغە کردنی گەندەڵی بێت و پاڵنەرێک بۆ بەشداربووان دابین بکات کەبتوانن خەبەر لە ڕێکەوتنی گەندەڵ بدەن.

چاکسازی پرۆسەی کڕین و فەراهەمکردن وەک سێیەم کۆڵەگەی بنەڕەتی ستراتیژیەتی دژەگەندەڵی خزمەت دەکات. دەبێ وەک هەلێک سەیری بکرێت لە لایەن حکومەت بۆ دووبارە بیرکدنەوە و بەخۆداچوونەوەی لە شت کڕین و شان بەشانی ویستی کڕینی کامە شت. هەرچەندە نابێ ئەو چاکسازیانەی لە ویلایەتە

یەکگرتووەکاندا بەبێ بایەخەوە بگوازرێتەوە بۆ حالەتی وڵاتانی تر، ئەو ئەزموونانەی ئەمریکا دەتوانن نەخشەی پرۆسەکانی کڕین و فەراهەم کردن بۆ حکومەت سەر لە نوێ و بێ فرو فێل لە وڵاتانی تردا دابڕێژنەوە. وڵاتانی پێشکەوتوو دەبێ بتوانن ئەزموون لە کاری بەڵێندەران وەرگرن، دەبێ بتوانن شەفافیەتی زۆرتر بگرنە بەر لە پرۆسەکانیاندا، هەروەها زیاتر پشت ببەستن بەمامەڵە کردن. لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، کە ئەزموون و بەهرەی پرۆسەی کڕین و فەراهەمکردن تیایاندا هەیە و هەروەها لەو وڵاتانەدا بەرپرسیارێتیەکی بێ هێز هەیە ئەوا حالەتی نووسینی نرخ لە سەر کاڵا و فرۆشتنی کەلوپەلی ستاندارد بەهێزترە لەوانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.

لە بەشی داهاتوودا، دەچمە سەر دواترین و بنەڕەتیترین چاکسازی لە سەر بنچینەی ئابووری. خزمەتێکی گەندەڵ و نەشیاو دەتوانێت هەموو ئەوانی تر ببەزێنێت و لە ناو ببات. ئەی کەواتە چۆن دەوڵەتێک بیرۆکراسیەتی خۆی پێک بهێنێتەوە تاوەکو خزمەتگوزاری ڕاستگۆی حکومەت کارێکی شایستە بێت بۆ هاوڵاتیانی ڕووناکبیر.



## چاکسازی لە خزمەتگوزارییە مەدەنییەکاندا

سیستەمی فەرمانبەران لە سەر بنچینەی چاودێریکردن و پشتگیری سیاسی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریەکی باش لە لایەن فەرمانبەرانەوە دەخاتە پەراوێزەوە و دەشبێتە هۆی ئیدارەیەکی نایەکسانی باج و سەپاندنی یاساکان. گەر گەندەڵی و کاری تاکە کەسی لە نێو حکومەتێکی بەناو دیموکراسی ئەوا چاکسازی سیاسی و ئابووری ڕوو لە کاڵبوونەوە و ناشەرعیەت دەکات. ئامانجەکەش لێرەدا ئەوە نییە ئیدارەی گشتی تەواو لە سیاسەتدا بەدوور بگرێت، ئەمە کارێکی مەحاڵە لە هەر ڕووداوێکدا بێت، بەڵام ئامانجەکە لێرەدا دۆزینەوەی چەند ڕێگایەکە بۆ ناوبژی کردنی پەیوەندیەکانیان. لە ڕووی تەقلیدیەوە، خزمەتگوزارە مەدەنییە پرۆفێشناڵەکان لە ڕووی سیاسیەوە بێ لایەنن و ئاسایشی ماوەی خزمەتکردنیان هەیە و مووچەیەکی چاکیش وەردەگرن و خزمەتەکە حیسابە بۆ پلە بەرزبوونەوە، هەروەها هیچ بەرژەوەندییەکی بازرگانی یان موڵکیان نییە تا هەوڵی بۆ بدەن و ئەرک و کارەکانیان وەلانێن و بکەنە قوربانی بەرژەوەندییەکانیان. هەندێ لە چاکخوازەکانی ئەم سەردەمە پرسیاریان هەیە لەم مۆدێلە تەقلیدیە، بەڵام لەگەڵ هاوکاری ئەو بنەمایەن کە فەرمانبەری مەدەنی نابێت لە سەر بنچینەی سیاسی وەربگیرێت و دەربکرێت لە کارەکەیدا.

لەو وڵاتانەی کە تاکە حیزبێک باڵادەستە دووچاری ئەو ڕووبەڕووبوونەوە دەبنەوە لە دروست کردنی فەرمانبەری مەدەنی پرۆفێشناڵ. لێرەدا لقی دەسەڵاتی جێبەجێکردن پێویستە لە ڕووی سیاسیەوە بەرپرسیار بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەرکەکانی ڕۆژانە چارەسەر بکات و بەدووریان بگرێت لە گەندەڵی و خزم خزمانێ. لە مەکسیک، بۆ نموونە، وا ورده ورده دەسەڵاتی باڵای تاکە حیزبی بەرەو کزبوون دەچێت، ئیتر حکومەتی نیشتمانی سەرگەرمی دروستکردنی فەرمانبەری مەدەنی پرۆفێشناڵە. هەر وڵاتێکی دیموکراسی تیایدا حیزبەکان دەگۆڕدرێن لە دەسەڵاتدا ناگونجێت لەگەڵ سیستەمێکی دامەزراندنی فەرمانبەران لە سەر بنچینەی خزم خزمانێ و

چاودێری سیاسی و تەزکیەی حیزبی. نەپاراستنی فەرمانبەری مەدەنی خزمەتگوزاری، کە ڕەنگە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا کارەکانیان لە دەست بدەن، ڕەنگە دەست بکەن بەگلدانەوەی پارە بۆ داهاتوو.

بێ گومان، پاڵنەرێک هەیە بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی بۆ بەرژەوەندی بەرپرسەکان لە خزمەتی مەدەنی ناسیاسیی. تاکە ڕێگە لە بەردەم فەرمانبەرە مام ناوەندەکانیش ئەوەیە کە دەبێ تەزکیەی حیزبی باڵا دەستیان هەبێت ئەگینا جیق و فیق بکەن کارەکەیان هەر لە دەست دەدەن. هەرچەندە شک و گومان لەبارەی پاڵنەرەکانی ئەوانەی کە کاریان هەیە ڕەنگە هەر هەبێت، هەر ترسی ئەوەیان هەبێت ڕۆژێک دادێت لە سەر کار لابدرێن لە بەر حیزبایەتی و ناسیاوەتی، بەڵام نابێ ئەمە کار لە بەهای چاکسازی بکات. دەبێ چاکسازی سەرکەوێت بەسەر ئەم بارودۆخەدا. ئەگینا دەوڵەت و حکومەت دەبن بەپێڵاوی حیزب. گەر فرە حیزبی بەتەواوی بچەسپێت، ئەوا ئەو کاتە خزمەتگوزاری مەدەنی ناسیاسی ڕێگە بۆ گۆڕانەکانی سەرکردایەتی خۆش دەکات. لەو وڵاتانەی کە ڕەوشی سیاسی سەقامگیر و ئارامە فەرمانبەر و بەرپرسی زیاتر بەخۆشخاڵیەوە خزمەت دەکەن بۆ سیاسیەت مەداران لە چاو ئەو وڵاتانەی کە ڕەوشی سیاسی تیایدا شڵەژاوە و حکومەتیش تەمەنی زۆر کورتە و زوو زوو دەگۆڕێت.

بەڵام تەنانەت ڕەوشی سیاسی سەقامگیریش دەتوانێت سوود لە فەرمانبەری پڕۆفێشناڵ و ناسیاسی وەربگرێت. مێژوو گەلێ لەم حاڵەتانەی تیایە کە وڵاتانی ئۆتۆکرات دانیان بەبەهای فەرمانبەری پڕۆفێشتاڵ بۆ خزمەتی مەدەنی داناوە و ئەوەشیان دڵنیا کردۆتەوە کە ئەو فەرمانبەرانە بەجدی و بەیەکسانی کار دەکەن و بەرهەمیشیان باشترە، ئیمپڕاتۆرەکانی ئەڵمان و چینییەکان باشترین نموونەی ئەم حاڵەتانەن. بەهەمان شێوە، وڵاتی مۆدێرنی چین ئێستا هەڵدەستێت بەپێکهێنانی دەزگای چاکسازی خزمەتی مەدەنی کە پشت دەبەستێت بەلێهاتوویی فەرمانبەر و مووچەی بەقەد بازاڕ و قازانج کردن. بەڵام ئەم چاکسازیە، هەندێ خاسیەتی گرینگی نەقوسانە لە زۆربەی سیستەمەکاندا. هەر حیزبی کۆمەنیست بەڕێوەی دەبات و هیچ جیاوازیەکیش ڕەچاو نەکراوە لە نێوان سیاسەتمەدار و فەرمانبەری



مەدەنی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو چاکسازیانە ڕەنگە یارمەتی دەر بن بۆ زۆرکردنی شەرعیەتی حکومەت لە بەرچاوی هاولاتیان و بەشێوەیەکی ئاسانتر سەرنجی وەگەڕخەرەکانی دەرەوە بۆ ناوەوەی وڵات ڕابکێشن.

چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی پرسێکی گرینگە لە گەلێ بەشی ئەم جیهانەدا. بۆ نموونە، وڵاتە تازە دیموکراسیەکانی ئەفریقیا دەبێ پەرە بەپیشەی خزمەتگوزاری مەدەنی بدەن تاوەکو ببن بەوڵاتی مۆدێرن و پێشکەون. دەبێ ئەرکەکان دابەش بکەن لە نێوان فەرمانبەری مەدەنی و جۆرەکانی تر و ڕێکخراو و گروپەکانی دەرەوەی پێکهاتەی ڕەسمی حکومەت. ئەو پێکهاتانەی حکومەت لە کاتی ژێردەستەکانی پێشتر سەرچاوەی گرتووە لە بیرۆکراسیەتی میسالی بەگەلێ ڕێگەوە. نەک هەر تەنها بەرپرسە گەورەکان نوێنەرایەتی ئەو ژێردەستانەیان دەکرد، بەڵکو بنەماکانی "وێبێریشیان" پێشێل کرد بەهۆی ململانێیەکی قورسەوە کە کاری ئەوانیش نەبوو بەهیچ جۆرێک، هەروەها بەهۆی دەست خستنە نێو بەرژەوەندییە بازرگانییەکان و مامەڵە کردنی خەڵکی بەنایەکسانی. "لادیپۆ ئادەمۆلکون" کە قوتابیە لە بواری بیرۆکراسیەتی ئەفریقی، پێشنیاری پیشەیەکی بچووکی خزمەتگوزاری مەدەنی دەکات لەگەڵ لابردنی گەلێ ئەرکە لە بەرپرسیارێتی حکومەتی ناوەندی. هەروەها پێدادەگرێت لە سەر گرینگی بەرپرسیارێتی سیاسی بەرپرسە گەورەکان. بەپێی بۆچوونی لادیپۆ، مۆدێلی وێستمنیستەری بەریتانی کە تیایدا فەرمانبەری مەدەنی ئامۆژگاری نهێنی و بەمتمانە دەبەخشن بەوەزیرەکان، ئێ خۆ ئەم سیستەمە لە وڵاتانی ئەفریقی جێبەجێ ناکرێت. نهێنی لە مامەڵەکان لە نێوان بیرۆکراتەکان و سیاسیەتمەداران ڕێگەخۆشکەرن بۆ گەندەڵی و کارکردن لە پێناو بەرژەوەندی تاکە کەس. بۆیە خزمەتگوزاری مەدەنی لە ئەفریقیا دەبێ لە کەش و هەوایەکی کراوە کاری خۆی بکات کە تیایدا هاولاتی ئاسایی و گروپە زیادبووەکان بتوانن چاودێری هەڵسوکەوتی خۆیان بکەن.

لە ڕوانگەی مێژوویەکی زۆر جیاوازەوە، ئابووری دوای کۆمەنیست دەبێ حکومەتی دروست بکات لە سەر بنچینەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان کە بەشێوەیەکی زۆر خراپ لە بەرپرسیارێتییەکانی ئەم سەردەمەدا بەکاردەهێنرێن. وەک وڵاتانی دوای

کۆلۆنیال، سنووری نێوان ئیدارەی حکومەت و ئابووری تایبەت سنوورێکی لێڵە. سەرەڕای پێکهاتە ڕابردووەکە لە سەر بنچینەی کۆنترۆڵێکی هەمەڕەکی، کەرتی حکومی ئەم سەردەمە بەباشی ڕێک نەخراوە. بڕیارەکان هەمیشە پچڕ پچڕ و بنەمای یاسایی نەقوسانە و بەشێوەیەکی نائاسایی دوادەخرێن. جێبەجێ کردنی چاکسازییەکان زۆرجار خراپە. هەرچەندە وڵاتانی ئینتیقالی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ئاسیادا ڕووبەڕووی ئەرکی زەحمەت دەبنەوە لە دروست کردنی سیستەمێکی خزمەتی مەدەنی پرۆفێشناڵ و ڕاستگۆ، یەک سوودیان هەیە لە سەر وڵاتانی پێشکەوتوودا. دانیشتوانێکی زۆر ڕووناک بیریان هەیە و دەشتوانن ئەرکەکانی حکومەتی مۆدێرن بەجێ بگەیەنن. بەڵام، گەلێ خەڵک پێویستی بەدووبارە مەشق هەیە تاوەکو بتوانێت بەرپرسیارێتی نوێ بگرێتە ئەستۆ کە داواکراوە لە فەرمانبەرە مەدەنییەکان لە ئابووری بازاڕدا.

دوو ڕێگای سەرەکی هەن بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵییەکان لە نێو کەرتی حکومیدا. یەکەم، حکومەت دەتوانێت چاکسازی لە سیستەمی دامەزراندنی ( تەوزیف) گشتیدا بکات. دووەم، حکومەت دەتوانێت خۆی بەدوور بگرێت لە دابینکردنی خزمەتگوزارییەکان لە ڕێگەی گرێبەستەوە لەگەڵ کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان. هەریەک لەمانە سوود و زیانی هەیە. دەست پێ دەکەم لە بنەماکانی خزمەتگوزاری مەدەنی وەک چاکسازی مووچە، ململانێی بەرژەوەندییەکان و سیستەمی پاڵنەرەکان و کۆنترۆڵی گەندەڵی هەڕەمەکی.

## چاکسازی مووچە

هەندێ لە وڵاتانی پێشکەوتوو مووچەیەکی زۆر کەم دەدەن بەفەرمانبەرە مەدەنییەکان. لە کاتی سەربەخۆییدا، زۆربەی وڵاتانی ژێردەستی پێشوو پێوانەی مووچەی فەرمانبەریان داناوە کە زۆرترە لە مووچەی کەرتی تایبەت، بەڵام ئەم سوودە زۆرجار بەپێی تێپەڕ بوونی کات داماڵراوە. شێوازێکی لەم چەشنە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ئەمریکای لاتیندا هەیە. لە ڕابردوودا مووچە دابەزی نەک هەر تەنها لە مووچەی ڕەسمی فەرمانبەر بەڵکو لە نێو کەرتی تایبەتیش. لە



نموونەیەکی بیست و یەک وڵاتیدا لە کۆتایی هەشتاکان و نەوەدەکان مووچەی تەواو دابەزی ساڵانە بەڕێژەی لە سەدا ١,٤ لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە ئەم ڕێژەیە جیا بوو ئەوەتا ساڵانە لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٢ لە بولگاریا لە سەدا ١٧,٧ و لە ساڵانی ١٩٨٦ تا ١٩٨٩ گەیشتە لە سەدا ٤,٤ لە غانا. پێوانەکانی مووچە فشارێکی زۆریان کەوتە سەر. بۆ نموونە، لە هەر سیانزە وڵاتی ئەفریقی جگە یەکێکیان نەبێت، مووچەی بەرز هاتە خوارەوە بۆ مووچەی نزم لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥ تا ١٩٨٥دا. لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکان، مووچەی بەزرترین فەرمانبەر کەمتر لە دە جار بەقەد مووچەی نزمترین فەرمانبەر بوو لە گەلێ لە وڵاتانی ئەفریقیادا. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، سەرنج کێش کردنی فەرمانبەری پلە بەرز زۆر زەحمەتە، هەروەها ڕەنگە داواکارییەکی زۆر هەبێت لە لایەن فەرمانبەری پلە نزم. بەرنامە چاکسازییەکان هەمیشە هەوڵی چارەسەر کردنی ئەو فشارەی کەمبوونەوەی مووچەی داوە. بۆیە لە غانا ڕێژەکە لە سەدا ٢,٥ بوو بەلە سەدا ١ و لە ساڵی ١٩٨٤ و هەروەها لە ساڵی ١٩٩١ لە سەدا ١٠ بوو بەلە سەدا ١، کەم وکوڕی ئامانجی چاکخوازەکان ئەوەبوو نەگەیشتنە ڕێژەی لە سەدا ١٣ بۆ ١، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشکەوتنێکی بەرچاو بوو. لە هەمان کاتدا، فەرمانبەری پلە نزم ڕەنگە بەهایەک زیاتر لە مووچەی کەرتی تایبەت بەدەست بێنن. بۆ نموونە، بەڕێوەبەر و ئەندازیار و ژمێریاری گشتی لە تایلاند و تۆباگۆ مووچەیان کەمتر بوو لە هاوشانەکانیان لە کەرتی تایبەتدا، هەروەها کەمترین مووچەی فەرمانبەری پلە نزم لە نێو کەرتی تایبەتدا دوو ئەوەندەی بەرزترین فەرمانبەری پلە نزمە لە نێو کەرتی گشتیدا.

لە کەرتی حکومیدا مووچە زۆر کەمە، گەندەڵیش ستراتیژیەکی زیندووە. بەڵام دەبێ لەوە ئاگادار بین نابێ زیادەڕۆیی بکەین لە جیاوازی نێوان کەرتی تایبەت و حکومیدا. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کۆی گشتی پاداشت نەک هەر تەنها مووچە بەڵکو شتی تریش وەک نیشتەجێ بوون و چاودێری تەندروستی دەگرێتەوە. ئەم جۆرە سوودانە زۆر بەهادار بوو لە کاتی بەرزبوونەوە گشتییەکە. بانقی جیهانی ئەوە نیشان دەدات کە سوودەکان وەک کۆی تەواوی قەرەبووکردنەوە لە سەدا بیست تا هەشتایە لە وڵاتانی کە توێژینەوەیان تیایدا کراوە.

بەڵام تەنانەت خەملاندنی ڕێک و دروستی بەهای ئەو شتانەش بۆشایی نێو مووچە لە هەموو وڵاتان پڕناکاتەوە. لەم حاڵەتانەدا، فەرمانبەران هەمیشە دوو کار دەکەن یاخود دەست دەکەن بەوەرگرتنی بەرتیل وەک پاشکۆیەک بۆ بژێوی ژیانیان. هەندێ لەو فەرمانبەرانە بەپۆستەکەی خۆیان بازرگانی دەکەن لە نێو حکومەتدا. کێشەکەش کێشەیەکی زۆر کۆنە. لە بەریتانیا لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا، کۆمیسیۆنی حکومەت نیگەران بوو بەکەمکردنەوەی مووچەی فەرمانبەران نەوەک لە سەر خەڵکی گشتی ڕەنگ بداتەوە بەهۆی ناڕەزایی نوێ بۆ ڕەچاوکردنیان، کە دەبوایە بەپێی دادوەری هەموویان ڕازی بکرێن. توێژینەوەیەکی بەم دواییەی نێو وڵاتان تێکەڵەیەکی نەرێ دەدۆزێتەوە لە نێوان مووچەی فەرمانبەرە مەدەنییەکان و ئاستی گەندەڵیدا. بەشێکی دیکەی بەڵگەی ناڕاستەوخۆ ئەو جیاوازییە لە نێوان مووچەی فەرمانبەر و داهات. بۆ نموونە، لە زایر مووچە تەنها لە سەدا ٣٣ ی داهاتی فەرمانبەری پێک هێناوە لە ساڵی ١٩٨٦، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٩ نزیکەی لە سەدا سەدی پێک دەهێنا. لە تانزانیا مووچە و سوودەکان لە سەدا ٤٠ی خەرجی ماڵەوەی پڕ دەکردەوە، هەروەها حکومەتیش هانی فەرمانبەری دا بگەڕێت بەدوای کارێکی تر لە دەرەوەی حکومەت.

هەندێ جار مووچەی کەم و کاری ئاست بەرز لە خزمەتگوزاری مەدەنیدا بەچارەسەر نەکراوی ماوەتەوە، هەروەکو ئاشکرابووە لە توێژینەوەکانی ئەو دواییەی گویانا و جامایکا. بەڵام شتەکان خراپتر دەبن کاتێ ئەو کارە پڕ دەکرێنەوە، چونکە لەوانەیە بەرتیل ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە مووچە دروستی کردووە. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی خەڵک پارە دەدات بۆ ئەوەی کارێک پەیدا بکات کە بەهیچ شێوەیەک حەز بەو کارە ناکات. لە هەندێ وڵاتانی پێشکەوتوودا هەندێ پۆست لە بازاڕدا هەن کە خەڵکی شەڕیانە لە سەر ئەو پۆستانە هەرچەند حەز بەکارەکەش نەکەن هەر دەیانەوێ چونکە گەر وەری بگرن ئەوا پاروویان دەکەوێتە ناو ڕوونی، زۆر دەوڵەمەند دەبن بەماوەیەکی کەم بەهۆی وەرگرتنی بەرتیلەوە. هەندێ لەو پۆستانە هی بەشی پۆلیسن کە زۆر موعەرەزن بۆ گەندەڵی و بەرتیل. کار لەو شوێنانە وەک خزمەتگوزاریەکانی دەرەوە ڕەنگە کەم کەس بۆی تەقدیم بکات بەڵام لە بەر گەندەڵی پارە ڕەواجیان زۆر دەبێت.



گەر حکومەت پاداشت نەدات بەو کەسانەی کە زۆر لێهاتوون و بەهرەمەندن لە کاردا، ئەوا فەرمانبەری لێهاتوو لە کارکردندا ڕادەکات بۆ نێو کەرتی تایبەت کە مووچەی باشە. هەندێ لەو فەرمانبەرانە دەگەڕێن بەدوای کاردا لە نێو کەرتە تایبەتییەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵات چونکە مووچەی حکومەت بەشی هاتووچۆی ڕۆژانەیان ناکات. دواجار هەموو کارمەندە لێهاتووەکان لەگەڵ ئەوانەی کە لە لایەن حکومەتەوە ڕاهێنراون و ئەزموونیان هەیە کارەکە جێدەهێڵن بۆ ئەوانەی کە فریان بەجمورەوە نییە. لە بەر نەبوونی گەندەڵی و دەسکەوتنی پارە بەشێوەیەکی نایاسایی هاوسەنگیەکی کرێکاری لە نێو بازاڕ سەرهەڵدەدات لەگەڵ ئەوانەی کە هیچ لە کار نازانن و بەپارەیەکی کەم ڕازین لە نێو حکومەتدا کار بکەن. تەنها ئەو فەرمانبەرە لێهاتووە کارەکەی لە نێو حکومەت جێ ناهێڵێت گەر بزانێت مووچەکەی بەقەد مووچەی کەرتی تایبەتە، ئەمەش تەنها ئەو فەرمانبەرانە دەگرێتەوە کە خزمی حکومەتن و لە پۆستی بەرز دانراون و مووچەیان باشە و ئیمتیازاتی لابەلایان هەیە. پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێک، خزمەتگوزاری مەدەنی بەنائومێدیەوە دوو جۆرە فەرمانبەر لەخۆ دەگرێت: فەرمانبەری بەرهەم نەهێنەر و نەزۆک کە کاریان دەست ناکەوێت لە کەرتی تایبەتیدا، هەروەها ئەو جۆرە فەرمانبەرەی کە لە پەنایەکەوە لە ڕێگەی بەرتیلەوە دەخوات.

گەر پرۆسەی بەرهەمهێنان و سیستەمی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری لە لایەن کەسی لێهاتوو و بێ بەهرە بەڕێوە بچن ئەوا گەندەڵی لەو شوێنانە لە دایک دەبێت و وردە وردە پەرە دەسێنێت. لە هەل و مەرجێکی ئاواشدا، چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی دەبێ زۆر بەقووڵی بێت گەر چرۆ هیوایەکی سەرکەوتن هەبێت. زیادکردنی مووچە و چاک کردنی مەرجەکانی کار کردن ڕەنگە کاریگەریەکی کەمی هەبێت لە سەر ئەنجامدانی کار. وێڕای ئەمەش، فەرمانبەری نوێ دەبێ شوێنی زۆربەی هێزی کاری هەنووکە بگرێتەوە. داڕشتنەوەی بەرنامە حکومیەکان بەژیری زۆر پێویستە بۆ کەم کردنەوەی پاڵنەرەکانی گەندەڵی هاوکات زیادکردنی پاڵنەرەکانی چالاکیە بەرهەم هێنەرەکان. ئەم ئەنجامە یەک دەگرێتەوە لەگەڵ هەوڵەکەی "ڤان و وێدەر" لە شی کردنەوەی گۆڕانەکان لە ئیندێکسی گەندەڵی لە نێو وڵاتان بەپێی تیپەڕوونی کات. لە

هەندێ ولاتدا، جۆری بیرۆکراسیەت نەریتیانە تێکەڵبووە لەگەڵ ئاستی گەندەڵی و ئاستی مووچەش هیچ گرینگیەکی پێ نادرێت. فەرمانبەر مووچە بەشی ناکات، ئەوا گرفتی خۆیەتی.

چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی بەشێکە لە پڕۆژە چاکسازیەکانی تر کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان هاوکاری دەکەن، بەڵام زۆرجار ئەو هەوڵانەی بۆ چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی دەدرێت نەزۆکن. لە پێناو سەرکەوتندا، چاکخوازان پێویستییان بەزانینی بەهای سوود و دابەشکردنی ئەو سوودانە هەیە، هەروەها دەبێ پەیوەندی نێوان مووچەی کەرتی حکومی و داهاتی فەرمانبەر بۆ خێزانی و گرینگی گەندەڵی و ململانێی بەرژەوەندییەکان کاتێ کار لە بڕیاری حکومی دەکات بزانن، هەروەها دەبێ ئاگاداری ڕەوشی ئابووری و قەبارە و ڕۆڵی کرێکارە تایبەتییەکان بزانن. حکومەت پێویستە ئەوە بزانێت ئایا مووچەیەکی مام ناوەند پەسەند دەکرێت لە لایەن فەرمانبەرانی حکومیەوە، ئایا ئەو مووچە مام ناوەندە بەشی ژیانی ڕۆژنەی فەرمانبەر دەکات بۆ ماوەی مانگێک. گەر حکومەت بەوە بزانێت ئەوا دەبێ مووچەی فەرمانبەر زیاد بکات، ئیتر هەم فەرمانبەر ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنێت و هەم هەر ئەو فەرمانبەرە پەنا بۆ بەرتیل نابات. لە هەندێ بەرنامە چاکسازیەکانی ڕابردوودا، دەرکردنی فەرمانبەر و ڕەوانەکردنی بۆ کەرتە نارەسمی و کشتوکاڵییەکان ئەوەندە زەحمەت نەبوو کە چاوەڕێ دەکرا.

دەکرێ بەربەست لە بەردەم چاکسازی کەم بکرێتەوە بەهۆی سیاسەتی هەلی کار لە کەرتی تایبەت و هاندانی بازرگانەکان تا بێنە دەرەوە بەئاشکرا کار بکەن. باشترین دەستپێکیش جەختکردنەوەیە لە سەر دروستکردنی سیستەمێکی ڕاستگۆ و دروستی کۆکردنەوەی باج. بەئەنجامدانی ئەم کارەش داهاتی دەوڵەت دەپارێزرێت و هانی کۆمپانیا تایبەتە زەبەلاحەکانیش دەدرێت تا پەیوەندی بکەن بەئابووری ڕەسمی. بۆیە ئەوەی بەکەرتی حکومی قایل نەبێت، یان ئەوانەی بێکارن دەتوانن بچن هەوڵی کارێک بدەن لە نێو کەرتی تایبەتدا. بەداخەوە، گەشە خۆی لەخۆیدا هەندێ کێشە دروست دەکات، چونکە بەرپرسی چاوچنۆک و گەندەڵ چاوی دەبڕێتە ئەوەی بەشێکی هەبێت لە کارە نوێیەکانیش لە ڕێگەی سەپاندنی هەندێ پێو و دانگ بەسەر کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان. ئەم کێشەیەش پێویستی بەچارەسەرێکی



ڕیشەیی هەیە. چاکخوازان دەبێ کار لەو بەرپرسانە بسێننەوە کە پێشتر سوودیان بینیوە بۆ ئەوەی گەندەڵی کەم بکەنەوە. چونکە ئەوانە کارێکی زۆر کەمیان بۆ کەرتی حکومی ئەنجام داوەو زۆرترین سوودیان بینییەوە، چونکە هەموویان دووەم کاریان هەبووە لە نێو کەرتە تایبەتییەکان. کاتێ ئەمەش ڕوو دەدات، وەدەرنانی ئەم جۆرە کەسانە زۆر ئاسان دەبێت. گۆڕانە پێکهاتەییەکان لە نێو کارەکانی حکومەتدا دەبێ لەگەڵ پرۆپۆزەلی نوێ تێکەڵ بکرێت و بۆ زیادکردنی مووچە و چاک کردنی مەرجەکانی کارکردن. ئامانجەکەش تەنها نەهێشتنی گەندەڵی نییە لە نێو بەرپرسە پارە خۆرەکان بەڵکو سەرنج کێش کردنی کەسی لێهاتووە بۆ نێو کەرتی حکومی.

## ململانێی بەرژەوەندییەکان

سیستەمە تەقلیدییەکانی خزمەتگوزاری مەدەنی هەوڵی جوداکردنەوەی پیشەی فەرمانبەر و بەرپرس دەدات لە سیاسەت و حیزب حیزبانێ و مووچەیەکی شایستەیان بداتێ. ئەمانە ئامانجی زۆر گرینگن، بەڵام تەنها بەشێکن لە ئەرکی دروستکردنی پێشکەشکردنی خزمەتێکی پرۆفێشناڵ. هەتا گەر مووچە بەقەد مووچەی کەرتی تایبەت بێت و سیاسەت و حیزب جودا بکرێنەوە لە کارکردن ئەوا هەندێ بەرپرس هەن مەنسەبی خۆیان بەکاردەهێنن وەک پردێک بۆ گەیشتن بەدەسکەوتی ئابووری تایبەت. هەرچەند هەندێ ولات بەیاسا بەرەنگاری بەرتیل بوونەتەوە بەڵام ناتوانن کۆنترۆڵی ململانێی بەرژەوەندییەکان لە نێو ژیانی ئابووریدا بکەن. ململانێی بەرژەوەندییەکان زەق و بەرچاو بوون لە سەردەمە زووەکانی ئەمریکای کۆماردا. بەڕێوەبەری پۆستە ڕۆژنامەی بلاو دەکردەوە و کرێی خۆیان بەلاش دەوەستا، کۆکەرەوەی باجی وێسکی باجیان لە فرۆشتنی وێسکی خۆیان وەرنەدەگرت، هەروەها هەندێ بەرپرسی گومرگ بوون بەبازرگانی زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگ. بەهەمان شێوە، لە ئەفریقیای پشتی ژێردەستەییدا، لە گەلێ ولاتدا بەرپرسە سیاسیەکان هاندران بۆ ئەوەی دەست بخەنە نێو بازرگانییەوە لە ڕێگەی ئەو دەسەلاتەی پێیان بەخشرا بوو. لە ئەنجامی ململانێی بەرژەوەندییەکان و گەندەڵیدا کاروباری ولات پشت گوێ خراو دەوڵەت پەکی کەوت. ململانێیەکی پەرش

و بڵاو سەرتاپای ڕووسیا و ئەوڕپای ڕۆژهەڵات و چینی گرتبۆوە. لە چین، کە حکومەت شەریکە لەگەڵ گەلێ کۆمپانیای هاوبەشی بازرگانی کەرتی تایبەت، حکومەت خۆی کادرەکانی هان دا بچنە نێو دەریای بازرگانی لە ڕێگەی دەسەڵاتەکەیانەوە. کێشەی دابەش کردنی پاڵپشتیەکان ئاسکرایە. بەرپرسەکان هەموو کات حەز دەکەن مەنسەبی خۆیان بەکاربێنن بۆ ئەوەی سوودی زیاتر بەدەست بێنن و تا زووە گیرفانیان پڕ بکەن چونکە دەترسن لەوەی بەیانی لە سەر کارەکەی لابدرێت.

لەبەر ئەو گیروگرفتانە، زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتوو فەرمانبەرە مەدەنییەکان دوور دەخەنەوە لە کاری سیاسی و حیزبایەتی چونکە دەبێتە هۆی سوود گەیاندن پێیان لە سەر حیسابی خەڵکانی تر. فەرمانبەر و بەرپرس دەبێت کاروباری داراییان ڕاگرن لەگەڵ ئاژانسی گشتی و نابێت بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ کارەکەی خۆیان تێکەڵی بکەن. پەسەند کردنی دیاری و پلە بەرزکردنەوە بەپێی یاسا دەبێت.

ئەخلاق لە یاساکانی حکومەت و کۆنترۆڵە سیاسیەکان وردە وردە لە ویلایەتە یەککگرتووەکان گەشەی کرد بەڵام ئێستا زۆر زەق و بەرچاوە. یەکەم هێمای ئەخلاقیات لە بەڕێوەبەری گشتی پۆستەوە لە ساڵی ١٨٢٩ ڕاگەیەنرا. ئەمڕۆ چەند هێمایەکی تێکەڵی ئەخلاقیات و داواکاریە یاساییەکان دەسەپێن بەسەر فەرمانبەرە حکومیەکانەوە. لە نێو ئەو یاساو هێمایانەی ویلایەتە یەککگرتووەکاندا هاتووە " هیچ فەرمانبەر و بەرپرسێک بۆی نییە مەنسەبەکەی خۆی لە پێناو بەرژەوەندی کەسی خۆی بەکار بێنێت، هەروەها هیچ بەرژەوەندییەکی دارایی خۆیان نابێ تێکەڵ بکەن بەکارەکەی خۆیان یان لە ڕێگای کارەکەی خۆیانەوە هەوڵی بەدەست هێنانی بدەن، نابێ بەهیچ شێوەیەک ئەو فەرمانبەر و بەرپرسانە زانیاری نێو دام و دەزگاکان بەکاربێنن بۆ بەدەست هێنانی دەسکەوتی کەسی خۆیان، یاخود لە ڕێگەی قبوڵکردنی دیاریەوە گیرفانی خۆیان پڕ بکەن." هەروەها لە هەندێیاسا و هێمای تردا باسی ئەرکەکانی کارکردن دەکات. هەم بەرتیل دەر هەم وەرگر بەتاوانبار دادەنرێن. وەرگرتنی هەر مووچەیەک لە دەرەوەی سەرچاوەکانی حکومەت لە سەر حیسابی حکومەت دژی یاسایە، یاخود پارە بەخشین بەهەندێ فەرمانبەر یان بەرپرس بۆ



ئەوەی نوێنەرایەتی حیزبێک بکات لە مەسەلەیەک بۆ بەرژەوەندی حیزبەکە. یاسا لە سەر ئەو کەسانە جێبەجێ دەبێت کە لە مەسەلەیەکی وادا پارە دەبەخشن بەفەرمانبەر یان بەرپرس بەهەمان شێوەش لە سەر ئەو بەرپرس و فەرمانبەرانەی کە پارە وەردەگرن. لە کۆتاییدا، بەرپرس و فەرمانبەران نابێ سەرپێچی یاسا بکەن هەتا گەر لە ڕووی تەکنیکیشەوە بێت.

گەر بێین بەراوردێک بکەین، ئەوا دەبینین پێودانگە فەڕەنسی و کەنەدییەکان لەمەڕ ململانێی بەرژەوەندییەکان هەمان ئامانجیان هەیە لەگەڵ ئەوانەی ئەمریکیەکان بەڵام بەبەکارهێنانی میتۆدی جیاواز. یاسای فەڕەنسی بەبەراورد لەگەڵ یاساکانی ویلایەنە یەککگرتووەکان، زیاتر جەخت دەکاتەوە لە سەر چارەسەرە ئیدارییەکان تا تاوانییەکان، بەڵام هەمان ئامانجی سەرەکیان هەیە لە نەهێشتنی سەرپێچی کردنی یاسا و هاوپەیمانی بێ کەڵک و بێ سوود لە نێوان بەرژەوەندییە داراییە کەسیەکان و پیادەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە یاسا فەڕەنسیەکان پێدەچن زۆر توند نەبن. هەروەها پێو ودانگە کەنەدی و بەریتانییەکانیش زۆر بەهێز و کاریگەر نین. حکومەتی پەرلەمانتاری، سەرۆک وەزیران بەبەرپرسیاری ئەگێندەی یاسادانان دادەنێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە بەپێچەوانەی ویلایەتە یەککگرتووەکان، یاساکانی ململانێی بەرژەوەندییەکان بەدەگمەن جێبەجێ دەکرێت لە سەر فەرمانبەرانی لقی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن تا ئەندامانی پەرلەمان. فەرمانبەرە مەدەنییەکان بەپێی یاسا ئیداریەکانەوە ڕێک دەخرێن نەوەک یاساکانی تر.

ویلایەتە یەککگرتووەکان سنوور بۆ چالاکیەکانی فەرمانبەرە مەدەنییەکان دادەنێت بۆ ئەوەی لە سەر بنچینەی حیزب حیزبانێ کارەکانی خۆیان ڕانەپەڕێنن. بەپێچەوانەوە، لە فەڕەنسا، ڕێگای پیشەیەکی گشتی لە فەرمانبەرە مەدەنییەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ نێو سیاسەتە هەڵبژێراوەکان. فەرمانبەری مەدەنی دەتوانن لە هەڵبژاردنەکان دەربچن بۆ پۆستێک بەبێ ئەوەی کارەکەی خۆیان لە دەست بدەن. گەر لە هەڵبژاردندا بۆ پەرلەمانی فەڕەنسی دەربچن ئەوا دەبێ مۆڵەت وەرگرن لە کارەکەیان بەڵام دەتوانن پاش تەواو بوونیان لە ئەندامێتی پەرلەمان بچنەوە سەر

کاری خۆیان بەبێ ئەوەی پلەی خۆیان لە دەست بدەن، واتە پێشتر چی بوونە هەر دەگەڕێنەوە سەر ئەو کارە. لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨ تا ١٩٨٦ دا، لە سەدا ٣٣ ی ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی پێک هاتبوون لە فەرمانبەرە مەدەنییەکان. بەهای ئەم جۆرە سیستەمە دەوەستێتە سەر وجوودی خزمەتێکی مەدەنی بەڕێز. لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، ڕەنگە شێوازی فەڕەنسا سوودی هەبێت. بەڵام لەوانی تر کە خزمەتی مەدەنی پڕە لە گەندەڵی ڕەنگە وەک ئەمریکیەکان جوداکردنەوەی ئیدارە لە سیاسیەت باشتر بێت.

## سزا و پاداشت

چاکسازی مووچە و دامەزراندنی فەرمانبەری بەسوود و کۆنترۆڵکردنی بەرژەوەندی دەرەوە و دەستێوەردانی سیاسی لە نێو کاردا هەنگاوی بەرایی و پێویستن. هەندێ جار چاکخوازەکان دەتوانن سروشتی خزمەت بگۆڕن بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵیەکان، بەڵام ئەمە هەمیشە شیاو نییە. کۆکەرەوەی باج و پۆلیس و پسپۆڕانی بواری کڕین و بەرپرسە نیزامییەکان هەمیشە دووچاری پاڵنەرە گەندەڵیەکان دەبنەوە، هەمیشە یەک هەر هەیە بیەوێت دەمیان چەور بکات لە پێناو دەسکەوت. بۆیە سیستەمێکی ڕێکوپێک بۆ کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی پێویستی بەسیستەمێکی سزا و پاداشت هەیە. سزای یاسایی ڕەسمی پشتگیریەکی باشە بەڵام دەشکرێت گەر پاڵنەرەکان لە نێو بیرۆکراسییەتدا بەکاربهێنرێن بۆ کەمکردنەوەی حاڵەتی گەندەڵی. هەردووکیان هەم سزا هەم پاداشت پێویستن بۆ هاندانی کاری باش و سنووردارکردنی بەرتیل. پاڵنەرەکان دەتوانن پێدابگرن لە سەر ئەنجامدانی کاری تاک یاخود دابین کردنی پاداشت و سزا پەیوەست بەکار ڕاپەڕاندنی گروپێک.

یەکێک لە ڕێگە چاکەکانی نەهێشتنی گەندەڵی هەبوونی سیستەمێکی چاودێری باوەڕپێکراو و دوور لە سیاسەتە کە بگەڕێت بەدوای بەرپرس و فەرمانبەرە گەندەڵەکان و لێیان بپێچێتەوە. گەر فەرمانبەر مووچەیەکی باش وەرگرێت، ئەوا بەرپرسی گەندەڵ ئازارێکی ڕاستەقینە دەچێژێت گەر بگیرێن و دەربکرێن لە سەر کارەکانیان. با بڕیارێک هەبێت " مووچەی خانەنشینی دەدرێت تەنها بەو کەسانەی



کە کونییەیان باشە لە کاتی کار کردن بەسەربەرزییەوە کارەکەیان ڕاپەڕاندووە و هیچ فڕوفێڵ و گەندەڵیەکی نەکردووە، بەڵام ئەوەی کونییەی باش نەبێت لە کاتی کارکردندا واتە فڕوفێڵی کردبێت و گەندەڵ بووبێت ئەوا مووچەی خانەنشینیشی پێ نادرێت. بەڵام ئەم جۆرە چاودێرییە بەس نییە. دەکرێ سزایەکی وەک ئەمە هەبێت " هەر کەسێک گەندەڵی بکات لە کارکردندا ئەوا بەزووترین کات لە سەر کار دەردەکرێت". چاککردنی مووچە، گەندەڵی و بەرتیل کەم دەکاتەوە بەڵام نایگەیەنێتە سەر سفر، واتە لە ڕەگەوە هەڵی ناکێشێت. گەر فەرمانبەرێک یان بەرپرسێک باشترین مووچەی هەبێت بەڵام لە هەمان کاتدا بترسێت لەوەی کە ئەمڕۆ نا بەیانی لە کار لادەدرێت، ئەوا هەرچەند مووچەی باش بێت ئەو بەرپرسە هەر بەرتیل وەردەگرێت و کاری گەندەڵی هەر دەکات چونکە بەم شێوەیە بیر دەکاتەوە کە تا زووە گیرفانەکانی پڕ بکات چونکە ئەم کارە تا سەر بۆ ئەو نابێت و زووش لە کار لادەدرێت. بۆیە دەبێ سیستەمێکی سزا و پاداشت هەر هەبێت لە کاتی کار ڕاپەڕاندندا.

هەندێ جار بەخشیش دەبەسترێتەوە بەبەهای ئەو خزمەتەی کە دابین کراوە. هەمیشە ئەوەمان لە یاد بێت کە هەندێ جار بەرتیل پاڵنەرێکە بۆ کرێی بیرۆکراتەکان. لەو حاڵەتانەی کە گەندەڵی سەرچاوەی گرتووە لە کاری نایاسایی ئەوا دەکرێ پارەدان بخرێتە نێو چوارچێوەیەکی یاساییەوە. کاریگەرێتی ئەم جۆرە ستراتیژیەتە دەوەستێتە سەر ئەوەی تا چ ڕادەیەک فەرمانبەر پارە بەدەست دێنێت واتە هەر چەند پارەی پێ نیشان بدەی ئەوەندە کارەکەی خێراتر ڕادەپەڕێنێت. بۆ نموونە، دەمەزراوێک دەتوانێت سیستەمێکی وا بەکار بێنێت ئەوەی کار خێرا بکات پارەی زۆرتر وەردەگرێت ئەوەشی کە بەهێواشی کارەکان ڕاپەڕێنێت ئەوا بەخشیشی کەمە یان هەر پێی نادرێت. کەواتە لێرەدا، ئەو بڕە پارەیەکی لە سەر بنچینەی خێرایی کار ڕاپەڕاندن دەدرێت بەفەرمانبەرێک دەچێتە قاڵبی پاداشتەوە، ئەوەشی کاری هێواشە و هیچی پێ نادرێت دەبێتە سزایەک.

گەلێ لە بریکارە تایبەتی و حکومیەکان بەرپرسن لەو بڕیارەی ئەنجامی دارایی لێ دەکەوێتەوە کە سنووری ئاستی مووچە دەبەزێنێت. لەم جۆرە حاڵەتانەدا،

مەزندەیەکی ناواقیع بینانە دەکەین گەر وا دابنێین کە بەخشیشە پاڵنەرەکان یەکسانە بەبەهای ئەو سوودەی کە لە ڕێگەی گەندەڵی و بەرتیلەوە بەدەست دەکەوێت. بەڵام ئەو قسانەی لە سەرەوە لە سەر ئاستی مووچە و گەندەڵی کران پێشنیاری ئەوە دەکەن کە دەشێ مووچەی فەرمانبەرێکی لێهاتوو لە نێو کەرتی حکومی بەقەد مووچەی یەکێک بێت لە نێو کەرتی تایبەتدا. فەرمانبەری لێهاتوو جگە لە مووچەکەی بڕێکی پاداشت پێ بدرێت ئەوا لەو کاتەدا مووچەکەی دەگاتە مووچەی یەکێک لە نێو کەرتی تایبەتیدا.

سیستەمی پاڵنەر سیستەمێکی کاریگەرە بەڵام دەبێ زۆر بەژیری نەخشەی بۆ دابنرێت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی قۆرخکردن نەدرێت بەبیرۆکراتەکان. بۆیە چاکخوازە بەریتانییەکان لە ساڵانی (١٨٣٠) یەکاندا مشتومڕی ئەوەیان بوو کە مووچە دەبێ بەدیلی هەموو شتەکانی تر بێت تاوەکو فەرمانبەر لە نێو کەرتە حکومیەکاندا بمێنێتەوە. بۆیە کۆمەڵێک لە پەرلەمانتاران نیگەران بوون لەوەی کە پەسەند کردنی ئەم جۆرە کرێیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە فەرمانبەر بەقەد ئەرکەکەی خۆی ماندوو نەکات.

وەک بەدیلێک بۆ سیستەمی پاڵنەری پارە دان، دەشێ پاداشت بدرێت بەو کەسانەی کە بەباشترین شێوە کارەکانی خۆیان ڕادەپەڕێنن. بۆ گەلێ فەرمانبەری خزمەتگوزارییە گشتییەکان ئەمە باشترین چارەسەرە. گەر هەوڵە هاوبەشەکان تەنها بۆ پاداشتی تاک بن ئەوا ئەنجامێکی دژومنکارانەی لێ دەکەوێتەوە و هەلومەرجی کارکردنیش دەبێتە هەلومەرجێکی شەڕانگێزی، چونکە ماقوڵ نییە تەنها کەسێک یان گروپێکی دیاریکراو بەبەردەوامی پاداشت وەرگرن و ئەوانی تریش پشت گوێ بخرێن. ئەم پرسە پاڵی بەپسپۆڕانی ئەم بوارە نا گفتوگۆ بکەن لە سەر پاداشت بەو گروپە فەرمانبەرەی کە داهێنان یاخود شت بەرهەم دێنن ببەخشرێت. جۆرە پاڵنەرێکی ئاواش ئامانجی خۆی دەپێکێت گەر فەرمانبەر بەشداری بکات لە مەرجەکانی کارکردندا. بەڵام هەندێ جاریش کارکردن بەتیم خۆی لە خۆیدا کێشە دروست دەکات بۆیە باشترین چارەسەر ئەوەیە پاداشت بەتاک ببەخشرێت، واتە گەر فەرمانبەرێک کاری خۆی بەچاکی بەڕێوە برد و داهێنانی تیا کرد و بەرهەم ڕوو لە



زیاد بوون بێت ئەوا پاداشتی پێ ببەخشرێت. فەرمانبەری حکومی دەتوانن کار پێکەوە بکەن و باشترین خزمەت پێشکەش بکەن بەڵام دەشتوانن پێکەوە ڕێک بکەون داهاتی بەرتیل زیاد بکەن. کارکردن بەشێوازی تیم لە نێو فەرمانبەران و بەرپرسان لە گەلێ حاڵەتدا بەگەندەڵی نێو پۆلیسەکان دەچێت. گەر پێوەرێک هەبێت بۆ کارکردن، ئەوا سیستەمی پاداشت بەخشین بەبە فەرمانبەرێکی تاک لە سەر بنچینەی باش بەڕێوەبردنی کارەکانی ئەوا ئەم سیستەمە دەبێتە ئالیەتێک بۆ تێک و پێک شکاندنی بازنەکانی گەندەڵی.

دەزگا وەگەڕخەرەکانی حکومەت دەبێ پشت ببەستن بەسیستەمی پاداشت بەخشین لە سەر بنچینەی کاری باش. هەرچەندە هەندێ لە پسپۆڕان پێیان وایە کە ئەو دەرگایانە بخرێنە چوارچێوەی دامەزراوەی تایبەتیەوە بەڵام ئەم بۆچوونە سەر ناگرێت. گەر ئەو دامەزراوە حکومییانە کاڵا و خزمەتگوزاری بفرۆشن بەموشتەریە تایبەتییەکان، ئەوا هەمیشە پێوەرێک هەیە ئەنجامەکان هەڵسەنگێنێت. بۆ نموونە، نیوزلەندا و کۆریا پشت دەبەستن بەسیستەمی پاداشت بەخشین لە سەر بنچینەی ئەنجامی باش لە کاتی کار ڕاپەڕاندندا. لە کۆریا، بەخشیشی ساڵانە وەک پاڵنەرێک بۆ فەرمانبەران هەمیشە بەسەر هەموو ستافەکەدا دابەش دەکرێت، بەڵام کۆمپانیا زەبەلاحەکان سیستەمی هەڵسەنگاندنی ناوخۆیان هەیە. بۆیە دەوڵەت پاداشت دەدات بەهەموو دامەزراوەکە و کۆمپانیاکەش بەپێی سیستەمی هەڵسەنگاندنی خۆی پاداشت دەدات بەو فەرمانبەرەی کە کاری باش ئەنجام دەدات. ئەم جۆرە تەکنیکانەش ئەنجامی زۆر باشیان لێ دەکەوێتەوە بەڵام پێویستییان بەداهاتی زۆرە بەهەڵسەنگاندنی ئەنجامدانی کارەکان لە نێو دامەزراوە وەگەڕخەرەکانی حکومەت.

پارە بەخشین، جا چ بەگروپێک یان فەرمانبەرێکی تاک، وەک پاڵنەرێک بۆ فەرمانبەر کارێکی ئاستەمە لە نێو کەرتە حکومییەکان تا کەرتە تایبەتییەکان. لە دەرەوەی دامەزراوە وەگەڕخەرەکانی حکومەت لە کاتی فرۆشتنی بەرهەمە بازرگانییەکان، زۆر زەحمەتە بڕیار لە سەر ئەنجامدانی کاری باش بدرێت. بۆ نموونە، گەر دامەزراوە حکومییەکان چەند هەل و مەرج پێوەرێک دابنێن کە تەواو ئامانجەکانی سیاسەتەکە ناپێکێت، هەروەها گەر مووچە بەستراببێتەوە بەو

هەلومەرج و پێوەرانە ئەوا فەرمانبەر دەست دەکات بەیاریکردن بەو سیستەمە تا زۆرترین بەخشیش بەدەست بێنێت. ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو لە پارە بەخشین لە سەر بنچینەی کاری باش لە نێو حکومەتدا تێکەڵ کراوە و ئامانجی خۆیشی دەپێکێت. لەم ڕووەوە نیوزلەندا بەیەکێک لە وڵاتە سەرکەوتووەکان دادەنرێت، کەچی لێرەو لەوێش گرفتی هەر هەیە.

بە شێوەیەکی گشتی، پارە بەخشین وەک پاڵنەر بۆ فەرمانبەران لە سەر بنچینەی کار کردنیان سەرکەوتووتر دەبێت گەر، هەوڵ و کۆششی زیادە دەسکەوتی زیادەی بەدواوە بێت، گەر فەرمانبەران نەکەونە نێو حاڵەتێکی زۆر مەترسیدار لە کاتی کارکردنیان، گەر پێوەرێک هەبێت بۆ هەڵسەنگاندنی هەوڵ و ئەنجامەکان، هەروەها گەر فەرمانبەران دەسەلاتی تەواویان هەبێت بۆ وەلامدانەوەی ئەو پاڵنەرانە. بڵاوبوونەوەی گەندەڵی تا ڕادەیەکی زۆر بەڵگەیەکە کە بەهۆی پارە بەخشینەوە دەتوانیت شتێکی گرانبەها لە فەرمانبەران بکڕیت. بۆیە دەبێ ئەو پاڵنەرانە لەو شوێنانە بەکاربهێنرێن کە گەندەڵی تیادا زۆرە. چاکسازی سەرکەوتوو ئەو چاکسازیەیە کە بەرتیلی نایاسایی کەم دەکاتەوە و بواری ئەنجامدانی کاریش بەرەو پێش دەبات.

## گەندەڵی لە بنکردایەتییەوە بۆ سەرکردایەتی، بەپێچەوانەشەوە

چاکسازییەکی تر ،کە دەبێ شان بەشانی چاکسازییەکانی پێشوو کاری بۆ بکرێت، چاکسازی کردنە لە پەیوەندی نێوان گەندەڵی سەرەوە و خوارەوە. واتە " وەزیر لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی ئەویش لەگەڵ ئەوانەی بن دەستی خۆی، یان بەپێچەوانەوە". لە گەندەڵی لە " خوارەوە بۆ سەرەوە" فەرمانبەرەکان لە ئاستی خوارەوەدا بەرتیل کۆدەکەنەوە و دواتر بەشی ئەوانەی سەرەوەی خۆیانی لێ دەدەن جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاوستەوخۆ بێت. بەرتیل بەخشین بەبەڕێوەبەری یان بەرپرسی گەورە وەک ئالیەتێک بەکاردەهێنرێت لە لایەن فەرمانبەرانەوە بۆ ئەوەی گەورەکانیان بێ دەنگ بکەن" دەمیان چەور دەکەن و دەبەستن". لە هەندێ حاڵەتدا، مەسەلەکە وەک هەرەمێک کار دەکات، واتە هەر پایە و پایەی دوای خۆی دەکڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی



خۆی. بۆ نموونە لە وڵاتی نیپاڵ، پۆلیسەکان دەستیان هەبوو لە گواستنەوەی حەشیش، دواتر بەشێکی سوودەکەی خۆیان دا بەئەفسەرەکانیان. هەروەها لەکاتی کۆکردنەوەی باج و گومرگ وەرگرتندا، فەرمانبەرەکان دزی تیا دەکەن و دواتر بەشی دەکەن لەگەڵ بەپرسەکانیان. لە حاڵەتێکی ئاشکرا بووی وڵاتی کۆریادا، فەرمانبەران ئەوەیان ئاشکرا کرد کە هەرچەند بەرتیلیان کۆبکردایەوە ئەوا لە کۆتایی ڕۆژدا بەشیان دەکرد لەگەڵ بەڕێوەبەر و سەرۆک بەشەکان و سەرۆکی لیژنەکان.

شێوازی دووەم " گەندەڵی لە سەرەوە بۆ خوارەوە"یە. ئەمەش واتە بەرپرسەکان دەمی ئەوانەی خوار خۆیان شیرین دەکەن و دەمیان دەبەستن و هەرچی دەسکەوت هەیە لە ڕێگەی بەرتیل و دزی و کاری لابەلا بەدەست دێنن لە نێوە خۆیان بەشی دەکەن. لە کۆریا، بەرپرسە گەورەکان وەک ئەندامانی خێزان سەیری ئەوانەی خوار خۆیان دەکەن، زۆرجار کاتێک نەسریەی مانگانە وەردەگرن نیوەی بەش دەکەن لەگەڵ ئەوانەی خوارخۆیاندا. مەبەستیشیان لەم کارەدا کوێرکردن و دەم بەستانی ئەوانەی خوار خۆیانە بۆ ئەوەی لە کاتی ئەنجامدانی هەر کارێکی گەندەڵی کەس ڕێگەیان لێ نەگرێت یان ئاشکرایان بکات. گەر زۆربەی بڕیارە سەرەکییەکان لە سەرەوە دەربچن و دەست و پێوەندەکانیش " فەرمانبەرەکانی خوار ئەوان" هەوڵی جدی بدەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارانە، ئەوا شێوازی گەندەڵی لە سەرەوە بۆ خوارەوە سەرکەوتوو دەبێت. بۆ نموونە، پاداشتی گرێبەستە سەرەکییەکان بەرپرسە گەورەکان دەپارێزێت، بەڵام پێویستییان بەیارمەتی دەبێت لە هەڵسەنگاندنی مەزات و چاودێریکردنی جێبەجێ کردنی پرۆژەکە. بۆیە لە نیپاڵ، بەرپرسە گەورەکان چەند کۆمیسیۆنێک پێک دەهێنن بۆ بەدواداچوونی ئەو گرێبەستە حکومییانەی کە کۆکراونەتەوە لە لایەن نوێنەرانی نێو مەیدانی کار کردنەوە، ئیتر ئەو نوێنەرانەش بەشی خۆیانی لێ مسۆگەر دەکەن ئینجا ئەوانی تریش بەڕێ دەکەن. بەدیلی ئەمەش، بەرپرسە گەورەکان هەموو داهاتە نایاساییەکان کۆدەکەنەوە و هاوکات لەوەش خۆیان دڵنیا دەکەن کە دارو دەستەکانیان و ئەوانەی خوار خۆیان بەشێکیان وەرگرتووە تاوەکو دەنگ نەکەن و هیچ ئاشکرا نەکەن. هەمان ئەم حاڵەتە دووبارە دەبێتەوە لە "غابون" کە تیایدا بەرپرسە گەورە حیزبی و حکومییەکان سوودمەند

دەبن لە بەرتیل وەرگرتن لە کارگەکانی نەوت لە کاتێکدا فەرمانبەرە مەدەنییەکان مووچەیەکی باش وەردەگرن.

گەلێ لە هەوڵە تیۆرییەکانی بەم دواییەیە هەوڵی ئەوەیان داوە لایەنەکانی ئەم دیاردەیە دەستنیشان بکەن. لە یەکێک لە شێوازەکانی گەندەڵی لە خوارەوە بۆ سەرەوەدا، بەرپرسە گەورەکان کاری گەندەڵی ئەوانەی خوار خۆیان دادەپۆشن و لە بەرابەر ئەو کارەشدا بەشێک لەو دەسکەوتەی ئەوان وەردەگرن. هەمیشە گەورەکان چالاک نین لە ڕێکخستنی سیستەمەکە، بەڵام بەئاسانی چاوەڕێی نامەکان دەکەن پێیان بگات کە پڕیەتی لە سەرکۆنە کردن و سەرزەنشت کردن و دواتر بڕیار دەدەن کە ئایا بەرتیلەکە پەسەند بکەن یان نا. مادام بەرپرسە گەورەکان چاوپۆشی دەکەن لە کاری گەندەڵی و بەرتیل وەرگرتنی فەرمانبەرانی خوار خۆیان لە پێناو دەسکەوتێک، ئەوا گەندەڵی لە ئیدارەی نێو بەرپرسە گەورەکان وەک مشەخۆرێک لە سەر گەندەڵی ئەوانەی خوارەوە دەژیت، لە کاتێکدا هەمووی بەرگری لەوی تر دەکات و هەموو پاڵپشتی یەکتر دەکەن. ئەم شێوازەش دوو ڕێچکەی هەیە. لە یەکەمیان، تەنها فەرمانبەرانی خوارەوە بەرتیل وەردەگرن. فەرمانبەرانی خوارەوە ئامادە نین ئەو باجە بدەن بۆ نەهێشتنی مەترسی گرتن و دەرکردنیان. زۆر بەئاسانی ئەو مەترسییە پەسەند دەکەن وەک بەشێک لە باجی بەدەستهێنانی بەرتیلەکە. لە ڕێچکەی دووەمیاندا، پاداشتەکانی گەندەڵی بەرزترە، بۆیە گەندەڵیش دوو سەرەیە هەم لە خوارەوە بۆ سەرەوە، بەپێچەوانەوەش. بەرتیل لە نێو فەرمانبەرانی پلە نزمدا زۆر بەرزە و بەشی ئەوە دەکات کە بەشی ئەوانەی سەرووی خۆیان لێ بدەن کە زانیاری لەبارەی کارە گەندەڵیەکانیان پێ دەگات.

لە شێوازێکی تری گەندەڵی لە خوارەوە بۆ سەرەوەدا، فەرمانبەرە بەرتیلخۆرەکان حیسابی ئەوە دەکەن کە گەورەکانیان دەرفەتی ئەوەیان دەبێت ئەو کارە گەندەڵیەیان پێ بگاتەوە و داوای بەشێک بکەن. گەر گەورەکانیان ڕازی نەکەن بەبەرتیل ئەوا دووچاری مەترسی ئەوە دەبنەوە کە بەسزای تاوانی خۆیان بگەن، بەواتایەکی دیکە بڵێین گەر فەرمانبەرە بەرتیلخۆرەکان پارەیەکی باش نەدەن بەگەورەکانیان ئەوا تووڕە دەبن و دەستگیریان دەکەن و هیچ دەسەڵاتێکیشیان نییە چونکە هەمیشە لە



نێو یاسادا باوەڕ بەو کەسە دەکرێت کە پشتی هەیە. ئەم شێوازەش وەک زنجیرەیەکە کە هەموو تەواو کەری یەکترن، هەروەها پایەکانی هەڕەمێک هەمووی تەواوکەری یەکترن. ئەو شێوازە هەمیشە بەجۆرێک ڕێک دەخرێت کە هەموو لایەک سوودمەند بێت و هەرگیز سزای تیا نەبێت. ئاستە بەرزەکانی سزادان هەڕەشەیەکە لە لایەن گەورەکان بۆ سەر بچووکەکان، بۆیە هەمیشە بچووک سوودێکی کەمی بەردەکەوێت و سەری گەورەش بەشی شێری بەر دەکەوێت. چونکە ئەو سزا چاوەڕێ کراوانەی دەسەپێت بەسەر بەرتیل وەرگرەوە بەپێی قەبارەی بەرتیلەکە نین، ئەو سزایانە بۆ نەهێشتنی گەندەڵین و هاوکات ئاستی بەرتیلدان بەرزدەکەنەوە. بەرتیلی بەرز و زۆر کە لێرەو و لەوێ دەدرێت و وەریش دەگیرێت بەڵگەی سەرکەوتن نەک ژێرکەوتنی ئەو ستراتیژیەتە.

گەر گەندەڵی دیاردەیەکی ئاوا سەراپاگیر بێت کە لە خوارەوە بۆ سەرەوە هەروەها بەپێچەوانەشەوە بگرێتەوە، ئەوا ئەو چارەسەرانەی کە لە ئارادا هەن هەرگیز ناتوانن ئەو ئاگرە بکوژێننەوە. چونکە گەر بەرپرس خۆی گەندەڵ و دز بێت هەرگیز یاسا جێبەجێ ناکرێت، گەر جێبەجێش بکرێت ئەوا دەبێ لە سەرۆکەکانەوە دەست پێ بکرێت، کە ئەمەش کارێکی مەحاڵە لە زۆربەی وڵاتاندا. چاکخوازان بەم دواییە بیریان لەوە کردۆتەوە کە سیستەمێکی "سووڕخواردن" دابنێن بۆ ئەوەی زوو زوو بەرپرسەکان شوێنیان بگۆڕدرێت تاوەکو کاتی ئەوەیان نەبێت پەیوەندی لەگەڵ کەسدا خۆش بکەن بۆ پارە لێدان متمانە دروست نەکەن بۆ چاوپۆشی کردنی کارە گەندەڵیەکانیان. ئەمەش هیچ کاریگەرییەکی نابێت گەر بێت و ئەوانەی لە سەرەوە گەندەڵی دەکەن نەچنە ژێر باڵی یاساوە. هەربۆیەشە، سیستەمی سوڕخواردنی بەرپرسانی چاودێری کۆکردنەوەی باج لە هیندستان سەرناگرێت چونکە چاودێریکردنی ئەوانەی باج دەدەن و وەردەگرن کارێکی مەحاڵە چونکە گەورەکان خۆیان دەستیان بەسەردا گرتووە. لە حاڵەتێکی ئاواشدا فەرمانبەرێکی قوربەسەر چۆن دەوێرێت قسەیەک لە دەمی دەربچێت لە کاتێکدا دەمیان چەور کردووە. گەر دەزگایەک هەمووی گەندەڵ بێت و پشت و پەنای یەکتر بن ئەوا ئەو کەسەی بیەوێت شت ئاشکرا بکات و ڕاستگۆ بێت ئەوا سزا دەدرێت لە سەر ڕاستگۆییەکەی.

توێژینەوەیەک لەمەڕ گەندەڵی لە هیندستان دەری خستووە کە زۆربەی حاڵەتەکانی گەندەڵی بەم شێوەیەن لە نێو دام و دەزگاکاندا. هەروەها ئەم جۆرە حاڵەتانە لە نێو هێزەکانی پۆلیسی ویلایەتە یەکگرتووەکان و تایلەندا بینراوە. کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە فەرمانبەری بچووک لە ژێر ڕەحمەتی سەرووی خۆیانن، ناچارن دەست بخەنە نێو ئەو سیستەمە گەندەڵەی ئەوان کاری پێ دەکەن.



## ئەنجام

چاکسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان کارێکی گرانبەهایە و لە ڕووی سیاسیشەوە زەحمەتە، هەروەها ڕەنگە ئەم کارە لەو دیو تواناکانی گەلێ لە وڵاتانی هەژاردا بێت. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت بەتەواوی فەرامۆش بکرێت. لە هەندێ وڵاتدا مووچەی حکومەت لەم ساڵانەی دواییدا تەواو دابەزیوە لە هەمان کاتدا فشارە ئابوورییەکان وایان لە حکومەت کردووە خەرجیەکان ببڕێت. هەندێ جار بانقی جیهانی و IMF سوورن لە سەر کەمکردنەوەی مووچە لە سەر ئەو بنچینەیەی کە گەلێ لە دەرامەتی وڵات بەگەندەڵی بەهەدەر چووە. لە ژێر فشاری دامەزراوە نێودەوڵەتییەکاندا، وڵاتانی قەرز وەرگر هەمیشە مووچەیان ڕوو لە کەمییە چونکە لە ڕووی سیاسیەوە وەها بۆیان ئاسانترە لەوەی کە فەرمانبەری نەشیاو دەربکەن. واتە لە بەر هۆی حیزبی و سیاسی ناتوانن بەسەدان فەرمانبەر دەر بکەن ئیتر ئەم حاڵەتە کاریگەری نەرێی هەیە لە سەر هەموو فەرمانبەرە لێهاتوو و شیاوەکان و مووچەشیان پێ کەم دەبێتەوە. کەواتە فەرمانبەری مووچە کەم پەنا دەباتە بەربەرتیل دان و گەندەڵی وەک ڕێگەیەک بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەو مووچەیەی لێیان دەبڕدرێ لە سەر حیسابی حیزبایەتی و سیاسەتدا.

دەبێ دەستبەجێ بانقی جیهانی و IMF ئەو سیاسەتە دژە بەرهەمانە بوەستێنن. نەتەوەکان وا پێشکەوتنی باشیان بەخۆوە بینیوە لە ڕووی بەدەستهێنانی هاوسەنگی دارایی ئەمەش سەرکەوتنیان خێراتر دەکات بەهۆی ئەو پارە زیادەی کە دەیدەن بەفەرمانبەر. بۆ نموونە، لە چین لە ساڵی ١٩٩٢ دا حاڵەتێکی لەم جۆرە ڕووی دا، کاتێ مووچەی فەرمانبەرە مەدەنییەکان لە سەدا ٨٠ زیادی کرد. زیادکردنی مووچە زۆر پێویستە بۆ ئەنجامدانی کاری باش و دوور لە گەندەڵی، بەڵام زیاد کردنەکە ببەسترێتەوە بەبەرهەم و هەروەها هەنگاویش بنرێت بۆ کەمکردنەوەی فەرمانبەری کەرتی حکومی. لەگەڵ ئەوەشدا، کەمکردنەوەی ژمارەی فەرمانبەران کارێکی نەزۆک دەبێت گەر کار نەبێت لە دەرەوە یاخود لە کەرتی تایبەت بۆ ئەو دەرکراوانە. ئەو

سیاسەتانەی کە هانی پەرەپێدانی کەرتی تایبەت دەدەن دەبنە هۆی سەرکەوتنی چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی.

ئەو چاکسازیانەی کە باس دەکرێن گەر هەمووی پێکەوە تێک هەڵکێشرێن باشترین ئەنجامیان دەبێت. گەندەڵی بەربڵاو و سەرەخۆرە دەبێ لە ناو ببرێت بەهۆی چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی و گۆڕان لە سروشتی کاری حکومەت. گەر ئەو چوارچێوە یاساییانە وەک خۆیان مانەوە و نەگۆڕان، ئەوا نەمانی گەندەڵیش سوودێکی کەمی دەبێت. بۆ نموونە، هەندێ لە سەرنجدەرانی ڕەوشی ئیتاڵیا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گەندەڵی ڕوو لە کاڵ بوونەوەیە بەڵام بیرۆکراسیەت هەر لەسەر هەموو یاساکانەوەیە. گەر ڕەگی گەندەڵی بەجۆر و ئاستی دەستێوەردانی گشتییەوە ئاو بدرێت ئەوا چاکسازی لە نێو ئەو دەستێوەردانە گشتییەش پێویستە. ئەو دەوڵەتەی ڕوو لە چاکسازیە دەبێ ئەو پاڵنەر و زەمینانە کەم بکاتەوە کە دەبێتە ڕێگە خۆشکەری بەرتیل، ئەمەش ئەنجام دەدرێت بەهۆی نەهێشتنی بەرنامە مردووەکان و سانا کردنەوەی یاساکانی باج و داواکارییەکانی پرۆسەی کڕین و فەراهەمکردن. هەروەها دەوڵەت دەبێ پاڵنەرە نەرێ و ئەرێیەکانی فۆرمی خزمەتگوزاری و پرۆسەی کڕین و چاکسازی و سەپاندن چاک بکات.

لە بەر ئەوەی هەموو شتێک لە یەک ساتدا ئەنجام نادرێت، باشترین شوێن بۆ دەست پێکردن داواکردنی لەناوبردنی خزمەتگوزاری گەندەڵ و پاشەکەوتی گەندەڵە. چاکسازی دەتوانرێت لە یەک یان دوو ئاژانسەوە دەست پێ بکرێت، وەک ئیدارەی باج یان بەهەوڵی باوەڕپێکراو بۆ جێبەجێ کردنی تایبەتمەندێتییەکی سەرەکی بەڕێگایەکی کراوە و شەفاف. دەست پێکردن لە خاڵێکی بچووکەوە کارێکی باشە بەڵام بەبێ بەردەوامی هیچ سوودێکی نابێت.

ئەرکی هەرە گەورە گۆڕینی بۆچوونی گشتی و قەناعەت پێکردنی خەڵکی سادەیە کە حکومەت زۆر بەجدی کار دەکات بۆ بنبڕکردنی گەندەڵی. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە خەڵک متمانە بەحکومەت دەکاتەوە گەر بینی گەندەڵی ڕوو لە کاڵبوونەوە بێت. حکومەت دەبێ لەو خزمەتگوزاریانەوە دەست پێ بکات کە خەڵک بەبەلاش بەدەستی بێنێت کە پێشتر بەپارەی بەرتیل بەدەستی دێنا. گەر خزمەتگوزاریەکە



پێویستییەکی بنەڕەتی نەبوو ئەوا ڕەنگە خەڵک کرێی بەکارهێنانی قبوڵ بێت لە بری ئەوەی بەرتیل بدات. هەنگاوی دوای ئەمە چاکسازی کردنە لە سیستەمە گەندەڵەکان کە ڕێگە بەخەڵکی دەدەن باج نەدەن و سەرپێچی یاسا بکەن. لەو حاڵەتانەدا چاکسازی باوەڕپێکراو دەبێ لە سەرەوە ڕا دەست پێ بکات چونکە لە زۆربەی وڵاتان سەرکردە لە هەموو کەس زیاتر گەندەڵترە. کارەکەش دەبێ لە سەر دەوڵەمەند و باڵا دەستەکان بەهێزتر بێت. گەر ژمارەیەکی زۆری باجدەران داوایان لێ بکرێت باج بدەن ئەوا ڕەنگە ئەوانی تر بەخۆشحاڵییەوە دەچن بۆ باجدان. لە هەموو ئەو چاکسازییانە گەر تەنها جەخت لە سەر هاوڵاتی ئاسایی بکرێتەوە و یاسا تەنها لە سەر ئەوان جێبەجێ بکرێت ئەوا تووڕەیی هاوڵاتی هەموو هەوڵێک بۆ ئەو چاکسازییانە پووچەڵ دەکاتەوە.

## بەرتیل، واستە و دیاری بەخشین

گەندەڵی: بەهەڵە بەکارهێنانی دەسەڵاتی حکومی و حیزبیە بۆ دەسکەوتی تایبەتی. پەیوەندییە سەرەکییەکانی ئاژانس لە کەرتی حکومیدا دەرفەت بۆ گەندەڵی دەڕەخسێنێت. بەپێی ئەم پێناسەیە بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازیەک هەیە لە نێوان ڕۆڵی کەسێک لە کەرتی حکومی و تایبەتیدا. لە گەلێ کۆمەڵگادا ئەم جۆرە جیاوازییە وا بەڕوونی و بەئاشکرایی وجوودی نییە. لە کەرتی تایبەتدا، بەخشینی دیاری بەشێوەیەکی بەرچاو دیارە و بەهاکەشی بەرزە، هەروەها شتێکی ئاساییە کە گرێبەست یان کارێک بۆ یەکێک بدۆزیتەوە لە بەر واستەی خزمایەتی و عیلاقاتی شەخسی. کەسێک نییە لە بەر تاکە هۆیەک ئەو پیادانە بەئەنجام نەگەینێت و نەیخاتە نێو جیهانی کەرتی گشتییەوە. بەهەقیقەت، جیاوازی ڕوون و ئاشکرا لە نێوان کەرت و ژیانی تایبەتی و گشتیدا کارێکە لە شتی سەیر و سەمەرە دەچێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵک لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بەپێی پێوەرە کەلتوورییەکانی خۆیان جیاوازی دەکەن لە نێوان هەڵسوکەوتی گونجاو و نەگونجاو. ڕووپێوە فەرمییەکان و گفتوگۆکان لێرەو لەوێ نامۆییەکی تەواو سەبارەت بەگەندەڵی دەخەنە ڕوو و پێشنیاری ئەوە دەکەن کە لێبووردن و لێخۆشبوون و ترس و واز هێنان دروست دەکات لە لایەن ئەو کەسانەی کە شکات دەکەن دژی گەندەڵچییەکان نەوەک تۆڵەیان لێ بسەننەوە دوای ئەوەی کەس لێیان ناپێچێتەوە. وێڕای ئەمەش، هەتا گەر بەخشینی دیاری و واستە و خزم خزمانێ بەڕێژەیەکی بەرچاو پەسەند کرا، ئەوا باجی شاراوە دەسەپێنن بەسەر هاوڵاتی ئاسایی کە ئەمەش دواجار هاوڵاتی تووڕە دەکات. ئابووری ناسان ناتوانن وەڵامی پرسیارە کەلتوورییەکان بدەنەوە، بەڵام دەتوانن یارمەتی یەکێک بدەن لە سەپاندنی کارە ئیختیارییەکانی نێو کۆمەڵگا بگەن. کۆمەڵگا دەتوانێت پرسیار لەوە بکات ئایا کاری لەگەڵ نەریتە کەلتوورییەکان تەواو بووە کە باج دەسەپێنێت بەسەر توانای گەشەی ئابووری و وا لە حکومەتیش دەکات کاری خۆی بەباشی بەئەنجام نەگەیەنێت؟



ئەم بەشە جیاوازی دەکات لە نێوان بەرتیل و نرخ و بەخشیش و دیاری. کار زەحمەتی جیاکردنەوەی دیاری لە بەرتیل ڕیشەکەی دەچێتەوە سەر لێکچوونەکانیان. لە هیچ کامێکیاندا سیستەمی یاسایی کار کردن بۆ یەکتری ( من کارێکت بۆ دەکەم، تۆش لە بەرابەر ئەو کارەدا کارێکم بۆ بکە، quid pro quo) هان نادات. بۆیە دەبێ وەرگری دیاری یان بەرتیل میتۆدیی نایاسایی بگرێتە بەر.

## بەرتیل و دیاری و نرخ و بەخشیش

شت بەخشین جا پارە بێت یان هەرجۆرێکی تر بێت، بەدوو شێوازدا ناسراوە، یەکەم، ئایا سیستەمێکی ئاشکرای ( من کارێکت بۆ دەکەم، تۆش لە بەرابەر ئەو کارەدا کارێکم بۆ بکە، quo quid pro) هەیە؟ گەر سیستەمێکی وا هەبێت، ئەوا مامەڵەکە پێی دەوترێت پرۆسەی کڕین و فرۆشتن گەر شتێک لە نێوان پارەدەر و وەرگر هەبێت. بازاڕ و بەرتیل هەمیشە پێکەوە کار دەکەن. دیاری بۆ کەسی خۆشەویست زۆرجار نابێتە هۆی بازرگانی هەرچەندە زۆر حاڵەتیش هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کار لە مامەڵەی نێو بازاڕ بکات. دووەم شێواز، مەنسەبی دامەزراوەیی پارەدەرە و پارە وەرگرە. ئایا ئەو دووانە بریکارن یان سەرۆکن؟ وەسڵی چێشتخانە دەدرێت بەخاوەنی چێشتخانە و بەخشیش دەدرێت بە شاگرد. پسوولە دەدرێت بەدەوڵەت و بەرتیل دەدرێت بەئەفسەری پۆلیس. فەرمانبەر و بریکاری فرۆشتن و موشتەری دەتوانن پارە بدەن بەئاژانس. سەرۆک دیاری جەژنی لەدایک بوونی مەسیح و جەژنانە دەدات بەفەرمانبەر، نوێنەرانی فرۆشتنیش دیاری دەبەخشن بەبریکارەکانی کڕین و موشتەریەکانیش بەخشیش دەدەن بەو کەسانەی کە خزمەتگوزاری باش پێشکەش دەکەن. بەڵام هەندێ خەڵک هەن ئەرکیان هەیە لە نێو کەرتی حکومیدا، یاخود گروپێکی تر کە سەرۆکی باش و وردی هەیە. بۆ نموونە، سیاسەتمەداران وەسف دەکرێن وەک نوێنەرانی بەرژەوەندییە گشتییەکان یاخود نوێنەری ئەوانەن کە هەڵیانبژاردوون. هەرچۆنێک بێت دەسەڵاتێکی لە بەردەستە. ئارەزووی دووبارە هەڵبژاردنەوە شتێکە، بەڵام کەس هەمیشە ڕێکەوتی لابەلا قەدەغە ناکات. جار بەجار هەر بای خۆی لێ دەدات! لە بەرئەوەی سیستەمی quid pro quo

زۆرجار سیستەمێکی نادیار و شاراوەیە، ئەوانەی کە بەم کارە هەڵدەستن دەڵێن ئێمە دیاری دەبەخشین، بەڵام ئەوانی تر ئەم قسەیە ڕەت دەکەنەوە.

| | سیستەمی (من کارێکت بۆ دەکەم، تۆش لە بەرابەر ئەو کارەدا کارێکم بۆ بکە) | سیستەمی (من کارێکت بۆ دەکەم، تۆش لە بەرابەر ئەو کارەدا کارێکم بۆ بکە) شاراوە و نادیارە |
|---|---|---|
| پارە بەخشین بەبەڕێوەبەر (بەرپرس) | نرخ | دیاری |
| پارە بەخشین بەبریکار یا فەرمانبەر | بەرتیل | بەخشیش |

خشتەی ژمارە (١)
پارە بەخشین لە لایەن کڕیار و فرۆشیار

گەر جەخت تەنها لە سەر ئەو دوو شێوازە بکەینەوە ئەوا وجوودی سیستەمی "quid pro quo"و هەبوونی یان نەبوونی بریکار ئەو چوار پۆلەی نێو خشتەی ژمارە یەک پێک دەهێنن کە بریتین لە ( بەرتیل و بەخشیش و دیاری و نرخی بازاڕ). هەرچەندە خشتەکە زاراوەی وەک " بەرتیل" یاخود " دیاری" بەکارهێناوە کەچی خشتەکە ئەو پارە بەخشینانەی ڕوون کردۆتەوە کە تەنها لە ڕووی پەیوەندی بەوەکیل و هەبوونی سیستەمی "quid pro quo" ئەو پارەیە دەبەخشرێت. هەتا گەر هیچ جۆرە بازرگانییەکی دیار نەیەتە نێو مەیدانەوە ئەوا ڕەنگە هەڵسوکەوتێکی دوو سەرە ( واتە من بۆ تۆ و تۆش بۆ من) بەشێوەیەکی دیار دێتە ئاراوە.

دیارییەکان جیاوازن لە نرخ، ئەمەش لە بەر نەبوونی سیستەمی "quo quid pro". بەڵام ڕەنگە پردی پتەوتر هەبێت لە نێوان دیارییەکان و هەڵسوکەوتی سوودمەند. زانکۆیەک دەست بەکۆرسێکی پرۆفیشناڵ دەکات تاوەکو سەرنجی بەخشەران و خێرخوازان ڕابکێشێت، هەروەها منداڵێک هەرچی لە سەریەتی بەباشترین شێوە



ئەنجامی دەدات بۆ ئەوەی سەرنجی دایک و باوکی بۆ لای خۆی کێش بکات و دیاری پێ ببەخشن. لەگەڵ ئەوەشدا، گەر دیارییەکان پێک هاتبن لە شت نەک پاداشت بن بەپارە. ڕەنگە سوودێکی دەروونییان هەبێت لە ڕووی سۆزەوە، یاخود هەستی ڕازی بوون بەژیانێکی ئەخلاقی و پابەند بوون بەو ژیانەوە، بەڵام هیچ دەسکەوتێکی بەردەستی نەبێت. هەندێ لە دیارییەکان ئازاری بەخشەر دەدەن پێیان دەڵێن " خود قوربانی"، هەروەک کاتێ یەکێک قوربانییەکان بەسەر ئەندامانی خێزانێک دەسەپێنێت، یاخود یەکێک ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی بۆ کەسێکی دیکە یان بۆ چارەسەر کردنی کێشەیەک. گەر ئەو دیارییانەی لە لایەن تاکەوە دەبەخشرێن بەو ڕادەیە گەورە بوون کە کاریگەری هەبێت لە سەر هەڵسوکەوتی وەرگر، ئەوا سیستەمی "quid pro quo" سیستەمێکی دیار و ئاشکرایە. ئەمەش بۆ گەلێ دیاری بۆ ئەندامانی خێزان ڕاست دەبێت هەروەها ڕاستیشە بۆ هەندێ بەخشەری گەورە بەمەبەستی خێر و چاکە. لەو حاڵەتەدا، جیاوازییەکی کەم لە ڕووی کارەوە هەیە لە نێوان ئەو دیارییانەی دەبەخشرێن بۆ ئامانجی زیاتری ڕاگەیەنراو و هەروەها ئەو دیاریانەشی کە دەبەخشرێن بەپێی چەند مەرجێک تا ئەو ئامانجانە بێنە دی. گەر دیاری مەرجی حاڵەتێکی بەزۆری دروست بکات ئەوا زیاتر دەچێتە قالبی فرۆشتن جگە لەو سوودەی کە بەخشراوە لە بەرابەری دەبێ شتێک هەبێت کە بەقەد مەبەستی خێرەکە بێت. ئەم جۆرە دیارییانە دەچنە نێو خانەی نرخەوە.

لە ڕووی پێوەرەکانی شیکردنەوەی ئابوورییەوە، دیارییەکان نزیکتر دەبنەوە لە نرخ هەروەک تەرازووەکە بەلای خواردا دەبەن لە دیارییەوە بۆ ڕێکخراو و سەنتەرە خێرییەکان، وەک دیاری بۆ کەسی پێویست بەڵام نادیار و نەناسراو بێت، دیاری بۆ خزم و دۆستان، دیاری بۆ ئەو خەڵکانەی کە مەنسەبیان هەیەو بەنیازی سوودی لێ وەرگری. بەڵام زانستی ئابووری تەنها بەشێکە لە باسەکە. عیلاقاتی شەخسی لە نێوان بەخشەر و وەرگر، یاخود کڕیار و فرۆشیار بنچینەیەکی گرینگی هەر مامەڵەیەکە کە بەهایەکی جەوهەری سەربەخۆی هەیە بۆ ڕۆڵی هەر لایەکیان لە ڕێکخستنی مامەڵەکە.

ئێستا با وادابنێین پەیوەندی دوو بریکار لە سەر مێزێکدا بەدیار کەوت. بەگشتی بریکارەکان پارە لە بەڕێوەبەر یان سەرۆکیان وەردەگرن نەک لە لایەن کەسێکی

دەرەوە وەک موشتەری یان بریکاری فرۆشتن. سەرۆک دەبێ سیستەمێک دابنێ بۆ پاداشت و چاودێریکردن بەجۆرێک کە پاڵنەرێک بدات بەبریکار تا کارەکەی بەتەواوی جێبەجێ بکات. زۆربەی ئەو گفتوگۆیانەی لە سەر سوودەکانی پاداشتدا دەکرێن کە تەمبەڵی و خۆدزینەوە لە کار کێشەی سەرەکین نەوەک بەرتیل لە لایەن لایەنی سێیەمەوە. پەیوەندییەکی دوو لایەنە هەیە لە نێوان بەڕێوەبەر و بریکار کە کار دەکەن لە سەر ئەو هەلومەرجانەی لە باکگراوندی هەریەکەیان هەیە. هەندێ لە پسپۆران پەنایان بردۆتە بەر لایەنی سێیەم بۆ شیکردنەوەی گەندەڵی. بەپێی بۆچوونی هەندێ لە ئابووری ناسان بەرتیل لە پێناو ئەو خزمەتە دەدرێت کە سوودی هەبێت. ئەو جۆرە بەرتیلانە بەنرخ دەچن. بەڵام، هەروەکو لە بەشی پێشتر باسم کرد، ئەمە تێڕوانینێکی زۆر سنووردراوی بەرتیلە بۆ ئەو بریکارانەی کە دەتوانن زنجیرەیەک کاریگەری چەواشەکاریان هەبێت لە سەر چالاکی حکومەت و کەرتی تایبەت.

بەرتیلی گشتگیر ئەوە دەخاتە ڕوو کە پێکهاتەی پەیوەندی ئاژانسەکانی کۆمەڵگا زۆر نەشیاو و نابەجێیە. گەر بەشێوەیەکی گشتی موشتەری بەرتیل بدات بەبریکار، کەواتە کارێکی باشتر دەبێت گەر موشتەری بریکار بەکرێ بگرێت بۆ ئەوەی مامەڵە لەگەڵ بەڕێوەبەرە کۆنەکەی بکات. بۆ نموونە، گریمان کۆمپانیایەکی سەیارە، چاکردنەوەی سەیارە بەبەلاش دەگرێتە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوانەی کە سەیارە لەو کۆمپانیایە دەکڕن. لە کردەدا، موشتەری بەپەرۆشە بۆ چاکردنەوەیەکی چاک و خێرا، بۆیە هەڵدەسێت بەرتیل دەدات بەوەستا تا کارێکی باشی بۆ بکات و خێراش بەڕێی بکات. ئەو واقیعەی کە تیایدا موشتەری ببێتە چاودێرێک لە سەر وەستا باشترە لەوەی کۆمپانیای سەیارەکە خۆی پێشنیاری ئەوە دەکات کە خزمەتی چاک کردنەوەکە باشتر دەبێت بەهۆی گرێبەستێک لە نێوان موشتەری و وەستای فیتەر لەوەی گرێبەستێک لە نێوان وەستای فیتەر و کۆمپانیاکەدا هەبێت. سەرەڕای ئەم پاڵنەرە بۆ بەرتیلی بازرگانی، کۆمپانیاکە ڕەنگە بەردەوام بێت لە چاککردنەوەی سەیارە وەک بەشێک کە لە نێو زەمانەکەدا هاتووە. زەمان پێگەی کۆمپانیاکە پتەوتر دەکات بەهۆی کەمکردنەوەی ئەو مەترسییەی لە لایەن موشتەریەکانەوە دروست دەبێت، بەڵام وەک هەموو سیاسەتەکانی تری زەمان، چاودێری پۆستەی پێشوو دروست دەکەن.



کێشەی هاوشێوەی ئەمانە لە کارگە خزمەتگوزارییە پرۆفێشناڵەکانیش سەرهەڵدەدەن کاتێ موشتەری ئەزموون لەوانی تر دەکرێت. دەتوانن حوکم بەن بەسەر بەرهەم و تەندروستی باش و پاداشتی زەرەرێکی گەورە لە سکاڵایەک، بەڵام ناتوانن ڕاستەوخۆ چاودێری جۆری پشک بوونەکە بکەن. ئایا پرۆفێشناڵێک بەکرێ بگرین باشترە یان ڕاستەوخۆ بڕێکی سافی لە پارە بدەیت بەڕێکخراوێکی گەورەی وەک کۆمپانیایەکی زەمان کە دواجار چاودێری پرۆفێشناڵەکان و قەرەبوو کردنەوە بکات؟ ئایا دەبێ سکاڵاکانی کۆی گشتی فرۆشتن بۆ پارێزەران واڵا بکرێت، بەمەش ئایا کێشەی سەرەکی ئاژانسەکە پێکەوە بنبڕ دەکرێت؟ ئایا دەبێ دەوڵەت لە هەموو حاڵەتەکاندا پشتگیری خزمەتگوزارییە یاساییەکان بکات؟

بۆ تێگەیشتن لە زەحمەتی دواین ئەگەر، گریمان دەوڵەت پارێزەر بەبەلاش دابین دەکات بۆ هەرکەسێک کە سکاڵایەک دەنووسێت و کرێیەکی جێگیر دەدات بەپارێزەران. لەوەش زیاتر گریمان بکەین گەلێ لە کڕیارەکان بەنهێنی پارە دەدەن بەپارێزەرەکانیان تا کارێکی باشتر و گەورەتر بکەن. گەر ئەم جۆرە بەرتیلەی بازرگانی شتێکی گشتی بێت، ئەوا ئەوە دەگەیەنێت کە فرۆشتنی خزمەتگوزاری یاسایی دەبێ تایبەت بکرێت بەبەرنامەیەکی پشتگیری کردن بۆ هەژاران. پێچەوانەکەشی ئەوە دەسەلمێنێت کە لایەنەکانی سکاڵایەک پارە دەدەن بەدادوەر بۆ ئەوەی کارەکەیان بۆ بڕوێنێت، مانای ئەوەش ناگەیەنێت کە یاسا بێت ئەو پارەدانە بخاتە چوارچێوەی یاساوە. ئەو جۆرە پارەدانە لە فیکرە و جەوهەری حوکمی یاسا لادەدەن. دادوەر بریکاری هیچ لایەنێک نییە بەڵام ئەوەی لە سەریەتی جێبەجێ کردنی بنەما گشتییەکانی یاسایە و دەبێ پابەند بێت. ئەمە لە بەرژەوەندی ئەوانەیە کە بۆ ماوەیەکی زۆر دادگا بەکار دەهێنن.

لە کەرتی تایبەتیدا، ڕێکخستنی وەکالەتێک چارەسەرێکی دەسبەجێیە بۆ کێشەی پاڵنەری بریکارەکان. دوا فرۆشیارەکان بازرگانە بێ لایەنەکانن کە هەڵسوکەوتیان کەوتۆتە ژێر گرێبەستێکی بەوەکالەت. گەر بەڕێوەبەر، لەم حاڵەتەش گەر بریکار، قازانج لە فرۆشیاران بکات کاتێ، لەم حاڵەتەدا بریکار ڕەچاوی بەرژەوەندی شەخسی خۆی بکات لە فرۆشتنی بەرهەمدا، ئەوا ڕەنگە ئەو جۆرە ڕێکخستنانە مانایەک بدەن بەدەستەوە. هەمیشە بریکارەکان قازانج لە دابینکردنی خزمەتگواریدا

دەکەن نەوەک لە وەرگرتنی بەرتیل بۆ هەمان شت. ئەم ئیختیارەش هەمیشە بۆ حکومەت بەردەست نییە. خزمەتگوزاری پارکە نەتەوەیییەکان دەتوانێت گرێبەست لەگەڵ ئەو کۆمپانیانە ببەستێت کە دەتوانن خواردن و شوێنی حەوانەوە دابین بکەن. دەسەڵاتێکی حکومی کە یەکەی نیشتەجێبوون دابین دەکات ناتوانێت هەمان ئەو کارە بکات تاوەکو گرێبەستێکی ئاڵۆز نەنووسێت بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوەی کە ئامانجەکە هاتۆتە دی کە دابینکردنی پەناگەیە بۆ کەسی پێویست و هەژار.

دەوڵەت کەموکوڕی هەیە لە دیارکردنی ئاسانکاری ڕێکخراوەیی و توانای دیاری بکات بۆ دانپیانانی پەیوەندی ئاژانسەکە. حکومەت بریکار بەکار دەهێنێت بۆ ئەو شوێنەی کە کۆمپانیا تایبەتەکان خزمەتگوزاری خۆیان دەفرۆشن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. بەپێچەوانەوە، کەرتی حکومی گرێبەست بەکار دەهێنێت بۆ کۆمپانیا زەبەلاحە گەورەکان ئەمەش لەبەرئەوەی چاودێریکردنی کۆمپانیایەکی وا زەبەلاح زەحمەتە. هەندێ تایبەتمەندێتی ئەو کارە زەحمەتانە ڕاست دەکاتەوە بەڵام چاوێکی حکومەت هەر پێوستە بۆ سروشتی تایبەتی خزمەتگوزاریەکانی حکومەت. کارە گشتییە ڕەواکان ناکرێت بەهۆی سروشتیانەوە ڕێک بخرێن وەک بازاڕە تایبەتەکان. ئەم واقیعەش ئەوە دەردەخات کە هەموو پاڵنەرەکانی گەندەڵی لە بەرنامە حکومیەکاندا ناتوانرێت بنبڕ بکرێت.

لە حاڵەتی بەخشیشدا، سیستەمی""quid pro quo (من کارێک دەکەم بۆ تۆ، تۆش لە بەرابەردا دەبێ کارێکی تر بۆ من بکەی) شاراوەیە. هەروەها خزمەتەکە عادەتەن کراوە پێش ئەوەی بەخشیشەکە بدرێت. بەخشیشەکانیش بەڕووی یاساوە ئارەزوومەندانەن و بەشێوەیەکی نارەسمی دەدرێت و بڕەکە دیاری نەکراوە و جۆراوجۆرە و هەڕەمەکییە. بەخشیش ڕێگە بەموشتەری دەدات کارەکەی بەڕێوەبچێت و بڕیار بدرێت کە ئەو شایەنی ئەو کارەیە ئەمەش لە کاتێکدا دەدرێت کاتێ بازرگانەکان لە لێواری ئەوەن ئایا خزمەتەگوزاریەکەیان پەسەند دەکرێت یان نا. گەر موشتەریەکان چاودێری باشتر بن لەوەی بەڕێوەبەرەکان ئەوا بەخشیش کاری خۆی دەکات. بەپێچەوانەوەش گەر ئیدارە بتوانێت خزمەتگوزاریەکی باش بەرهەم بێنێت لە مەڕ ئاستی بەرزی فرۆشتنی تاک، ئەوا دەتوانێت خۆی پاداشت دابین بکات. بۆ نموونە، چێشتخانەیەک ڕەنگە پاداشت بدات بەشاگردەکانی بەپێی



فرۆشتنی جەمەکان، لێرەدا ئەم پاداشتە دەبێتە بەخشیش. بەڵام بەناوی پاداشت ئالێرەدا کاریگەری کەمتر دەبێت. گەر ناوی پاداشتی لێ بنرێت ئەوا مەبەستی خاوەنەکە تەنها بۆ ئەوەیە شاگردەکە هەست بەکەمی نەکات کاتێ خزمەتی خەڵک دەکات. تێکەڵ کردنی قەبارە و جۆرایەتی پادشت کاریگەری باشترە، هەروەها ڕێگە بەموشتەریەکان دەدات کە ڕاستەوخۆ پارە بدەن بەبریکارەکان لە بەرابەر خزمەتگوزاریەکی باش، ئەمەش تەنها ڕێگایەکە بۆ دەسکەوت. بەڵام خاوەنەکان هەمیشە کەیفیان بەبەخشیش نایەت، گەر بزانن بریکارەکان جیاوازی دەکەن لە نێوان موشتەریەکان بەجۆرێک کە لە داهاتی خاوەنەکە کەم بکاتەوە. بۆ نموونە، بێنە پێش چاوت، شاگردێک وەک فەرمانبەرێکی گەندەڵی گومرگ کە داشکان بکات لە نرخی جەمەکان یاخود جەمێکی زیاتر پێشکەش بکات لە پێناو بەرتیل.

## لێکچوونی بەرتیل و دیاری

بەرتیل و دیاری لێکچوونێکی گرینگیان هەیە. لە هیچ کامیاندا، تاکێکی بێ ئومێد ناچێتە دادگا بۆ داواکردنی پارە یان سووربوون لە سەر بەستنی گرێبەستێکی ڕوون و ئاشکرا. میتۆدی بەدیلی ئەمە هاندانی ئەوانی ترە بۆ ئەوەی حاڵەتی گەندەڵی ئاشکرا بکەن. لە هەندێ حاڵەتدا، ئەو میکانیزمە یاساییانە ڕەنگە کاریگەرتر و هەرزانتر بن لەوانەی لەلای بازرگانەکانی نێو بازاڕەوە دەست دەکەون.

هەندێ میکانیزمی ئاشناو و نافەرمی هەن بۆ سەپاندن وەک متمانە و سومعە و وەرگرتنی بارمتە و ئەرکی دوو لایەنە. لە گەڵێ پێشبڕکێی گرێبەستی ئاساییدا، ئەو میکانیزمانە زۆر حیسابی بۆ دەکرێت. بەڵام دەتوانن ئاسانکاری بۆ گرێبەستی گەندەڵی بکەن. ئەمەش ڕەنگە ململانێیەک بێت لە نێوان کەسی باش و سوودمەندەکان هەروەها لە نێوان دەرەنجامە خراپەکانی کە بەرهەمی دێنن. تاقیکردنەوەیەکی بەخشینی دیاری و بەرتیل یارمەتی یەکێ دەدات لەو پێوەرە سەرنجڕاکێشەکانی هەڵسوکەوت بگات، هەروەها لە هەندێ بارودۆخیشدا، شیاوی و گەشەی ئابووری ئیفلیج دەکات.

## متمانە

گفتوگۆکانی پسپۆرانی ئیتاڵی جەخت دەکەنەوە لەسەر نەبوونی متمانە لە دەوڵەتی ئیتالیا. مامەڵەی تایبەتی موڵک زۆر ڕوودەدات کاتێ دەوڵەت ناتوانێت چارەسەری ئەو حاڵەتە بکات. دەوڵەت سەرنەکەوت لە پێشکەش کردنی میتۆدێکی باوەڕپێکراو بۆ چارەسەر کردنی ڕکابەرێتی و گواستنەوەی موڵکی تایبەت. مافیا وەک بەدیلێک بەکارەکان هەڵدەستێت. چاودێرانی تر سەرهەڵدانی مافیا لە ڕووسیا دەگەڕێننەوە بۆ هەمان هۆی نێو ئیتاڵیا ئەویش خاڵی بێ هێزی دەوڵەتە.

پسپۆری ئیتاڵی " گامبێتا"ووشەی متمانە بەدوو مانا بەکاردەهێنێت. یەکەم، متمانە بەمانای شەرعیەت و لێهاتوویی دەوڵەت دادەنێت. کاتێ خەڵک متمانە بەدەوڵەت ناکات بۆ چارەسەر کردنی ململانێکان بەیەکسانی و بەشێوەیەکی گونجاو، بۆیە بەدوای بەدیلدا دەگەڕێن. ئەم واتایەی متمانە هیچ پەیوەندیەکی نییە بەپەیوەندیە کەسییەکان. پەیوەندیەکان ڕەنگە بەتەواوی بکەوێتە سەر درێژی بازوو و مەچەک ( دەسەلآت). بەهەقیقەت، متمانەی یەکێ بەدەوڵەت بەرزتر دەبێت گەر بەرپرسان کار بەجدی بۆ خەڵکی بکەن. دووەم، خەڵکی متمانە بەیەکتر دەکەن لە سەر بنچینەی پەیوەندیە کەسییەکان و خزمایەتی و بەرژەوەندی بازرگانی و برادەرایەتی. ڕەنگە یەکێک زۆر متمانە بەبرادەرە نزیکەکەی بکات کە لە ڕۆژی تەنگانەدا بەکەڵی بێت، ئەمەش لە بەر ئەوە نییە کە برادەرەکە یاسا بەیەکسانی جێبەجێ دەکات، بەڵکو لە بەرئەوەی بەدڵکی برادەرەکەی دەجووڵێتەوە. گامبێتا جەخت لەوە دەکاتەوە چۆن هەرەسهێنانی متمانە ( کامەیان بێت لەو دوو مانایەی سەرەوە) دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی داوایەک بۆ خزمەتگوزاری تایبەت لە لایەن گروپێک یان کەسێک کە بتپارێزن وەک دروستبوونی مافیا.

بە پێچەوانەوە، من پێ لە سەر ئەوە دادەگرم چۆن جۆری دووەمی متمانە، لە سەر بنچینەی عیلاقاتی شەخسی، زەمینە خۆش دەکات بۆ گەندەڵی و گواستنەوەی خێرخوازی. ئەم شرۆڤەیە باسەکەی گامبێتا تەواو دەکات کە لە سەر ڕێکخستنی ناوەوەی خێزانەکانی مافیایە کە پێویستی بەپشتگیری ئەندامانە بێ ئەوەی سوێند



بخۆن! من باسی تاوانی ڕێکخراو ناکەم بەڵکو باسی ئەوە دەکەم چۆن متمانە و پەیوەندیە کەسییەکان زەمینە خۆش دەکەن بۆ گەندەڵی.

بۆ نموونە، توێژینەوەیەکی چاکسازی "خاک" لە دوو شارۆچکەی نێو بەڕازیل ئەوە دەردەخات کە متمانە دەبێتە هۆی درێژەپێدانی گەندەڵی. لە یەکێک لەو دوو شارەدا ئیدارەی بەرنامەکان داڕێژرایەوە لە بەر پەیوەندیە کەسییەکان لە نێوان بریکارەکانی ئاژانسە جیاجیاکان کە هەموویان نزیک یەکتر دەژیان و هەروەها لە دەرەوەی کاردا برادەرایەتییان هەبوو. لە شارۆچکەی دووەمدا، بەرنامەکە بەشێوەیەکی تۆکمە و وەک خۆی بەڕێوەبرا چونکە بەرپرسان عیلاقاتی شەخسییان بێ هێز بوو، بۆیە بەرپرسێک لە ئاژانسێک حەزی نەدەکرد وەڵامی نارەزایی هاوڵاتییەکی ئاژانسەکەی تر بداتەوە. لە هەندێ حاڵەتدا، یارمەتی خەڵکی مەحەلییان دا تا خۆپیشاندانی فەرمی ساز بکەن.

گەر ئەو میکانیزمانەی بۆ چارەسەر کردنی ململانێکان بەکاردێت کات و پارەی زۆر تێ بچێت ئەوا بەخشینی دیاری و بەرتیل زۆرتر دەبێت. گەر زەمانە یاساییەکان مەحاڵ بن ئەوا متمانە لەو حاڵەتەدا زۆر زۆر گرینگە. بەڵام نەبوونی پاڵپشتێکی یاسایی مانای ئەوەیە کە مامەڵەکان زیاتر دەبن لە ڕێگەی گەندەڵییەوە. ئەو ڕێکەوتنانەی کە دەبێ بەرتیل بدرێت پێش ئەوەی بەرتیل وەرگر کاری خۆی بکات ئەوا ئەمە شتێکی زۆر ترسناکە. ئەو بەرپرسە گەندەڵەی کە سەرکەوتوو نابێت لە پێشکەش کردن، بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو دیاریەی وەری گرتووە واستەیەکی شاراوە بووە و دەبێتە بەرتیلیش گەر پەیوەندییەکان لێ کبترازێن. هەردوو لا ی ڕێکەوتنەکە بەرژەوەندییان هەیە لە شاردنەوە و شێواندنی مانای پارە دان و وەرگرتن لە بەرچاوی جیهانی دەرەوە لە کاتێکدا لە نێوان خۆیاندا تەواو ئاشکرا و مفتەخۆریە. بەرتیل هەمیشە لە پێستی بەخشینی دیارییەوە دەدرێت تا تاوانەکە سووک بکرێت. بەڵام دووبارە بوونەوەی کارەکە زەحمەت دەکات بۆ سووربوون لە سەر ئەوەی کە بەرپرسەکە بەنیازە کارێکی وا بکات.

ئەو دیارییانەی کە دەبێتە هۆی کارکردن بۆ یەکتر و لە بەرژەوەندی یەکتر زۆرترن گەر پەیوەندییەکی بەهێز پێشتر لە نێوان لایەنەکاندا هەبێت جا ئەو پەیوەندییە

خێزانی واته خزم خزمانێ بێت یاخود له ڕێگەی برادەرێتیەوە بێت. بۆیە دیاری زۆرجار دەبەخشرێت بەئەندامانی خێزان نەک هەر تەنها لە بەرئەوەی بەخشەر هەست بەسۆزێکی تایبەت دەکات، بەڵکو لە بەر ئەوەش کە وەرگر پەیوەندییەکی سۆزداری هەیە بەبەخشەرەکە و ڕەنگە زۆر خۆشی بەجێبەجێ کردنی مامەڵەکە بێت لە لایەن خۆیەوە.

لە سەر هەمان شێواز، متمانە گرینگە بۆ ڕێکەوتنی گەندەڵی. بەپێی بۆچوونی گامبێتا، نەبوونی متمانە بەحکومەت دەبێتە هۆی داواکاری خزمەتگوزاری پارێزراوی تایبەت. توانای بونیاتنانی متمانە لە سەر بنچینەی پەیوەندییە کەسییەکان یارمەتی کەمکردنەوەی مەترسییەکانی ئاشکراکردن دەدات. متمانە ئەنجامدانی کار مسۆگەر دەکات کاتێ پارە دان و سیستەمی "من کارێک بۆ تۆ دەکەم تۆش لە بەرابەردا کارێکم بۆ بکە" جیابکرێنەوە لە یەکتر. ڕەنگە بەرپرسێکی حکومی هەموو هەوڵێک بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی سوودێک بگەیەنێت بەخزمەکەی، هەروەها خزمەکەشی خۆی دەهاوێتە سەر چەقۆ بۆ ئەوەی هەموو شتێک بۆ ئەو بەرپرسە بکات. ڕەنگە ئەو کارە بکات نەک هەر تەنها لەبەرئەوەی کە بایەخیان پێ دەدات بەڵکو لە بەر ئەوەش کە ئەوانیش بایەخ بەو دەدەن و وەک کەسێکی نامۆ نابن دواجار گەندەڵییەکانی لێ ئاشکرا بکات یان لە سەر ڕێکەوتنی شتێک لێی تووڕە بێت. ئەم هەستی پشت بەیەکتر بەستنە مەترسی بۆ مفتەخۆر و گەندەڵکار و بۆ هەردوو لای ڕێکەوتنێکی گەندەڵی کەم دەکاتەوە.

بێ گومان، مەترسییەکە ئەوەیە کە لە لێکترازانی ئەندامانی خێزان مەترسیدارترە. پشت بەستن بەخزم خزمانێ دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرچی کاری گەندەڵی هەیە لە ژێرەوە بۆ یەکتری داپۆشن. بەڕێوەبەرێک حەز دەکات ئەوەی لە چوار دەوری کۆدەبێتەوە هەمووی وەک خۆی دز و گەندەڵ و موفتەخۆر بێت تاوەکو بەهیچ شێوەیەک پۆخڵەواتی ئاشکرا نەکەن. بەڵام، لە کەش و هەوایەکی گەندەڵدا، لەو شوێنەی کە یاسا لە بەستنی گرێبەست جێبەجێ نابێت، هیچ شتێک باشتر نییە لە برادەر و یان ئەندامانی خێزان. گەر مەترسی متمانە بگۆڕێت بۆ تووڕەیی ئەوا ئەمەش بەشێکە لە گومانی ڕێکەوتنە نهێنی و نایاساییەکان.



## ناوبانگ (سومعە)

هەروەک لە بازاڕی یاساییدا، ئەو ناوبانگەی لە کاتی دووبارە بوونەوە دروست دەبێت دەکرێت ببێت بە بەدیلێک هەم بۆ یاسا و هەمیش بۆ متمانەی پەیوەندیە کەسییەکان. ناوبانگ لە بەزەیی و پاداشتی هەرکەسێک کە یارمەتیت دەدات ئەوا دەبێتە هۆی هاندانی ئەوانی تر کارت بۆ بکەن لە پێناو پاداشتدا. ناوبانگ لە بریندار کردنی ئەوانی کەموکوڕیان هەیە لە کارەکانیان ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانی تر کە تۆ کاریان لەگەڵ دەکەی بەباشترین شێوە کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، بەو جۆرەی کە تۆ دەتەوێت. هەروەها هانی ئەو کەسانە نادات کە دەیانەوێت گرێبەست لەگەڵ تۆدا ببەستن بۆ یەکەم جار. ناوبانگ لە سەر هەردوولا هەم بەخشینی دیاری و هەمیش مامەڵەی بەرتیلدان و وەرگرتن کار دەکات. ناوبانگی ئەو کەسەی کە وەڵامی دووەم دەداتەوە گرینگە بۆ ئەوەی کە یەکەم جار دەستپێشخەری دەکەن. بۆ نموونە، خێرخوازان زیاتر حەز بەوە دەکەن پارە بەن بەزانکۆ و یارمەتی قوتابی زانکۆ بدەن تاوەکو ناوبانگ بەم شێوەیە پەیدا بکەن کە ئەوان یارمەتی ئاستێکی بەرزیان داوە. گەر منداڵ دایک و باوکی خۆی بەوە ناسیبێت کە گەر گوێڕایەڵ و ئاقڵ بن ئەوا پاداشت وەردەگرن بۆیە هەمیشە هەوڵ دەدەن بەگوێی دایک و باوکیان بکەن لە هەموو ڕوویێکەوە. بەرتیل زۆر بەئاسانی ڕێک دەخرێت گەر بەرتیلدەران سەرنجی ئەزموونی ڕابردووی بەرپرسی گەندەڵ بدەن و هەروەها ئەو بەرپرسانە ڕوانگەیەکی جێگیر و درێژخایەنیان هەیە لە سەر کاری فەرمانبەرێتی و پۆستەکەی خۆیان. هەندێ جار ناوبانگی کەسی یەکەم گرینگە. داواکاری چەواشەکار بۆ پارەدان ڕەنگە زووتر پەسەند بکرێت گەر چەواشەکار بەوە ناوبانگی دەرکرد بێت کە دەستوبرد دەکات لە جێبەجێ کردنی کارەکانی. بۆ نموونە، پۆلیس دەتوانێت قەبارەی بەرتیل گەورە بکات لە ڕێگەی هەڕەشە کردن لەو کەسانەی کە پارە نادەن یاخود بەهەڵە خەڵکی ڕاستگۆ بگرن لە بەرابەر تاوانێک وەک ئەوەی تۆمەتباریان گوایە بەرتیلی نایاساییان داوە یان وەرگرتووە.

ناشەرعی بوونی بەرتیل و شەرعیەتی دیاری پەیدا کردنی ناوبانگ لە جاری

یەکەمدا زەحمەتتر دەکات لە چاوی جارەکانی تر. بەخشینی دیاری دەکرێت زۆر بەئاشکرا بێت تاوەکو دەچێتە سیستەمی من و تۆ بۆ یەکتری و بۆ خزمەتی بەرژەوەندی یەکتر کار دەکەین. بەخشەران دەتوانن دیاری بەئاشکرا ڕابگەیەنن بەهیوای بەدەست هێنانی ناوبانگی بەزەیی. ڕێکخراوە خێرخوازیەکان ڕەنگە لیستی بەخشەران بڵاو بکەنەوە تاوەکو ئەوانی تریش قایل بکەن بەو کارە هەڵسن. توانای سەرنج ڕاکێشانی دیاری لە خەڵکی دیارەوە یارمەتی پەیداکردنی ڕێز دەدات بۆ ڕێکخراوەکە. بەکورتی، چ بەخشەر چ خێرخواز بەرژەوەندییەکی ناوبانگیان هەیە لە ڕاگەیاندنی دیاریدا، هەردووکیشیان دەتوانن ببن بەبەخێوکەری یەکتر. ڕێکخراوێکی خێرخوازی ڕێزدار دیاری دەبەخشێت تا چاکەیەک بدات بەبەخشەر، هەروەها ناوبانگی بەخشەری ڕابردووش دەبێتە هەوێنی سەرنجڕاکێشانی ئەوانی تر بۆ ئەوەی ئەوانیش دیاری ببەخشن.

دیاری یا بەخشیش بۆ خزمەتی دابینکەران ڕەنگە جۆرە ناوبانگێکی جیای هەبێت. گریمان نرخی ڕەسمی نرخێکی یەکگرتووە، بەڵام وەکیلەکان دەتوانن داشکاندن لەو نرخە بکەنەوە بۆ موشتەری تایبەت کە سوودی بۆیان هەبێت. گەر ئەم کارەش بکەن، ئەوانی تر فێری ئەو داشکانە دەبن لە کاتی کارکردندا. دواجار دیاری لە هەندێ موشتەریدا ڕەنگە هانی ئەوانی تریش بدات بیبەخشن. وەک ئەوانەی سەیارەیان لە نێو گەراجێکدا ڕادەگرن بەئاشکرا خاوەن گەراجەکە لیستێک دەکات بۆ هەموو خاوەن سەیارەکان تا مانگانە دیاری ببەخشن. ئەم دیاری بەخشینە زۆر گرینگ دەبێت لە کاتێکدا قەیرانی بێ گەراجی و گەراجی خراپ هەبێت، ئیتر ئەوانەی پێشتر مانگانە دیاری دەبەخشن هەمیشە سەیارەیان پارێزارو و سەلامەتە. بەم پێیەش ئەوانەی سەیارە ڕادەگرن هەمیشە بەوانە دەچن کە تیۆریستەکانی یاریکردن ناویان لێ ناون " جەنگی دوژمنەکان". نەک هەر تەنها پارە دەدەن بۆ ناوبانگی ئەو گەراجە بەڵکو بۆ ئەوەی سەیارەکانیان بەباشی بپارێزرێت. خاوەن گەراجەکان ڕەنگە شێوازێکی تر بەکار بێنن ئەویش نرخی گرانتر بۆ ئەو شوێنانە دابنێن کە زۆر سەلامەتتر و باشترن بۆ ڕاگرتنی سەیارە لە نێو گەراجەکە. بەڵام گەر خاوەن سەیارەکان دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان هەبێت ئەوا مانای ئەوەیە کە خاوەن گەراجەکان ناتوانن ئەو دەسکەوتە بەدەست بێنن.



هەندێ بازاڕی گەندەڵ بەهەمان شێوەی ئەو گەراجە کارەکان دەبەن بەڕێوە، بەڵام کاریگەری هەندێ کەمترە چونکە بەرتیلەکە ناکرێت لە ڕێگەی پۆستەوە بێت! ئەمەش سوودێکی دیاریەکانە بەسەر بەرتیلەوە. هەڵمەتی بەشداری کردن زۆرجار هێڵێکی تەسک لە نێوان دیاری و بەرتیل دەکێشن و هەرجارەو بەلایەکدا خواری دەکەنەوە بەپشت بەستن بەیاسا داراییەکان. بەشداربووە جدیەکان ڕەنگە زۆرجار شت ببەخشن گەر بێت و ئاگادار بکرێنەوە لە بارەی ئەوانەی دیکە کە شت دەبەشنەوە. ئەگەری زۆربوونی دیاری بەخشین دەبێتە هۆی ئەوەی کە سیاسەتمەتداران لیستێکی بەخشەران بڵاو بکەنەوە تەنانەت گەر یاسا داوای ئەو لیستەی نەکردبێت تا سەرنجی ئەوانی تری پێ کێش بکەن. کاریگەری ئەم جۆرە لیستانە، دەوەستێتە سەر پاڵنەری بەشداربووانەوە. گەر تەنها پێ داگرن لە سەر هەڵبژاردنی کەسێکی تایبەت ئەوا زانیاری لە سەر بەزەیی ئەوانی تر دەبێتە هۆی خاو کردنەوەی دیاری بەخشەکانی تر. بەپێچەوانەوە، گەر بەشداربووان بەدوای سوودێکدا بەگەڕێن لە سەر حیسابی ڕکابەرەکانیان ئەوا هەواڵی دیاری بەخشین لە لایەن ڕکابەرەکانیان هانیان دەدات دیاری زیاتر ببەخشن.

هەرچەند یاساکانی حوکمکردنی بەشدارییە تایبەتییەکان و پێناسکردنی بەرتیل زەحمەتتر بێت، ئەوەندە پەیداکردنی ناوبانگ زەحمەتتر دەبێت. بەرتیلدەر و بەرتیل وەرگر دەتوانن تەنها سەر زارەکی ناوبانگ پەیدا بکەن لە پێناو تاکتیکی بەهێز، بەڵام هەروەها بەشێوەیەک خۆیان دەردەخەن کە ڕێکەوتنەکان جێبەجێ دەکەن و خەبەر لە گەندەڵکاران نادەن. بێ گومان بۆ قازانج و بەرژەوەندی خۆشیان هەروا دەکەن. لە بەرئەوەی بەڵگەی ڕەسمی و ئیعلانی بەشێوەیەکی یاسایی لە ئارادان، بەرپرسە گەندەڵەکان دەگەڕێن بەدوای ناوەندی تر بۆ پەیوەندیکردن. زەحمەتی پەیداکردنی ناوبانگ ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی تەنها مامەڵە لەگەڵ لایەنە ناسراوەکان بکەن. سنووردار کردنی ژمارەی ئەو خەڵکانەی کە بەرتیل دەدەن دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو ترسەی نەوەک خەڵکی تر بتناسن. دانانی پەیوەندی بۆ کاری گەندەڵی لەگەڵ خەڵکی نوێ و نەناسراو مەترسیدارە چونکە ئەوەی یەکەم جاریەتی دەیەوێت بەرتیل وەرگرێت ئەوا دەترسێت لەوانەی کە لایەنی پەیوەندار ئاگادار

دەکەنەوە لە کاری نایاسایی، لەوانەشە هەر لەگەڵیان ڕێک بکەوێت. ناسین لە لایەن لایەنی سێیەمەوە گرینگە، هەروەها لە هەندێ حاڵەتدا زمانی مامەڵەکردن شاراوە و نادیارە.

سیستەمی جێگیری گەندەڵی ئاسانتر کاری خۆی دەکات لە نێو بازاڕە بچووک و مەحەلییەکان نەک لە نێو بازاڕە نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکان. ئەوەی پێویستە بۆ ئەو سیستەمە بۆ ئەوەی هەر بەنهێنی کار بکات ژمارەیەکی سنووردار و پێکەوە ڕێک بکەون لە ژێرەوە کار بکەن. بۆیە گەندەڵی هەر بەردەوام و درێژ خایەن دەبێت لەو بازاڕانەی کە چەند ناسیاوێکی یەکتر لە نزیک یەکەوە کار دەکەن، دواجار ئەمانە مامەڵە لەگەڵ حکومەتیش دەکەن بەبەردەوام، هەروەها هیچ جێگەیەکی تریان نییە کاری لێ بکەن. لە زۆر شاردا کۆمپانیای بیناسازی و زبڵڕێژ و شت فرۆش لە بازاڕەکانی نێو شاردا دەبێ بەرتیل بدەن بەبەرپرسانی ئەو شارە تاوەکو ڕێگەیان پێ بدرێت کار بەدەست بێن و کار بکەن. لە هەندێ ناوچەی جیهاندا، بەرپرسە مەحەلییەکان دەستیان لەگەڵ دزو جەردە و سەردەستەکاندا هەیە کە هەمیشە بەرتیل و گەندەڵی و توندوتیژی پیادە دەکەن. ئەو جۆرە کارانەش وەها بەئاسانی بازاڕ جێ ناهێڵن و تا بەرەو بازاڕ و کۆمەڵگایەکی کەم گەندەڵتر بچن لە بەرئەوەی شوانی مەڕەکان خۆی گورگە چۆن مەڕ دەمێنێتەوە!

پەیوەندی گەندەڵ ئاسانتر دەبێت گەر گروپی بچووک کار لەگەڵ یەکتر بکەن لە شوێنی جیاجیادا. ناوبانگ بۆ ڕاستگۆیی و بەرپرسیارێتی یاخود توندوتیژی بەئاسانی وەدەست دێت لە ڕێگەی دیاری بەخشین و بەرتیل بەخشین لە ژێرەوە. متمانە پێویست نییە چونکە هەموویان بەبەردەوامی لە یەکتری دەپێچنەوە. هەرچەندە ئەو جۆرە تۆڕانە لە هەموو شوێنێک و لە هەموو حکومەتێکدا هەن، کەچی نوخبەی بچووک هەن ڕەنگە کۆنترۆڵی قەوارەیەکی فراوانتر بکەن. ناوبانگ لەگەڵ ئەو جۆرە گروپانە یان زۆر باشتر پەیدا دەبێت یان زۆر خراپتر.

تێچووی پەیداکردنی ناوبانگ کەمترە گەر بەرتیل بەشێوەیەکی بەرفراوان پەسەند بکرێت و سەپاندنی یاسا وجوودی نەبێت. بەرتیل ڕێگایەکی باشترە بۆ گەندەڵکاران تا سوود و قازانج لە نێو کەرتی تایبەتییەوە بگوازنەوە بۆ بەرپرسەکانی کەرتی



حکومی. ئەوا لەم حاڵەتەشدا، گەندەڵی کرمێکە سەر لە هەناوی وڵات دەنێت و وردە وردە بەرەو وشک بوونی دەبات. لە جیهانێکی ڕاستگۆدا، بەرپرسی کەرتی تایبەت هەموو هەوڵێک دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی هەموو بەرنامەکانی کەرتی حکومی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆرخ بکات. لە جیهانێکی پڕ گەندەڵیدا، ئەو بەرپرسانە ناگەڕێن بەدوای سوود و قازانجی یاسایی چونکە دەسکەوتە قۆرخکارییەکان لە لایەن کەرتی حکومییەوە وەبەردێت لە قۆناغی جێبەجێ کردنی کارەکاندا. پەیوەندییەکی تەقدیری هەیە لە نێوان پاڵنەری سوود و دابەشکردنی ئەو سوودانە. لە وڵاتانی کەم گەندەڵیدا، بەرپرسی تایبەت هەوڵ دەدات دەوڵەت بەکار بهێنێت بۆ بەدەستهێنانی سوود بۆ خۆیان. لە وڵاتانی زۆر گەندەڵدا، بەرپرسە گشتییەکان دەوڵەت بەکار دەهێنن بۆ بەدەستهێنانی سوود لە کەرتی تایبەت و کۆمپانیا زەبەلاحەکاندا. ڕەنگە ئەم کارەش بکەن لە ڕێگەی قۆرخکردنەکان یان لە ڕێگەی سەپاندنی پێو و دانگەکان. گەر ئەوەش نەبێت، ڕەنگە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کەرتی تایبەت ڕێک بکەون بۆ بەدەستهێنانی سوود لە سەرچاوە ناوخۆ و دەرەکییەکان کە دواجار بەش دەکرێت لە نێوان بەرپرسە گەندەڵە حکومییەکان و هاوپەیمانەکانیان لە نێو کەرتی تایبەتدا.

## ناوبانگی ڕەهنکردن

ڕەهنکردن ڕێگەیەکی ئاشنایە بۆ مسۆگەرکردنی ئەنجامدانی کار. واقیعەکە بەشێوەیەکی گشتی کەمتر کاریگەرە لە چاو ئەو واقیعەی کە شازادەیەک لە نێو تاوەرێکدا بپارێزرێت، بەڵام هەردوو واقیع هەمان بنەمایان هەیە. بەپێی کاتێکی دیاریکراودا و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لایەنی یەکەم داوا لە لایەنی دووەم دەکات بۆ دانانی شتێکی بەهادار لە ڕەهن. ڕەهنکردن باشترین ڕێگایە گەر لایەنەکان داوا لە دادگایەکی یەکسان و ڕاستگۆ بکەن تا بڕیار لە سەر پرسە گوماندارەکان بدات.

دروستکردنی ئەو جۆرە دادگایانە زۆر زەحمەتە بۆ کارێکی گەندەڵ. بەڵام بەرتیلدان و وەرگرتن ئەگەری ڕەهنکردنێکی تایبەت دروست دەکات. ڕەهنەکە ناوبانگی کەسەکەی دیکەیە. لایەنی یەکەم هەموو کارەکانی لایەنی دووەم بەنهێنی دەپارێزێت. بۆ نموونە، گەر بەرپرسەکان خراپتر سزا بدرێن لە بازرگانەکان، ئەوا

بازرگانەکان بەرتیل دەدەن و هەڕەشەی ئاشکرا کردنی بەرتیل و کاری گەندەڵی دەکەن تاوەکو بەرپرسەکە کاریان ڕایی و مەشی بکات. گەر بەرتیل بۆ سوودی یاسایی ڕۆتینی بدرێت ئەوا وەستاندنی بەدناوبانگی ڕەهن وەرگرتنی بەرپرس زەحمەتترە گەر بێت و کاری گەندەڵی کردبێت. بەگشتی، هەرچەند ئەو زەرەرەی بەبەرتیل دەر و بەرتیل وەرگر دەکەوێت لە کاتی ئاشکرا بووندا گەورە بێت بشاردرێتەوە ئەوەندە هەڕەشەی لەناوبردنی ناوبانگی کەسانی تر کەمتر دەبێتەوە. بەڵام، گەر ناوبانگی بەرتیل دەر پێشتر لە نابرا بێت ئەوا دوا جار کارە گەندەڵیەکانی خۆشی ئاشکرا دەکات. بۆ نموونە، یەکێک لە ئەندامانی دەستەی قۆرخکردنی ماددە سڕکەرەکان لە کۆڵۆمبیا خۆی چووە لای پۆلیس و ژیانی خۆی لە مەترسی ڕزگار کرد و یارمەتی دەسەڵاتی ویلایەتە یەککرتووەکانیشی دا کە بتوانن لە فایلی تۆمارەکانی بەرتیلی بەرپرسەکانی کۆڵۆمبیەکان بکۆڵنەوە.

ناوبانگی ڕەهنکردن لە بەخشینی شتی خێرخوازیشدا ڕوودەدات. ڕەنگە بەخشەرێک پارەی خۆی بۆ زانکۆیەک ڕاگرێت بەهۆی هەڕەشەی هەڵمەتێکی بڵاوکردنەوەی ئەو یارمەتییە بەشێوەیەکی خراپ، ئەمە لە حاڵەتێکدا دیارییەکان پێشێل کرابوون. بەڵام ڕەنگە زانکۆش ئەو هەڕەشەیە نەکات بۆ خراپ بڵاو کردنەوەی چونگە گەر وا بکات ئەوا بەخشەرانی تریش دەڕەونەوە و دیاری نابەخشن بەزانکۆ. لەگەڵ ئەوەشدا، چەند هەنگاوێکی دەوێ بۆ کەمکردنەوەی کاتی ڕێکەوتنەکە، بۆ نموونە، لە ڕێگەی ناونەهێنانی بینایەک تا بەتەواوی بەخشەرەکە بیناکە تەواو دەکات.

## ئەرکی دوو لایەنە

گەلێ لە بازرگانان لە کاتی پێکەوە کارکردنیان ئەرکیان لەسەر یەک هەیە بۆ ماوەیەکی درێژ. هەر بازرگانەو پاڵنەرێکی هەیە لە کاتی ئەوەی وەک بریکارێک کار دەکات بەرپرسیارێتی تەواو دەگرێتە ئەستۆ تاوەکو بتوانێت ئەوەی کە ئێستا کاری لەگەڵ دەکات وەک بریکاری خۆی لە داهاتوودا بۆ کاری تر بەکار بهێنێت. بۆ نموونە، "کارن کلێی" (١٩٩٧)، توێژینەوەی لەسەر بازرگانی کرد لە کالیفۆرنیا لە نێوان



ساڵانی ١٨٣٠ و ١٨٤٨ کاتێ بەناو لە ژێر کۆنترۆڵی مەکسیکدا بوو بەڵام سیستەمی کارکردنی نەبوو بۆ سەپاندنی گرێبەست. چەند بازرگانێکی کەم هەبوو، کاتێ یەکێکیان لە شارێکدا دەژیا پێویستی بەوانی تر دەبوو لە شارەکانی تر. لە بری ناردنە دەرەوەی بریکارەکان، بازرگانانی شارەکانی تری بەکار دەهێنا بۆ ئەنجامدانی کارەکان. مامەڵەی ڕاستەوخۆی نێوانیان پێویست نەبوو. بازرگانی یەکەم وەک بریکارێک بۆ بازرگانی دووەم کاری دەکرد، هەروەها بازرگانی دووەم وەک بریکاری بازرگانی سێیەم کاری دەکرد هی سێیەمیش بۆ بازرگانی یەکەم. ئەم جۆرە ڕێکەوتنانە پشت ئەستوور بوو بەزانیاری ئاڵوێرکردن و پێناوی چاڵاک سەبارەت بەناوبانگی بازرگانان شان بەشانی هەواڵەکان دەربارەی گەیشتن و دەرچوونی کاڵاکان و نرخ و جۆری کاڵاکان.

ئایا چۆن ئەم جۆرە سیستەمی دوو لایەنە لە جیهانێکی گەندەڵدا کار دەکات؟ بۆ ئەوەی کار بکات هەموو بەیەک ئاڕاستەدا ناچن. بەرپرسی یەکەم دەنگ دەدات بەپرۆژەیەک کە دەبێتە هۆی پڕکردنی گیرفانی بەرپرسی دووەم، هەروەها بەرپرسی یەکەمیش پشت دەبەستێت بەبەرپرسی دووەم لە کارێکی لەم جۆرەدا، کەواتە هەردوو لا یارمەتی یەکتریان داو گیرفانی هەردوولاش پڕ بوو. وەزیری نەخشەدانان کۆمپانیایەک هەڵدەبژێرێت کە بەشێکی ئەو کۆمپانیایە هی وەزیری ڕێگاوبانە، هەروەها دواتر، وەزیری ڕێگاوبان پرۆژەی دروستکردنی ڕێگایەکی نوێ دەبەخشێت بەکۆمپانیایەکی گەورە کە وەزیری نەخشەدانان پشکێکی هەیە لەو کۆمپانیایە. لە ئیتاڵیا، کۆمپانیا زەبەلاحەکان کە بەرتیل بەکار دەبەن شتێکی زۆر وەبەردەهێنن لە دروستکردنی پەیوەندی لە ڕێگای کەناڵی شارەوە و کار دەکەن لەگەڵ بەرزترین بەرپرسی بڕیاردەر. ئەم سەرمایەی کە پێکهاتووە لە زانیاری و پەیوەندییە کەسییەکان و متمانە گەنجینەیەکە بۆ کەسی گەندەڵ و بەرپرسی گەندەڵ و ئەو مامەلانەش سنووردار دەکات کە بەگرێبەستی نوێ دەکرێن. هەروەک لەو حاڵەتەی لە لایەن کلێی باس کرا، ئەرکەکان پێویست ناکات دوولایەنە یان یاسایی بێت چونکە گرووپی پەیوەندار بەئاسانی کەم تەرخەمەکان دەستنیشان دەکات و بەئاسانیش لە سوودی داهاتوودا بێبەشیان دەکات.

لەو حاڵەتانەدا، جیاوازی کردن لە نێوان دیاری و بەرتیل زۆر زەحمەتە. سیستەمی "من کارێک بۆ تۆ دەکەم و تۆش لە بەرابەر ئەوەدا کارێک بۆ من بکە" زۆرجار بەهەمان دراو دەدرێت وەک سوودێکی سەرەتایی، هەر هەمان دراویش بۆ دەنگدان لە سەر پسوولەکان و ویستنی گرێبەستەکان دەبێت. گەر بەتەنیا سەیری ئەو حاڵەتە بکەین ئەوا زیاتر بەیارمەتی خزم خزمانێ دەژێت نەک گەندەڵییەکی تەواو. دیارییەک بەخشراوە یان کارێک کراوە ڕەنگە سەیری بکەن وەک کارێکی نەگونجاو. ئەو دەسکەوتەی دەدرێت بەو کەسەی کە کارەکەی کردووە ئاسان نییە دیاری بکرێت. تەنها ناوبانگی ئەو خەڵکەی کاری باش دەکات و یارمەتی تۆیان داوە لە ڕابردوودا پاڵپشتی سیستەمەکە دەکات.

ئەو سیستەمەی لە لایەن کلێی باس کرا هاتە خوارەوە لە کاتی پیشبڕکێی دۆزینەوەی زێڕ و زۆربوونی ژمارەی بازرگانان. ئەمە دەبێتە چارەسەرێک بۆ هەر جۆرە پشت خورانێکی دوو لایەنە. هەرکە ژمارەی یاریزانان زیاد دەکات، گەیاندنی ناوبانگ بەدەقیقی زۆر زەحمەت دەبێت. بۆ نموونە، هەندێ پێشنیاری ئەوە دەکەن کە ئەو پەیوەندییە بەهێزەی لە نێوان بازرگانە چینییەکاندا هەبوو بەشێوەیەکی بەرچاو لێکترازا کاتێ بازاڕ ڕووی لە فراوانبوون کرد. چارەسەرێکی تر ئەوەیە کە سیستەمێکی ناوەندی چاودێری بیرۆکراتی هەبێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنی دەرفەتی ڕێکەوتنی دوو لایەنە کە بەرێژەیەکی زۆر بەربڵاوبۆتەوە. بێ گومان، ئەم ئیختیارە سەرکەوتوو نابێت گەر هەر هەموو ڕێکەوتنە گەندەڵییەکان پێکەوە سەیر بکات. هیوایەکەش ئەوەیە کە کۆنتڕۆڵی ناوەندی هەموو جۆرە سیستەمێکی بەجێماوی " من کارێک بۆ تۆ دەکەم و تۆش لە بەرابەر ئەوەدا کارێک بۆ من بکە" ئاشکرا دەکات.

فراوانبوونی بازاڕ و چاودێری کردنێکی پتەو هەوڵی جدین لە پێناو دروستکردنی ئابووری کۆمەڵ نەک شەخسی و سیستەمێکی سیاسی. ئەو گۆڕانکارییانە دەبێتە هۆی کۆن بوونی تۆڕەکانی گەندەڵی، بەڵام هەروەها دەشتوانن هەرچی کارێکی باشی تۆڕەکانی دیکە هەیە لە ناوببەن.



## واستە و بەخشینی دیاری و پەرەپێدانی ئابووری

ئابووری پێشکەوتووی بازاڕ چەند هێڵێکی فەرمی و نافەرمی دەکێشێت لە نێوان بازرگانی ناشەخسی بازاڕ و کارە فەرمییەکان، ئەمە لە لایەک، هەروەها لە نێوان بازرگانی ناشەخسی بازاڕ و پەیوەندییە کەسییەکان لە لایەکی دیکەوە. ململانێی بەرژەوەندییەکان و یاساکانی هەڵمەتی دارایی پردەکان ڕێک دەخات لە نێوان پارە و سیاسەتدا. نەریتەکانی هەڵسوکەوت دەستێوەردانی بازاڕ سنووردار دەکات بۆ نێو پەیوەندی خێزان و برادەرایەتی. پێوەرە ڕۆژنامەوانییەکان پەیامنێران قەدەغە دەکەن لە پەسەند کردنی پارە بۆ نووسینی هەواڵێکی تایبەتی. لەگەڵ ئەوەشدا، جیاوازییەکانی نێوان نرخ و بەرتیل و دیاری و بەخشیش زەحمەتە هەم لە ڕووی کردنی ئەم جیاوازییە هەم لە ڕووی هەڵسەنگاندنەوە. لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، کێشەکە ئاڵۆزترە. هێڵی نێوان بازاڕ و خێزان و لە نێوان کەرتی حکومی و تایبەتدا هەمیشە شاراوە و نادیارە.

پێوەرە نیوکلاسیکەکانی ئابووری پەیوەندییە کەسییەکان لە نێوان کڕیار و فرۆشیار بەدوور دادەنێت و مشتومڕی ئەوەش دەکات کە بەشەخسی نەبوونی بازاڕ یەکێکە لە سوودەکانی. بازرگانی بەشێوەیەکی گونجاو لە لایەن تاکەوە بەڕێوەدەبرێت کە بڕیارەکانیان لە مەڕ بازرگانی دەدەن بەپشت بەستن بەسیفەتەکانی بەرهەم و نرخە سەپێنراوەکان. بازاڕ پشت بەزانیاری دەبەستێت، هەروەها بەشەخسی نەبوونی ئەو بازاڕانەش ئەوە دەگەیەنێت کە شت بەو کەسانە دەفرۆشرێت کە باشترین بەها بەکاڵاکان دەبەخشن. کەس پێویست ناکات یەکێکی خۆش بوێت یان ڕێزی بگرێت تا بازرگانی لەگەڵ بکات. پرۆسەی بازرگانی خۆی لە خۆیدا سەرچاوەیەک نییە بۆ بەرژەوەندییەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە جیهانی ڕاستیدا ناسنامەی کڕیار و فرۆشیارەکان زۆرجار بەشە زانیارییەکی گرینگە کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی ناوبانگ و متمانە. پەیوەندییە کەسییەکان لە نێوان کڕیار و فرۆشیار عیلاقەیەکی کاریگەر دەبێت لە کاتی ململانێ و ڕکابەریتی لە سەر گرێبەست. ئەو عیلاقەیەش یان ئەوەتا لە سەر بنچینەی سۆز و

ڕێزه یانیش له سەر بنچینەی ترس و گوڕەشەیە. گەر دانانی عیلاقاتی شەخسی ئاسان بێت، ئەوا ڕەنگە کێشەی تەزویر و ساختەچیەتی کەم بێتەوە چونکە هەر لایە و هەوڵ دەدات ناوبانگێک لە ڕێگەی ڕێکەوتن و مامەڵەی یەکسان و کاری باش دروست بکات. ئەو کەسەی هەر نانی بەلاش دەخوات و هەمیشە چاوی لە مفتەیە دەست بەتاڵ دەمێنێتەوە لە لای ئەو گروپانەی لە نێوە خۆیاندا هاوکاری یەکتر دەکەن.

عیلاقاتی شەخسی دانووی ناکوڵێت لەگەڵ کاری باش. متمانە و ناوبانگ و ئەرکی دوو لایەنە زەمینە خۆش دەکات بۆ گەندەڵی و هەموو ئەو هەوڵانە بەلاوە دەنێت بۆ بەرەوپێش بردنی کاروبارەکانی دەوڵەت. گەر خەڵک تەنها مامەڵە لەگەڵ برادەرانیان بکەن، ئەوا ئەم حاڵەتە کاڵا سنووردار دەکات بۆ نێو بازاڕ و لەوێشەوە بۆ دووکانداران چونکە بریکارەکان تەنها شتەکان یاخود شتە باشەکان دەبەن بۆ خزم و کەس و دۆستەکانیان. هەرچەند عیلاقاتی شەخسی بەهێز بێت ئەوا کۆنترۆڵی ئەو عیلاقەیە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ لە سەر ئەوانەی کە دەکەونە دەرەوەی بازنەی ئەو پەیوەندیە. گەر بازرگانە تایبەتییەکان عیلاقەیەکی شەخسیان هەبێت لەگەڵ بەرپرسە گشتییەکانی حکومەت و حیزب ئەوا واستە و واستەکاری و خزم خزمانێ و سیستەمی مفتەخۆری ڕوو لە زیاد بوون دەبێت و گەندەڵی و بەرتیل و پارە خەزن کردن تەنها بۆ سەرگەورەکانی حکومەت و حیزب دەبێت و شەفافیەت و کاریگەری کارکردنی کەرتی حکومی و تایبەت ڕوو لە کز بوون دەکات. لە سیستەمی پارەخواردندا لە ڕێگەی گەندەڵییەوە بەرپرسانی حیزب و حکومەت فرۆشیارن و کەرتی تایبەتیش کڕیارن. پێچەوانەی ئەمەش واتە کەرتی تایبەت چاوی بەرپرسەکان کوێردەکات و بەسەر دەوڵەتدا زاڵ دەبێت.

بۆ نموونە بەنگلادیش وەک وڵاتێکی سەربەخۆ لەو جۆرە وڵاتانەیە کە مفتەخۆر و پارەخۆرەکان دەستیان بەسەر وڵاتدا گرتووە. پاش ئەوەی لە پاکستان جیابۆوە، هیچ سەرکردەیەکی مەحەلی بازرگان نەبوو ئەو کاتە، هەروەها چینی بازرگانەکان پشتیان دەبەستا بەواستەکاری و پارەخواردنی دەوڵەت. فلیپینییەکانیش باشترین نموونەی دەوڵەتێکی بێ هێزە و بازرگانانی تایبەتی دەستیان بەسەردا گرتووە.



هەرچەندە هەندێک هەن بەڕاستی لە دوو کاردا دەگەڕێن، بەڵام ئەوانی تر هەمیشە چاویان لە بازرگانییەکی بەرهەمدار و لا بەلایە. لە کردەدا، شتێکی شاراوەیە و دیار نییە کامەیان حکومەت یان کەرتی تایبەتی باڵادەستە چونکە پێکەوە کار دەکەن بۆ دەسکەوتی هاوبەش. توێژینەوەیەک بەم دواییە لە سەر حاڵەتە گەندەڵییەکانی ئیتالیا ئەم جۆرە کێشانە دەخاتە ڕوو و هەروەها چۆن گەر چاودێر و هەڕەشە هەبێت لە نێو بازرگانان یاخود ترسی ئەوەی شت لە سەر یەکتر ئاشکرا بکەن.

لەو کۆمەڵگایانەی کە بەتۆڕی پەیوەندییە کەسییەکان بۆگەن بووە، هاوڵاتیان کەم گرینگی بەلێهاتوویی شیاوی کەرتی تایبەتی و حکومی دەدەن. ڕەنگە بازاڕی ناشەخسی بەبازاڕێکی ناشەرعی و نائەخلاقی بزانن. تا ڕادەیەکی زۆر فیکرەی سیستەمی ئاشکرای "من کارێک بۆ تۆ دەکەم و تۆش لە بەرابەر ئەو کارەدا کارێکی تر بۆ من بکە" پرسیاری زۆری لە سەر بێت. ڕەنگە خەڵکی باوەڕیان بەوە هەبێت کە جارێک دیارییەک ببەخشن بەکەسێک ئەوا ڕۆژێک دادێت ئەو کەسە دیارییەک بۆ تۆ دەبەخشێت. واتە گەر تۆ کارێکت کرد بۆ یەکێک ئەوا دەڵێی " منیش ڕۆژێک دێ ئیشێکم پێی بکەوێ". هەرچەندە چاودێران ئەوەی کە دەیبینن زۆر بەچالاکی و کەلتوورێکی بازرگانی پێشکەوتوو پیادە دەکرێت، بەڵام ئەوانەی کە لە نێو سیستەمەکە دەژین بەم شێوەیەی نابینن بەڵکو پڕیەتی لە گەندەڵی و پۆخڵەوات. بۆ ئەوان بازرگانی کارێکی شەرعییە و چەند شەریکێک هەن و پێکەوە مامەڵە دەکەن. هەر کۆمەڵگایەک لە سەر بنچینەی پەیوەندییە کەسییەکان بونیات بنرێت ئەوا کاری زۆر بەزەحمەت دەکەوێت بۆ پەرەپێدانی پرۆژەی سەرمایەداری درێژخایەن یاخود ناتوانێت هاوکاری بازرگانی سەر سنوور بکات، بەڵام ڕەنگە خۆی پێ بەڕێوە بچێت ئەویش زۆر بەخراپی. کەواتە پەیوەندییە کەسییەکان کۆمەڵگا بەرەو کزبوون و بوودەڵەیی دەبەن.

ئەو کۆمەڵگایانەی کە پشت دەبەستن بە پەیوەندییە کەسییەکان ئەوا فیکرەیەکی وایان نییە لە سەر پەیوەندیەکانی نێو ئاژانسەکان و ئەو ئەرکانەی کە سپاردوویانە بەبریکارەکان. فیکرەی ئەوەی کە یەکێک بەرپرسیارێتیەکی هەیە بۆ سەرەوە، ئەوا جگە لە پاڵپشتی پەیوەندیەکان و برادەرایەتی و خزمایەتی و ڕەنگە بەکەسێکی نامۆ

و ناسروشتی بێتە پێش چاوی ئەوانەی مژوڵن بەگەندەڵییەوە. ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە زۆر بەزەحمەت دەتوانن بیرۆکراسیەتێکی مۆدێرن دامەزرێنن، بەتایبەتی گەر پشت ببەستن بەو فەرمانبەرانەی کە دەگیرێن لە سەر بنچینەی بەهرە و چاوەڕێ دەکرێت ڕۆڵی خۆیان لەو فەرمانبەرانە جیا کەنەوە وەک خزم و برادەر. هاوڵاتیان وادەزانن پەیوەندییە کەسییەکان لەگەڵ فەرمانبەر و بەرپرسان پێویستە بۆ بەدەستهێنانی هەر شتێک و واش بیر دەکەنەوە کەوا شتێکی باشە گەر بەخشیش و دیاری ببەخشرێت بەبەرپرسان بۆ بەڕێکردنی کارەکانیان. بەرپرسی گەورە لە نێو حکومەت وا خۆی نیشان دەدات کە ئەو دژی دیاری بەخشین و بەرتیل و بەخشیشە بەڵام گەر بۆی ڕێک کەوێت زۆر لە فەرمانبەرەکان خراپتر دەکات. بۆیە دواجار گروپێک دروست دەبێت و کار پێکەوە دەکەن و ئەو پارەیەی بەدەستیان دەکەوێت لە نێوە خۆیان بەشی دەکەن. بەرپرسەکان لە نێو گەندەڵیشدا بەشی گەندەڵکاری هەژار و لەخۆی بچووکتر دەخوات بەوەی گەر بەرپرسە خۆی پارەی بەدەست کەوت ئەوا بەشی ناکات لەگەڵ ئەوانەی لە خۆی بچووکتر بەڵام گەر بچووکەکان بەدەستیان کەوت ئەوا دەبێ بەشی گەورەکەشی لێ بدەن! پاڵپشتی خێزان و برادەر و ئەوانەی لەگەڵ یەکدا کار دەکەن و پشت دەبەستن بەخزم خزمانێ ئەوا زاڵ دەبێت بەسەر ئەو پاڵپشتیەی کە دەبێ لە ئەسڵدا بۆ دەوڵەت بێت.

ئەو تۆڕە بەهێزانەی کە لە سەر متمانە و ناوبانگ بونیات نراون بێ سوود دەبن لەوکاتانەی کاتێ دامەزراوە ڕەسمییەکانی دەوڵەت بێ هێز و نەشیاون. بۆ نموونە، لە سەردەمی زووی دوای شۆڕشگێڕی لە یەکێتی سۆڤیەتدا، تۆڕە کۆمەڵایەتییە ناڕەسمییەکان گۆڕان بۆ پێکهاتەی ڕێکخراوەیی ڕەسمی. ئەو کادرانەی کە ئەندام بوون لە ڕێکخراوە گورج و گۆڵەکان پشتگیری خۆیان و ڕۆڵی خۆیان بۆ دەوڵەتی سۆڤیەتی نوێ دووپات کردەوە. بەپێی تێپەڕبوونی کات، ئەو تۆڕانە بوون بەسەرچاوەی گەندەڵی و چەواشەکاری. ستالین ناڕەزایی ئەوەی دەربڕی کە پێکهاتە کۆمەڵایەتییە ناڕەسمییەکان بوونەتە هۆی بێ هێزکردنی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە ڕەسمییەکان، هەروەها هەوڵەکانی گۆرباتشۆڤ بۆ چاکسازی لە ساڵانی هەشتاکان وەستێنران لە لایەن ئەو تۆڕە ناڕەسمییانەی کە توانای ناوەندی کەم کردەوە لە جێبەجێ کردنی سیاسەتەکاندا.



بە هەمان شێوە، لە دوا ماوەکانی گۆڕان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، زەمینە خۆش کرا بۆ گەندەڵی بەهۆی ئەو عیلاقاتە شەخسییانەی کە کاتێ فراوانبوونی پێکهاتە ڕەسمییەکان لێک هەڵوەشانەوە. نەبوونی تێگەیشتنی بنەماکانی ئیدارەی گشتی گەشەی بیرۆکراتیان وەستاند لە کۆمەڵگاکانی دوای سۆڤیەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا. پشتگیری لە ئەندامانی تری ڕێکخراوەکە بەقەد یان زۆر گرینگتر بوو لە ئیدارەیەکی باش. بەپێی توێژینەوەیەک لە بولگاریا، فەرمانبەرەکان لە نێو وەزارەتی دارایی بولگاریا هەستیان بەوە دەکرد کە دەبێ هاوەڵەکانی خۆیان بپارێزن لە نووسینگەکانی گومرگدا لە بری ئەوەی داوایەکی جدی لە سەر ئەو بەرپرسە گەندەڵانە بنووسرێت و لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکرێت. سەرەنجامە درێژخایەنەکانی ئەم ڕەوشە زۆر قووڵن و دروستکردنی پێکهاتەی کاریگەر لە دەوڵەت زەحمەت دەکەن.

گریمان سەرکردەکانی وڵاتێک بڕیاری ئەوە دەدەن دامەزراوەکانی بازاڕی ئازاد و بەڕێوەبردنی پێکهاتەکان ئاشنا بکەن ئەوانەی کە لە لایەن دەوڵەتە پێشکەوتووەکانەوە بەکاربراون. ئایا ئەم دامەزراوە نوێیانە چ جۆرە کاریگەرییەکیان دەبێت لە سەر ڕاو بۆچوونی گشتیدا؟ گواستنەوە لە بارودۆخێک کە پەیوەندییە کەسییەکان تیایدا نەریتێکە بۆ کۆمەڵگایەک کە پشت نەبەستێت بەو جۆرە پەیوەندییانە بەبازاڕی بەهێز و دامەزراوەکانی کەرتی حکومی ڕەنگە کارێکی بەئازار بێت.

ئاشناکردنی دامەزراوە نوێیەکان کە لە شوێنی خۆیەتی بەڵام بێ هێز و چەند نەریتێکی هەیە کە دەتوانن زانستێکی وا بەرهەم بێنن کە ببێتە هۆی ئەوەی گۆڕان دروست بکات لە بۆچوونەکانی ئەو خەڵکانەی کە سەرنج دەدەنە نرخەکانی بازاڕ و بیرۆکراسیەت. بەپێچەوانەی دامەزراوە ئابووریەکانی بازاڕ، سنووری ئاڵۆز لە نێوان چالاکیەکانی بازاڕ جگە لە بازاڕ وجوودیان نییە لەو وڵاتانەی لە ڕابردوودا کەمێک پشتیان بەستاوە بەبازاڕە ئازادە ناشەخسییەکان. گەر ئەو وڵاتانە بەشێوەیەکی کاریگەر ڕۆڵی بازاڕ زۆر بکەن و لە هەمان کاتیشدا هەوڵ بدەن بۆ دامەزراندنی بیرۆکراسیەتێکی نوێ و حکومەتێکی دیموکراسی. بەرتیلدان بە بەرپرسەکانی حکومەت ڕەنگە شتێکی گشتی بێت، گەلێ لە کارە بازرگانییەکانی نێو بازاڕ

وەستاوە لە سەر عیلاقاتی شەخسی، هەروەها پرۆسەی کڕین لە دەوڵەت و تەعینکردنی کارمەند هەموو دەبن بەبەشێک لە واستەکاری. لە لایەکی ترەوە، ڕەنگە بازاڕ ناسکیەتی خۆی لە دەست بدات بەهۆی دەستێوەردانی ئەو ناوچانەی بازاڕ بەشتێکی ناشەرعی سەیر دەکەن تەنانەت لە ئابووری بازاڕە پێشکەوتووەکانیش. بەسەرێکی دیکەش، ڕەنگە بازاڕ زۆر بەزەحمەت لەو ناوچانەدا دامەزرێت کە دەسکەوتی باش بەپێی بەهرە بەدەست دێنێت.

گەر لە وڵاتانی مۆدێرندا خەڵکێکی زۆر سوودمەند بوو ئەوا وڵاتانی تریش دەست دەکەن بە لاساییکردنەوە. بۆ نموونە، لە چین سەرکەوتنی ئەو هەرێمانەی کە ڕەوشی ئابووری خۆیان ئازاد کردووە هەرێمە پارێزکارەکانی تریشی هان دا بۆ ئەوەی لە چاو ئەوان بکەنەوە. کەرتێکی بچووک و مام ناوەندی بازرگانی سەرکەوتوو کە بەشێوەیەکی ئازاد کار دەکات ڕەنگە ببێتە هۆی هاندانی ئەوانی تریش هەوڵ بدەن بەشێوەیەکی ئازاد کار بکەن و پێو و دانگ و کۆت و زنجیرەکان لە ژیانی ئابووریدا بشکێنن. ئەو نیگەرانییەی کە بازرگانان هەیان بوو لە بەرپرسە چینییەکان وەک نەریتێکی درێژخایەن بەردەوام دەبێت هەروەها پشت دەبەستێت بەگرێبەستە سیاسییەکان و ئاڵو وێرکردنی بەرژەوەندییەکان.

ئایا ئەو هەوڵانەی بۆ سنووردارکردنی ڕێکەوتنە شەخسییەکان لە ڕێگەی بەرپرسە گشتییەکان و ئەوانەی نێو بازاڕ دەبێتە هۆی پشتگوێ خستنی خاسیەتەکانی ئەو پەیوەندیانەی کە لە سەر متمانە و ڕێز بونیات نراون؟ ڕیچارد تیتموس ( ١٩٧٠) مشتومڕی ئەوە دەکات کە ڕێز بۆ پاشەکەوتکردنی خوێن بۆ حاڵەتی پێوستی گواستنەوەی خوێن، ڕۆڵێکی گەورەتر بۆ بازاڕ دێتە ئاراوە بەهۆی کەمی هەستکردن بەئەرکەکان بۆ یارمەتیدانی برادەران. هاوکاری بۆ چارەسەر کردنی کێشەیەکی گشتی ڕەنگە سەرکەوتوو نەبێت، هەروەها ئەو هاوکارییەش کە پێویستە بکرێت پڕ لە ئێش و ئازارە. بەڵام گەر ئاڵوێرکردن هەبێت، ئەزموونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئەو ئاڵوێرکردنە پێویست ناکات تەواو بێت. سەرەڕای هەندێ سکاڵای هەندێ نووسەران، ویلایەتە یەکگرتووەکان گەلێ تۆڕی ڕێکخراوی بێ قازانجی هەیە، هەروەها هەستی خۆبەخشین بۆ کارکردن زۆر بەهێزە



هەروەها بەخشینی دیاری تایبەت بەبەخشەران و خزمان گەلێ زۆرە. گەلێ پەیوەندی بازرگانی هەن پشت دەبەستن بەمتمانە و ناوبانگ بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەنجامدانی کارێکی زۆر باش. نیزامی هەڵمەتە سیاسییەکان و هەڵسوکەوتی بیرۆکراتی سنوورێک بۆ مامەڵە کردن تەنها بۆ خود دادەنێت، بێ گومان هەرچەند سامانی تایبەتی کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لە سەر ژیانی سیاسیدا.

لە ئەفریقیا، هەندێ لە چاودێران ئەوانەی کە بێ ئومێد بوون بەژێرکەوتنەکانی ڕابردوو، مشتومڕی توێژینەوەیەکی چڕوپڕ لە سەر دامەزراوەکان دەکەن. "مامادوو دیا" مشتومڕی ئەوە دەکات کە ئەفریقیا دووچاری قەیرانی دامەزراوەکان دەبێتەوە. هۆی قەیرانەکەش دەگەڕێتەوە بۆ لێکترازانی پێکهاتەیی و پیشەیی ئەو دامەزراوانە یاخود نەبوونی ڕوحی هاریکاری لە نێوان ئەو دامەزراوە فەرمییانەی کە لە دەرەوە چەسپاون و ئەو دامەزراوە نافەرمییانەشی کە ڕەگیان داکوتاوە لە نێو مێژوو و نەریت و کەلتووری ئەفریقیا، هەروەها ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی حوکم دەکات بەسەر کۆمەڵگای مەدەنییەوە. "دیا" ژمارەیەک حاڵەت دەهێنێتەوە کە هەوڵی سەرکەوتوو دراوە بۆ یەکخستنی بەها کەلتوورییە مەحەلییەکان و پیادەکان بۆ هەوڵی مۆدێرن و پێشکەوتوو. بۆ نموونە، کۆمپانیای کارەبای گشتی لە "کۆت دیڤوار" هەوڵێکی سیستەماتیکی داوە بۆ ئاشت کردنەوەی هاریکاری و کەلتووری کۆمەڵایەتی بێ ئەوەی گومان لە سەر هیچ یەکێکیان دروست بێت. مەبەست لە بۆچوونەکەی "دیا"دا ئەو پرسیارەیە کە چۆن پیادەکان و شێوازە کۆن و نوێیەکانی دامەزراوەکان یەک دەگرنەوە، بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە هەردوو لا بۆ پێشخستنی گەشەی ئابووری.

با کرێدیت و کارەکانی بانق بەنموونە بهێنینەوە. لە گەلێ وڵاتانی پێشکەوتوودا، کاری بانق و کرێدیت سەرچاوەی گەندەڵی و پارە خواردنن. ئەو نوخبانەی کە کۆنترۆڵی ئەو جۆرە کارانەیان لە ژێر دەستە بەهیچ شێوەیەک واز لەو کارە ناهێنن چونکە بەجۆرێک لە جۆرەکان خزمی حکومەتن! لە سەر چاکخوازان پێویستە ڕێگایەک بدۆزنەوە بۆ دابینکردنی کرێدیت لە دەرەوەی خزم خزمانێ و واستەکاری. ژمارەیەک لەو ئەزموونانەی بەم دواییە ئەنجام دران کارێکی باشیان لێ کەوتۆتەوە. ئامانج لەوەش دروستکردنی فۆرمی دامەزراوە گشتییەکان نییە لە وڵاتانی

پێشکەوتوو کە جەخت بکاتەوە لەسەر هەڵسەنگاندنی مەترسییەکان و گەڕانەوە. لە بری ئەوە، ئەو ئەزموونانە گرینگی عیلاقاتی شەخسی پەسەند دەکەن بەڵام ئەڵتەرناتیڤێک بۆ بەخشینی کرێدیت دابین دەکات لەسەر بنچینەی ئەندامێتی لە گرووپی نوخبەکان. پەیوەندی نزیک لە نێوان دراوسێکان لە کۆمەڵگا هەژارەکان تەواوکەری ئەو هەوڵانەن کە سیستەمێکی بانق دادەمەزرێنن. فشاری کۆمەڵایەتی خەڵکی هان دەدات بۆ دووبارە پارەدان، بەڵام قەرزی بەرایی بۆ ئەوانەی دەرەوەیە کە پێشتر وجوودیان هەبووە لە بازنەی قەرز وەرگرەکان. لە ڕووی کردەییەوە هەندێ لەو ئەزموونانە تەنها لە دابینکردنی کرێدیت بۆ جووتیارە مەحەلییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. بەڵام، لە ئەزموونەکانی تردا، فشاری کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو هانی دووبارە پارەدان دەدات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە ئایا ئەو جۆرە بەرنامانە ڕێک دەخرێن بەبێ نالاندنی دارایی؟!.



## ئەنجام

پێناسەی بەرتیل و دیاری مەسەلەیەکی کەلتوورییە، بەڵام کەلتوور بەردەوام لە گۆڕاندایە. گەر ئەو هەڵسوکەوتەی لە لایەن هەندێ پسپۆڕانەوە ناوی لێ نراوە " گەندەڵ" واتە هەڵسوکەوتی پەسەندکردنی دیاری و بەخشیش، ئەوا دەبێ بەشێوەیەکی سادە بخرێنە چوارچێوەی یاسا و ئاشکراش بکرێن. بەڵام گەر ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە خەرجیەکی ناڕاستەوخۆ و شارەوە بسەپێنن بەسەر دانیشتوانەوە، ئەوا شرۆڤەکاران دەتوانن ئەو خەرجیانە ڕوون بکەنەوە و دۆکیومێنتیان بکەن. پێناسەکانی هەڵسوکەوتی پەسەندکراو ڕەنگە بگۆڕێن هەرکە خەڵک ئاگادار بوون بەخەرجیەکانی بەرتیل بۆ بەرپرسان و فەرمانبەران. بەپێچەوانەوە، شارەزایان ڕەنگە شتێکی نوێ فێر بن لەبارەی ڕێکخراوی چالاکیە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی سیستەمەکان کە گرێبەستی شاراوە تاکە فۆرمی گرێبەستنە لە ئارادا هەیە و عیلاقاتە شەخسیەکانیش پێگەیەکی سەرەکییان هەیە لە ژیانی ئابووریدا.

## گەندەڵی و سیاسەت

**گەندەڵی** وەسفی ئەو پەیوەندییە دەکات کە لە نێوان دەوڵەت و کەرتی تایبەتدا هەیە. هەندێ جار بەرپرسەکانی دەوڵەت ئەکتەری سەرەکین، هەندێ جاریش لە هەندێ حاڵەتدا کەرتە تایبەتییەکان بەهێزترین هێزن لە مەیدانەکەدا. دەسەڵاتی دانووسانی ئەو گروپانە کاریگەری گەندەڵی لە سەر کۆمەڵگا دیاری دەکات و هەروەها دابەشکردنی دەسکەوتەکان لە نێوان بەرتیلدەر و وەرگر دەخاتە ڕوو.

شرۆڤەکارانی گەندەڵی بەردەوام لە مشتومڕی بێ ئەنجامدان لەبارەی ئەوەی کامە فۆرمی حکومەت شیاوە بۆ گەشەی ئابووری. هەرچەندە وڵاتە دەوڵەمەندەکان وا خۆیان نیشان دەدەن کە وڵاتی دیموکراسین، کەچی هیچ پەیوەندییەکی ئاماری بەرچاو نییە لە نێوان گەشە و حکومەتی دیموکراسی. هۆی ئەمەش شتێکی وا زەحمەت نییە بیخەیتە ڕوو: " دیموکراسی" زاراوەیەکی زۆر گشتییە بۆ لەخۆ گرتنی زنجیرەی فۆرمەکانی حکومەت کە هەمیشە لە ژێر چاودێریدان! وێڕای ئەمەش، پێکهاتەی حکومەت کە بە باشی کار دەکات لە وڵاتێکدا ڕەنگە هەمان ئەو پێکهاتەیە لە وڵاتێکی تردا هیچ مانا و سوودێکی نەبێت. یەکێک لە فۆرمە بەربڵاو و سەرمخۆرەکانی گەندەڵی ئیفلیج کردنی وڵاتە لە گەشەکردن.

ئایا دامەزراندنی دیموکراسی ستراتیژیەتێکی دژە گەندەڵییە؟ ئارەزووی دووبارە هەڵبژاردنەوە دەست بە سەر چاوچنۆکی سیاسەتمەدارەکاندا دەگرێت. پاراستنی سەربەخۆییە مەدەنییەکان و ڕای ئازاد، وا لە حکومەت دەکات کە کراوە و شەفاف بێت. بە پێچەوانەوە، دەوڵەتە غەیرە دیموکراسییەکان تایبەتتر گومانیان لێ دەکرێت لە سەر پاڵنەرە گەندەڵییەکان چونکە سەردارەکانیان دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە کاروباری حکومەت ببەن بەڕێوە بە بێ ئەوەی لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێت. بەڵام ئەم هاودژییە زۆر دژوار و سەختە. با دوور نەڕۆین، هەر لە لای هێروە، سەیری نیۆرک و شیکاغۆ بکەین لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دۆزینەوەی سیستەمێکی گەندەڵی تۆکمە کە تەواو بەراورد بکرێت لەگەڵ سیستەمە



ئۆتۆکراتەکان. کارەساتەکانی بەم دواییەی بەرتیل، سەرکردە هەڵبژێراوەکانی هەراسان کردووە لە مەکسیک و ئیتاڵیا و کۆریا و ژاپۆن. گەندەڵی شتێکی زۆر گشتی و بەرچاوە لە سەر ئاستی حکومەتی ناوخۆ لە فەرەنسا و ئەڵمانیادا. ئاشکرایە، فۆرمە دیموکراسییەکان هەمیشە سەرکەوتوو نابن لە لێپێچینەوەی گەندەڵی. بۆیە کارێکی باشە گەر پرسیار بکەین کامە خاسیەتی حکومەتی دیموکراسی یارمەتیمان دەدات تا بزانین کامە فۆرم گەندەڵە و کامەشیان سنوورێکی هەیە بۆ مامەڵەکان.

پێش ئەوەی بچمە سەر باسکردنی ئەم بابەتە بە قووڵی لە بەشی داهاتوودا، بە شیکردنەوەیەکی گشتی تر دەست پێ دەکەم لە سەر دەسەڵاتی باڵای بەرپرسە گەورەکانی حکومەت لە بەرابەر ئەکتەرە تایبەتە گەندەڵەکان. ئەم باسە بەشێکە لە وردەکاری سیستەمە سیاسییەکان، بەڵام لە بری ئەوە جەخت دەکاتەوە لە سەر " ڕێکخراوە پیشەسازیەکان" ی گەندەڵی! سروشتی گەندەڵی هەر تەنها ناوەستێتە سەر ڕێکخراوە حکومیەکان بەڵکو دەوەستێتە سەر ڕێکخراو و دەسەڵاتی ئەکتەری تایبەتیش. پرسی هەرە گرینگ ئەوەیە کە ئایا حکومەت یاخود کەرتی تایبەت دەسەڵاتی قۆرخکەرە لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەوانی تردا. لە سەرەتادا دەتوانین ئەنجامێکی بنەڕەتی بخەینە ڕوو. تا ئەو ڕادەیەی کە حکومەتی دیموکراسی دەسەڵات لە نێو بەرپرسەکانی خۆیدا بڵاو دەکاتەوە، ڕەنگە هەر یەکە دەسەڵاتێکی کەمی بەرکەوێت لە بەرابەر بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی. دیموکراسی سەرکەوتوو ڕەنگە پێویستی بە هاندانی دروستکردنی بازاڕی تایبەتی پێشبڕکێ کار هەبێت شان بە شانی دامەزراندنی سیستەمێکی پێشبڕکێکاری سیاسی.

من ئەو شوێنانەی کە گەندەڵی لە سەرووی حکومەتەوە ڕێکخراوە جیا دەکەمەوە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە بەرتیل پیشەی بەرپرسەکانە لە ئاستێکی نزمتر. دیوەکەی تری گەندەڵی " بازاڕ" دەبێ سنووردار بکرێت. ئایا ژمارەیەکی کەم هەیە لە ئەکتەرە تایبەتە گەندەڵەکان یاخود ئایا بەرتیلدان لە نێو خەڵکی و کۆمپانیا زەبەلاحەکان بە تەواوی پەرش و بڵاو بۆتەوە؟ نەخشەی ژمارە (٢) هەر چوار حاڵەتە جەمسەرییەکان دەخاتە ڕوو کە ئەمانەن: kleptocracy (حکومە اللصوص) و قۆرخکردنی دوانەیی و

مافیای زاڵ بە سەر دەوڵەت و بەرتیلی پێشبڕکێکار. من لە kleptocracy دەست پێدەکەم دواتر باسی هەردوو ئەو حاڵەتە دەکەم کە بەرتیلدەران دەسەڵاتی قۆرخکارییان هەیە. دوا حاڵەتیش کە بەرتیل ڕۆڵی نرخ دەگێڕن لە بازاڕێکی لامەرکەزیدا، ئەم حاڵەتە پێویستی بە چارەسەرێکی جیایە. "شوێنی بازاڕ" ی گەندەڵ دەکرێ زۆری تێ بچێت گەر هیچ دەسەڵاتێکی قۆرخکەر ڕۆڵی تیا نەبینێت.

| | بەرتیل دەرە فرەکان | بەرتیل دەرە کەمەکان |
|---|---|---|
| بەرتیا وەرگران لە لووتکەی ئاستی حکوومەتدا | ١- دەوڵەتێکی چەواشەکار (یان) ٢- دەوڵەتێکی بێ هێز | قۆرخکردنی دوانەیی |
| بەرتیل وەرگرە فرەکان لە ئاستی نزمی حکوومەتدا | بەرتیلی پێشبڕکێکار کە ئەگەری خول خواردنی هەبێت | ئەو دەوڵەتانەی مافیا تیایدا زاڵە |

خشتەی ژمارە (٢)
جۆرەکانی حکومەتی گەندەڵ

## حکومە اللصوص Kleptocracy

با وا دابنێین بەرپرسێکی کلێپتۆکراتی دووچاری ژمارەیەکی زۆری بەرتیلدەر دەبێتەوە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی. لەو پەڕی ئەم حاڵەتەشدا، سەرۆکێکی بەهێزی حکومەت دەتوانێت سیستەمێکی سیاسی ڕێک بخات بۆ فراوانکردنی ئەو ئەگەرانەی کە لەم حاڵەتە دەکەونەوە. ئەم جۆرە ڕێگرە وەک قۆرخکەرێکی تایبەت کار دەکات، کار دەکات بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین دەسکەوت و هەرچی ئابووری وڵاتیش هەیە دەخاتە پەراوێزەوە بۆ سوود و بەرژەوەندی خۆی. قۆرخکەری تایبەت بەرهەم وشک دەکات چونکە سوود و قازانج دەکات لە جیاوازییەکان لە نێوان کڕینی نرخ و تێچووەکان. گەر کلێپتۆکراتێک، وەک قۆرخکەرێکی تایبەت، کاڵای تایبەتی بە



هاوڵاتی و کۆمپانیا زەبەلاحەکان فرۆشت، ئەوا خۆیشی بەرهەمەکان چڕ دەکاتەوە. بۆ نموونە، گەر دەوڵەت خۆی سیستەمی تەلەفۆن و هێڵی شەمەندەفەر دروست کات ئەوا ڕەنگە لەو مامەڵەیەدا نرخێکی قۆرخکەر هەبێت، پێوەدانگ بۆ پاشەکەوت دادەنێت و کرێ زیاد دەکات. بە هەمان شێوە، گەر فەرمانڕەوایەکی کلێپتۆکرات یان بەرهەمێکی کشتوکاڵی سنوورێک بۆ بەرهەمهێنان دابنێت، ئەوا مەبەستەکەی ئەوەیە تا نرخی جیهانی هەر بە بەرزی بهێڵێتەوە و تەنها خۆیشی قازانجەکە بە دەست بێنێت. لە هەمان کاتدا، چاو دەبڕێتە پەراوێزخستنی ئەو بازرگانییە و لە سیاسەتی ڕۆژانەدا بەدەستی دێنێت. فەرمانڕەواکە هەموو سوودەکانی واستە و خزمانێ دەکاتە قوربانی بۆ بەدەستهێنانی ئەو قازانجانەی کە لە بازرگانییەکی قۆرخکراو هەیە. بۆیە گەر کەرتی سەرەکی هەناردن لە ژێر دەستی دەوڵەت بێت، ئەوا سەرکردە تەنها حەز بە کارمەندی وەک خۆی دەکات و پاداشت دەدات بەو کەسانەی کە بەرهەمێکی زۆر بەرهەم دێنن و بازرگانی بە باشی دەکەن. کلێپتۆکرات حەز بەو سیاسەتانە دەکات کە زۆربەی سەرچاوەکان بۆ گیرفانی ئەو دەگوازێتەوە هاوکاتیش درێژە بە بەرهەمی ئابووری دەدات. کلێپتۆکرات دژی ئەو سیاسەتانە دەوەستێتەوە کە سوودەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان دابەش دەکات لە نێو کۆمەڵگادا لەگەڵ بەدەستهێنانی بەرتیلێکی کەم لە ناوەڕاستدا. سەرکردە گەندەڵەکان هەمیشە پشتگیری ئەو سیاسەتانە دەکەن کە دەسکەوتی شەخسی لێ دەکەوێتەوە هەتا گەر لە تەواوی سامانی کۆمەڵایەتیش بێت هەر پێیان باشە و چاویان لێیەتی.

بەڵام، زۆربەی کلێپتۆکراتەکان وەک دەزگای ئۆڵسەن (دەزگای بڕینی ڕێگایەکان) باڵا دەست نین. ئامانجیان زیادکردنی سامانی شەخسییە، بەڵام ئەو ناوەندانەی کە بە کاری دەهێنن لە شوێنی خۆیان نین و سەقەتن. کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکەن بەڵام ناتوانن دەست بە سەر تەواوی ئابووری وڵاتدا بگرن. ڕەنگە خزمەتێکی مەدەنی بێ هێز و بێ پاڵپشتیان هەبێت، ڕەنگە بنکەیەکی هەژاری سەرچاوەکانیان هەبێت، هەروەها چوارچێوەیەکی بێ هێز و شاراوەی کارکردنیان هەبێت. سەرکردە دەبێ کار لەگەڵ ئەوانە بکات بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەمەش ڕەنگە بۆ ناوەندەکانی بەرهەمهێنان ڕێگەیەکی شیاو نەبێت. ئەو سەرکردەیە پشتگیری هەندێ

دەستێوەردان دەکات کە ڕەنگە نەبێتە هۆی زیادکردنی داهاتی وڵاتەکەی چونکە ئەو شتە لا بە لایانە تەنها سوود بە بەرژەوەندی شەخسی خۆی دەگەیەنێت وەک سەرکردەی وڵات. هەتا کلێپتۆکراتەکەش لە ئەنجامدا دەگاتە ئەو خاڵەی کە دەستێوەردانی لا بە لا ئەوەندە زۆر دەبێت لە سەر ئاستێکی بەرزەوە ئەوا سوودی ئەو بەرتیلەی کە هەیە هیچ باوی نامێنێت. کلێپتۆکراتی بێ هێز ئەو کەسەیە کە هەمیشە عەوداڵی سیستەمێکی بوودەڵە و بێ هێزە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ ئەوەی سوودی گەندەڵی بەرتیلەکانی خۆی پێ زیاد بکات. هاوڵاتیان لە کلێپتۆکراسەیەکی بێ هێزدا حەزیان بە بەرپرسێکی بچووکترە تا حکومەتێکی ئیختیاری کاتێ حکومەتەکە گەندەڵە، بەڵام هەمیشە یەکێک بەدەست دێن کە گەورەترین دەسەڵاتی هەیە! باشترین نموونەی ئەم حاڵەتەش حوکمی درێژ خایەنی سەرۆکی پاراگوای بوو کە ناوی " ئەلفرێدۆ ستروسنەر" بوو، هەروەها سەرکردەی زایر بەناوی "مۆبۆتۆ سی سۆکۆ"، هەروەها حوکمی " فرانکۆیس و جین کلۆد دوڤالێر" لە هاییتی. یەکێک لە پسپۆران لە پاراگوای بەم شێوەیە وەسفی ڕەوشی پاراگوا دەکات:

کەرتە حکومیەکان وەک کەرتی شەخسی ستروسنەر سەرۆکی ئەو وڵاتە سەیر دەکران. ئیدارەی دەوڵەت ئەوەی ئاشکرا کردووە کە هیچ جیاوازییەک نەبوو لە نێوان بازنەی سیاسی و ئابووریدا، هەروەها هیچ سنوورێکی دیاریکراو لە نێوان موڵکی حکومەت و موڵکی تایبەتدا لە ئارادا نەبوو. ئەنجامەکەش ئەوە بوو کە، ستروسنەر و دار و دەستەکەی و خزمەکانی مامەڵەیان بە موڵک و کەرتی حکومی دەکرد وەک بڵێی هی باوکیان بێت و بۆیان مابێتەوە.

لێرەدا، خاڵی سەرەکی مەبەستی سیستەمی کلێپتۆکراتی ستروسنەر نییە، بەڵکو بەکارهێنانی هەموو شتێکە بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆی و پڕ کردنی گیرفانی. لە بری بەڕێوەبردنی دەوڵەتێکی قۆرخکەر لە پێناو بەرژەوەندی دەوڵەت، ستروسنەر ڕێگەی دابوو بە پیاوە گەورە سەربازییەکان بۆ ئەوەی گرێبەست بکەن و قاچاغی بکەن بە ماددە سڕکەرەکان و بازرگانی بەڕێگەی سوپاوە بکەن. پڕۆژەگەلی وەک سەددە و فرۆکەخانە و بەرهەمهێنانی چیمەنتۆ هەمووی لە بەرژەوەندی کەسی ستروسنەر و دارو دەستە و خزمەکانی دابوو نەک بۆ بەرژەوەندی هاوڵاتیان و دەوڵەت.



بە هەمان شێوە لە زایر، سەرۆک مۆبۆتۆ و دارودەستەکانی دەکرێ وەک تاڵانچییانی دەوڵەت باسیان بکەین. مۆبۆتۆ چارەگێکی هەموو بودجەی دەوڵەتی لە ژێر کۆنترۆڵی خۆی دانا بوو، هەروەها زۆربەی سەرچاوە کانزاییەکان بۆ گیرفانی ئەو بوو. بەڵام مۆبۆتۆ هەموو ئەو دەسکەوتانەی لەگەڵ بەرپرسی پلە بەرز نزم و پشکنەران دابەش دەکرد. گەندەڵی و موفتەخۆری بوونە هۆی کوشتنی کەرتی تایبەت، هەروەها پڕۆژە مەزنەکانیش لە ڕێگەی بەرتیلەوە بۆ ستروسنەر و دارودەستەکەی بوو.

حوکمی دیکتاتۆری لە " هاییتی" سوودی لە چەند هەزار کەسێک وەرگرت کە لە ڕێگەی پەیوەندی هاوسەرێتی و پەیوەندی خێزانی یا هاوڕێیەتی بۆ ئەو دەسەڵاتەوە بوو. هۆی ناسەقامگیری سیاسی تا ڕادەیەکی کەم لە بەر بزووتنەوە میللییەکان بوو، هۆی هەرە سەرەکی ناسەقامگیری سیاسی نوخبەیەکی نزیک بوون لە دەسەڵات کە عەوداڵی قۆرخکردنی دەسەڵات بوون تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆیان. بە پێی بەشی بازرگانی ویلایەتە یەککگرتووەکان، لە ساڵی ١٩٧٧ تا ١٩٧٨ پەرتەوازەیی و نابەجێی فەندی حکومەت لە سەدا ٦٣ ی داهاتی حکومەت بوو. مەبەستە کلێپتۆکراتییەکانی سەرکردە گەورەکان ململنێیەکی قێزەوەنیان نایەوە لە پێناو دەسکەوت. چەند دامەزراوێک هاتنە کایەوە تەنها بۆ ڕێگە گرتن لە گەشە پێدان، قۆرخکاریەکانی دەوڵەت وەک ناوەندێک بۆ بردنەوەی هەرچی بازرگانی هەیە بەکارهێنران، هەروەها دەوڵەت دژی توانا و پەرۆشی خەڵک وەستایەوە.

لە حاڵەتەکانی " ستروسنەر و مۆبۆتۆ و دوڤالێر"دا، سەرکردەی گەندەڵ نەک هەر تەنها کاریگەری هەیە لە سەر قەبارەی حکومەت بەڵکو لە سەر تێکەڵ کردنی باج و خەرجکردنی پاشەکەوتەکانیش. باج و نیزام و پاشەکەوتەکان و جێگیر کردنی نرخ و هەروەها تایبەتمەندێتیەکان نموونەن بۆ چالاکییەکانی کەرتە حکومیەکان کە کلێپتۆکراتەکان دەتوانن بۆ سوود و بەرژەوەندی شەخسی خۆیان قۆرخی بکەن. لەبەر ئەوەی کەم کردنەوەی باج بۆ ئەو بازرگان و کۆمپانیایانەیە کە لە بەرابەردا بەرتیل دەدەن، کلێپتۆکراتەکان ڕێژەیەکی بەرزی باج تەنها بە ناو ڕادەگەیەنن بە مەبەستی ناچار کردنی کۆمپانیا و بازرگانەکان بەرتیل بدەن. ڕەنگە ئەرکی قورس لە

سەر هەژاران و موراجیعەکان دابنێن. بۆ نموونە، لە وڵاتی هاییتیدا، لە نێوان ساڵانی ١٩١٠ تا ١٩٧٠، کاڵا گرانبەهاکان هەمیشە باجیان لە سەر نەبوو، هەروەها باجیش لە سەر " پەمۆ، کاشی و سابوون و نەوتی سپی" دا زۆر بەرز بوو.

کلێپتۆکراتەکان وەک سەرچاوەیەک بۆ بەرتیلی شەخسی خۆیان سەیری سیستەمی نیزامەکان دەکەن. بۆیە ئەو نیزامە و داواکاریانەی بۆ مۆڵەت پێدان دەسەپێنرێن کە هیچ یاسایەکیان نییە جگە لە دروست کردنی بەربەستێک لە بەردەم کۆمپانیاکان بۆ ئەوەی ناچار بن بەرتیل بدەن و ئەو بەربەستە دروست کراوەی بەردەمیان بشکێنن. کلێپتۆکراتەکان دژی چاکسازی یاساکان دەوەستنەوە گەر چاکسازیەکان ببنە هۆی گۆڕینی سیستەمە نایاساییەکان بۆ سیستەمی یاسایی. کلێپتۆکرات جەخت دەکاتەوە لە سەر پارە کۆکردنەوە و وا لە هاوڵاتی و کۆمپانیاکان دەکات هەمیشە پارە بەوان بدەن. بێگومان، تەنانەت ئۆتۆکراتە گەندەڵەکانیش ڕەنگە پێویستییان بە قایلکردنی دانیشتوان بێت تاوەکو هەر لە سەر دەسەڵات بمێننەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەرنامەی وەها دادەڕێژن کە وا لە زەنگینەکان بکات ناچار بن بەرتیل بدەن. بۆ نموونە، سەرکردە، ڕەنگە هەڵسێت بە دانانی سیستەمێک بۆ وەگەڕخستنی پارە و دەسەڵاتی ڕەها لای خۆی چەسپ دەکات بۆ دابەشکردنی سوودەکانی ئەو سیستەمە. هیچ کەس ناتوانێت ئەو سوودانە بەدەست بهێنێت لە ڕێگەی هەق و ڕاستییەوە. هەر کەسێک کە بیەوێت ئەو سوودانە بە دەست بهێنێت دەبێ بەشی سەرکردەشی لێ بدات.

سەرکردەی کلێپتۆکراتی دەتوانێت کاریگەری هەبێت لە سەر سوودەکانی کارکردن و پسپۆریەتی. سەرکردەیەکی گەندەڵ تایبەتتر لەوانی تر بە پەرۆشە بۆ قۆرخکردنی دەسەڵات بۆ ئەوەی لە هەموو مامەڵەیەک و بازرگانییەک و پڕۆژەیەک بەشێک دەسکەوتی هەبێت. سەرکردەی گەندەڵ بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕێگە بەوانی تر دەدات بازرگانی بکەن بەڵام دەبێ بە جۆرێک لە جۆرەکان بەشی ئەویشی تێدا بێت. بۆ نموونە، کۆمپانیایەکی زەبەلاح و تایبەت سوودێکی زۆر کەمی دەبێت بۆ وەگەڕخەرەکانی گەر لە هەموو کارێکی بەرتیل بدات، بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت قەرەبووی ئەو بەرتیلانە بکاتەوە. بەڵام گەر دەوڵەت لە داهاتوودا کارێکی وا بگرێتە



بەر کە بتوانێت تایبەتمەندێتی ئەو کۆمپانیایانە بپارێزێت ئەمەش لە ڕێگەی پرۆسەیەکی دوور لە فرۆفێل و بەرتیل و گەندەڵی ئەنجام دەدرێت، کە ئەمەش کارێکی زۆری دەوێت. بەڵام سەرکردەیەکی گەندەڵ دووچاری کێشەی تایبەتی دەبێتەوە چونکە تەنها گرینگی دەدات بە دەوڵەمەند کردنی خۆی. وێڕای ئەمەش، هەتا گەر ئەو سەرکردەیە بتوانێت گرێبەست مۆر بکات لەگەڵ وەگەڕخەران، ڕەنگە نیگەران بن لەوەی کە سەرکردە گەندەڵەکە حاڵەتی ئەوانیش دەخاتە ژێر مەترسییەوە. گۆڕانێکی ڕیشەیی لە ڕژێم دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی تێگەیشتنەکانی پێشوو.

ڕەنگە کلێپتۆکراتێک دژی هەندێ لە تایبەتمەندێتییەکان بوەستێتەوە کە لە نێو ڕژێمێکی ڕاستگۆدا وەک شتێکی شیاو سەیر دەکرێت و پشدگیری ئەوانی تریش دەکات بەڵام پشتگیری ئەوانە ناکات کە بەرهەمهێنەری بەرتیل و گەندەڵین. بێ هێزی سەرکردە لە دروستکردنی پابەندبوونێکی بە متمانە بەهای وەگەڕخەرێکی کۆمپانیای تایبەت دەهێنێتە خوارەوە، دەوڵەتیش هەر وا بە کزی و بوودەڵەیی دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەش، خاوەندارێتی دەوڵەت تەنها لە ژێر دەسەڵاتی ئەو کەسانە دەبێت کە تەنها بە دوای پڕکردنی گیرفانی خۆیاندا دەگەڕێن. کۆنترۆڵی حکومەت لە سەر پڕۆژە گەورەکان خۆی لە خۆیدا ڕێگەیەکە بۆ مانەوە لە سەر دەسەڵات شان بە شانی گەندەڵی. ئەو جۆرە سەرکردانەش دەتوانن ئەو کەسانەی کە هەڕەشە بن لە سەر ئەوان بدەنە دەستی دادگا و بە گەندەڵ لە قەڵەمیان بدەن.

بەڵام لە هەندێ هەلومەرجی تردا، سەرکردەی کلێپتۆکرات خۆی دەبێتە خاوەن کۆمپانیای تایبەت. بۆ نموونە، ئەو جۆرە سەرکردەیە دەبێتە ئەندازیاری تایبەتمەندێتی تاوەکو بتوانێت هەرچی سوود هەیە بۆ خۆی و خێزانەکەی بێت، هەموو شتەکانیش بە نرخێکی کەمتر لە بازاڕ بە دەست بێنێت. بۆ نموونە، سەرۆکی وڵاتی ئەندەنووسیا " سوهارتۆ" پشتگیری ژمارەیەک تایبەتمەندێتی کرد کە بوونە هۆی گواستنەوەی کاڵاکانی ئەو کۆمپانیایانەی کە هی مناڵەکانی بوو. ئەو جۆرە سەرکردەیە هەمیشە بۆ دەسکەوتی هەنووکەیی دەستبەرداری لێشاوی داهاتی داهاتوو دەبێت. گەر بێت و سەرکردە لە پاشەڕۆژی خۆی بترسێت نەوەک لە سەر پۆستەکەی لا بدرێت، ئەوا تا زووە شتێک بۆ دوا ڕۆژی خۆی دابین دەکات. لە لای ئەو

جۆرە سەرکردەیە شتێکی زۆر ئاساییە گەر شتەکانی خۆی بە نرخێکی زۆر گران لە نێو بازاڕدا بفرۆشێت.

لە هەندێ ڕێگادا، کلێپتۆکرات دەبێتە شکێنەری بۆرسە یان وەکیلی عەقارات و پارە قازانج دەکات لە ڕێگەی فرۆشتنەوە. دەسکەوتە گەندەڵییەکان نەک هەر تەنها لە دەستێوەردانی بەردەوامی حکومەتەوە بەدەست دێت بەڵکو لە گۆڕانێکی سادەوەش. سەرکردە دەتوانێت پشکێک بە دەست بێنێت لە هەر جۆرە مامەڵەیەک بێت کە لە نێو وڵاتدا ئەنجام دەدرێت، هەربۆیەشە پشتگیری تایبەتمەندێتی هەندێ لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەکات کاتێ پشتگیری ئەوانی تریش دەکات.

سەرکردە بە دوو شێوە بەرتیل وەردەگرێت: یان ئەوەتا کۆمپانیا زەبەلاحە لێهاتووەکان دەخاتە نێو چوارچێوەی تایبەتییەوە بە نرخێکی هەرزان، یانیش ئەوەتا کۆمپانیا تایبەتییە کار خراپەکان دەخاتە نێو چوارچێوەی نێو نەتەوەییەوە بە نرخێکی گران. بە بێ پابەندبوونێکی باوەڕپێکراو بۆ گۆڕانی بەردەوام، وەگەڕخەرە تایبەتییەکان ئارەزووی چوونە نێو گرێبەستێک ناکەن کە مایەی مەترسی بێت بۆ سەر ئەوان.

بە کورتی، کلێپتۆکراتێکی بەهێز دەوڵەتێکی لێهاتوو و توند بەڕێوە دەبات کە لە سنووری بێتوانایی ئەودا ناچێتە دەرەوە لە پێناو دروستکردنی پابەندبوونێکی باوەڕپێکراو. کلێپتۆکراتێکی بێ هێز دەوڵەتێکی پڕ لە گرفت و ناشایستە دەبات بەڕێوە و پێکیش هێنراوە بۆ بەدەستهێنانی بەرتیل لە خەڵکی و بازرگانەکان. بەڵام، هەندێ لە شرۆڤەکاران زۆر بایەخ بە گەندەڵی لە نێو بەرپرسە گەورەکان نادەن، بەڵکو مشتومڕی سەرەکییان لە سەر گەندەڵییە لە نێو بەرپرسە پلە نزمەکان کە هەمیشە بە دوای دەسکەوتی تایبەتدا دەگەڕێن. گەر کەس خاوەنی ئاوگەیەکی گشتی نەبێت، ئەوا هەوڵێکی زۆر لە ماسی گرتندا بە فیڕۆ دەچێت. یەکێک لە ڕێگایەکان بۆ زیادکردنی کرێی زیاتر دروستکردنی یاسا و نیزامی زیاترە. بە پێی ڕای " شلێفەر و ڤیشنی" پڕ زەرەرترین حاڵەت ئەو ئەگەرەیە کە ئۆتۆکراتە نوێیەکان هەوڵ دەدەن پشکێک لەو کرێیە بەدەست بێنن. گەر سەرۆکێک ڕۆژانە کەمێک کۆنترۆڵی بە سەر وەزیرەکاندا هەبێت، ئەوا هەڵسوکەوتی بەخۆڕاییان زۆر بە کولفە دەبێت. گەر



کۆنترۆڵی زۆرتری هەبێت، ئەوا ڕەنگە کەیفی بە " لیبراڵی بوون" ێکی سنووردار بێت و هەروەها لەوانەیە پاڵپشتی چاکسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان بکات بۆ بەهێز کردنی کۆنترۆڵەکەی. هەرچەند چاکسازی داهاتی ئەو سەرۆکە زیاتر بکات ئەوەندە پشتگیری پرۆسەی چاکسازی دەکات.

بەڵام، تەنها لەبەرئەوەی سەرۆکێک کەیفی بە هەندێ جۆری چاکسازی دێت، گوێ بەوە نادات کە گەندەڵی نێو ئاست بەرزەکان کەمتر تێک شکێنەرترە لە چاو گەندەڵی نێو ئاست نزمەکاندا. ئەو سەرۆکە زۆر دەگمەنە بە شێوەیەکی بەرچاو کۆنترۆڵی هەموو سەرچاوەکانی دەوڵەت بکات. قەبارەی مەلەوانگە گشتییەکە کە لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدایە لە لایەن هێزە دەرەکییەکانەوە دروست نەکراوە بەڵکو لە بری ئەوە ڕەنگە دەسەڵاتێک هەبێت بۆ فراوانکردنی سەرچاوەکان لە ژێر ئەو کۆنترۆڵەدا، هەروەها بەرپرسە گەورەکانیش هەمیشە دەسەڵاتیان زیاترە بۆ زیاد کردنی دەوڵەمەندی دەوڵەت بە بەراورد لەگەڵ بەرپرسە بچووکەکان. وێڕای ئەمەش، بە شێوەیەکی گشتی سەرۆکە گەندەڵەکان دەبێ بە ئالیەتی ناتەواودا کار بکەن. لە بری دەست بەسەراگرتنی هەموو موڵکی تایبەت و ڕێکخستنەوەی بۆ بەرهەمهێنانی باشتر، ئەوانە لە پێشەوە دەبن کە خۆیان شایستە نین. دەتوانن ئاستی باج و دەسەڵاتی نیزامی زیاد بکەن و باج سووک بکەن لە بەرابەر بەرتیل و بە نەتەوەیی کردنی پیشەسازییەکان. دەتوانن سیاسەتی پاراستنی گشتی بخەنە ڕوو کە لەو دیو بەرپرسە پلە نزمەکانەوەیە. دەتوانن پرۆژەی ئاڵۆز و گران و پڕ لە سەرمایە پێشکەش بکەن کە بەکاربهێنرێن بۆ بەدەستهێنانی بەرتیل. بۆ نموونە، لە هایتیی، دام و دەزگاکانی حکومەتە دیکتاتۆرییەکان بوونەتە بەربەستێک لە بەردەم گەشەسەندن و کاریگەرترین ڕێگا بۆ مژینی دەسکەوتەکان. سەرەڕای ئەمەش، کالا بە سامانەکانیان لە ڕێگەی چاودێری یان سەقامگیرییەوە وەبەرهێنران، بەڵام کالای وەگەڕخستنی نەزۆک بوون. سیاسەتەکانی دەوڵەت کە بوونە بەربەست لە بەردەم گەشەسەندن وای لە هایتییە زیرەکەکان کرد کۆچ بکەن. هیچ سەرۆکێک تەواو متمانەی ئەوەی نییە کە لە سەر دەسەڵات دەمێنێتەوە بۆ تا هەتایە. ئەوانەی کە دەوڵەمەند دەبن لە بەرژەوەندی سەرۆکەوە حەز ناکەن شتەکانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە لە ترسی گۆڕانی ڕژێمەکە.

بێگومان، هەندێ سەرکردەی باڵا دەست دەتوانن ئەو جۆرە سیاسەتە ناشایستانە لابدەن. ئەو سەرکردانە خۆیان و خێزانەکانیان دەوڵەمەند دەکەن، بەڵام تا ئێستا پاڵ بە بەرنامەکانی وەبەرهێنانی کرێ نادەن هاوکات زۆر بە جدی هەوڵی بەلاوەنانی گەشە دەدەن. ئەو وڵاتانەی ڕێژەیەکی زۆری گەندەڵیان هەیە و لە ڕووی سیاسییەوە سەقامگیرن و لە سەرەوە کۆنترۆڵ کراون ڕەنگە بناڵێنن بە دەستی کارە ناشایستەکانەوە لە چاو ئەو وڵاتانەی کە بە بێ هیچ بنەمایەکی هەماهەنگی کردن شەڕ لە پێناو دەسکەوتی تایبەتی دەکەن. سەرۆکی ئەو جۆرە وڵاتانە بۆ ماوەیەکی درێژ لە سەر حوکم دەمێننەوە، ئیتر هەوڵ دەدەن هەموو کارێک بکەن بۆ ئەوەی زۆرترین ڕێژەی ئەو دەسکەوتە تایبەتییانە بەدەست بێنن. ئەم جۆرە ڕژێمانە زۆر نزیکن لە وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات کە میکانیزمی دامەزراوەییان هەیە بۆ پرۆسەی گەڕان بە دوای دەسکەوتدا بە شێوەیەکی عەشوائی لە لایەن بەرپرس و بازرگانە تایبەتییەکان. تەنانەت لەو دەڤەرەش، ئەو وڵاتانەی کە کەمتر گەندەڵیان تیادا هەیە باشتر دەتوانن سەرنجی وەگەڕخستنی دەرەوە ڕابکێشن بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە گەندەڵەکانی دراوسێکانیانەوە. وێڕای ئەمەش، هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا، داهاتووی زۆرێک لە سەرۆکە گەندەڵەکان زۆر مسۆگەر نین، هەروەها سەرچاوەی مسۆگەر نەبوونەکانیشیان کارە خراپەکانی خۆیانە کە ڕۆژێک هەردێ ئاشکرا دەبن.

ڕەنگە کلێپتۆکراتەکان تووشی کێشەی زیاتر ببنەوە، کێشەکانیش لە سەر کۆنترۆڵی بیرۆکراتیانەن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان تووشی سەرکردە کار چاکەکان نەبوونەتەوە. گەندەڵی لە سەرەوە ڕا پێشبینی لە نێو ئەو بیرۆکراتانە دروست دەکات کە دەبێ لە سامانەکەدا هاوبەش بن و هەروەها هەر ئەو گەندەڵییە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کاریگەری مەعنەوی و دەروونی لە سەر بەرپرسە پلە نزمەکاندا. ئاستی نزمی ئابووری لە لایەن سەرکردەیەکی ڕاستگۆوە کۆنترۆڵ دەکرێت، بەڵام دەبێتە هۆی کارەساتێک لە لایەن سەرکردەیەکی ناپاکەوە. سەرکردەی کلێپتۆکراتی ڕەنگە نەتوانن ئەو هەلومەرجە پێویستییانە بخولقێنن بۆ سیستەمێکی بیرۆکراسی ڕاستگۆ تا بەرەو پێشەوە بچێت. ئێستاش زۆرێک لە ئەگەرەکانی وەبەرهێنانی کرێ بە بێ بوونی ستافێک بۆ جەختکردنە سەر بەربەستەکان و کۆکردنەوەی بەرتیل



دەستەبەر ناکرێت. بۆیە کارمەندە مەدەنییە گەندەڵەکان وا لە سەرکردەی گەندەڵ دەکەن کە زۆر بە پەرۆش نەبێت لەبارەی زیاد کردنی قەبارەی دەوڵەت چونکە پشکێکی بچووکتر بەدەست دێنێت لە دەسکەوتەکان بە بەراورد لەگەڵ بەرپرس و سەرکردە ڕاستگۆیەکان. ئەو توانا و لێهاتووەی کە سەرکردە دەتوانێت بە هۆیەوە سوودی تایبەتی لە کۆمەڵگاوە بە دەست بێنێت لە لایەن سیستەمی بیرۆکراسی گەندەڵەوە کەم دەکرێتەوە و نەک بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی سەرکردە خۆی. گەر سەرۆک خزمەتگوزارییەکی مەدەنی باش و بە ڕاستگۆیی دابین بکات و هەروەها دەسکەوتەکان تەنها لەگەڵ دارو دەستە باوەڕپێکراوەکانی بەش بکات، ئەوا ئەو سەرۆکە باشتر لێ دەچێتە دەرەوە، بەڵام ئەمەش زۆرجار کارێکی مەحاڵە.

بەرپرسە پلە نزمە گەندەڵەکان لێنەهاتوویی و نەزانینی خۆیان لە پاڵ دواخستنی کاری هاوڵاتیان دەخەنە ڕوو بەهۆی دەستێوەردانی کاروباری ئەوانی تر و چەواشە کردنیان. سەرەنجامی ئەمەش، تۆڕی داهاتی نەتەوەیی سەرۆکێک دادەبەزێت بە بەراورد لەگەڵ سیستەمێکی بیرۆکراسی لێهاتوو جا لە هەر ئاستێکی دەستێوەردانی دەوڵەتەوە بێت. بەلایەنی کەمەوە هاوڵاتیان هەندێ متمانە لە دەست دەدەن لە بەرابەر ئەو گەندەڵییەی کە لە دابینکردنی خزمەتگوزارییەکاندا هەیە. ئایا هاوڵاتیان حەز بەوە دەکەن کە کلێپتۆکراتێک بتوانێت سیستەمێکی بیرۆکراسی ڕاستگۆیانە مسۆگەر بکات یاخود یەکێک کە بە دڵنیاییەوە گەندەڵە؟ هیچ وەڵامێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەم پرسیارە ڕێی تێ ناچێت. لە حاڵەتی پێشوودا، سەرۆک دەتوانێت ئاستی دەست تێوەردانی دەوڵەت دیاری بکات بە ڕادەیەک کە زۆرترین سوودی بۆ دەسکەوتەکانی خۆی هەبێت و دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی ئەو کار بکات. لە حاڵەتەکەی دواتر، سەرۆک ئاستێکی نزمتری ئەو دەست تێوەردانە دەستنیشان دەکات، بەڵام خزمەتگوزارییەکان لە لایەن بەرپرسێکی گەندەڵ و ناشایستەوە دابین دەکرێن.

## قۆرخکردنی دوو لایەنە و ئەو وڵاتانەی مافیا زاڵە بە سەریاندا

ئێستا دێمە سەر باسی ئەو دوو حاڵەتەی کە تیایاندا بەرژەوەندییە بەهێزە تایبەتییەکان دەتوانن بەرەنگاری داوا گەندەڵەکان ببنەوە و دەسەڵات بە سەر دەوڵەتدا پیادە بکەن. حاڵەتەکان جودان بە پشت بەستن بەوەی ئایا دەوڵەت لە بنەڕەتەوە پێک هێنراوە بۆ کۆکردنەوەی بەرتیل.

لە حاڵەتی یەکەمدا، سەرۆکێکی گەندەڵ بە تەنیا تووشی ڕکابەرێکی سەرەکی دەبێتەوە. لەم بارودۆخەشدا، بە هەمان شێوەی قۆرخکردنی دوو لایەنە، بەدەستهێنانی هەر کرێیەک لە نێوان بەرتیلدەر و سەرۆک دابەش دەکرێت. هێزی بازووی هەردووکیان جەخت لە سەر چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکان دەکەنەوە. هەروەها جەخت لە سەر قەبارەی هەموو دەسکەوتەکەش دەکەنەوە. گەر هەندێ لە دەسکەوتەکان لە ڕێگەی یارمەتی دەوڵەتەوە دروست بێت، هەروەها گەر سەرۆک ترسی هەبێت لە لەدەستدانی هەموو دەسکەوتەکان بۆ دوژمنەکانی، ئەوا بە هیچ شێوەیەک کار ناکات. هەر لایەنە و هەموو کۆششی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی لە سەر حیسابی خراپتر کردنی باری کەسانی دیکە باری خۆی باشتر و بەرەوپێشتر ببات ئەمەش لە ڕێگەی زەوتکردنی موڵکەوە، ئەمە لە لایەک، یاخود تێوەگلاندنی ئەوانی تر لە کاری توندوتیژی لە لایەکی ترەوە.

" گامبێتا" مافیا پێناس دەکات وەک گروپێکی ڕێکخراو بۆ ئەنجامدانی تاوان کە خزمەتگوزاری لە پێناو پاراستن دابین دەکەن وەک بەدیلێک بۆ ئەو خزمەتگوزارییەی لە لایەن دەوڵەتەوە دابین دەکرێت لە نێو کۆمەڵگا ئاساییەکاندا. لە هەندێ حاڵەتی دوو لایەنەدا هەم دەوڵەت و هەم مافیاش هاوپشکن لە پاراستنی بازرگانی و تەنانەت هاوبەشن لە هەندێ ئەندامیشەوە. سەرۆکێکی بەهێزی گەندەڵ لەم دەقەدا پشکێک لە دەسکەوتەکانی مافیا وەردەگرێت و تەنها بەرژەوەندیەکی کەمی دەبێت لە کۆنترۆڵکردنی کاریەگەرییەکانی تاوان. لە بەرئەوەی تاوانباران بەرژەوەندیان لەوەدایە کە وەک هەر یەکێکی تر دەوڵەمەند بن، گەشبینەکان ڕەنگە ئەو باوەڕەیان هەبێت کە گەر تاوانباران بەڕاستی کۆنترۆڵی حکومەت بکەن ئەوا ئەو ڕێگایانەی کە



کاری لە سەر دەکەن چاک دەکەن. بەڵام ئەمە هەر لە یوتۆپیایەک دەکات. لەوانەیە یەکێک پێشبینی ئەوە بکات کە گەر تاوانباران کۆنترۆڵی دەوڵەت بکەن، ئەوا دواتر دەست دەکەن بە سنووردار کردنی هەڕەشە و توندوتیژییان و نەهێشتنی کێبڕکێ هەروەک لە بازرگانی مادده سڕکەرەکاندا وایان کردووە. وێڕای ئەمەش، سەرۆکەکانی گروپی ڕێکخراو بۆ تاوان ڕەنگە زۆر بە پەرۆشتر بن بۆ قازانجی خێرا لە ڕێگەی هەناردنی کاڵا و کەرەستەی خاوی وڵاتێک تا لە ڕێگەی ئەرکێکی زەحمەتی بونیاتنانی بنکەیەکی مۆدێرنی پیشەسازی. دوا ئاکامی ئەمەش بە شەرعی نەبوونی حکومەت و ئیفلیج کردنی دامەزراوە سەرمایەدارییەکانە.

بەدیلی ئەمەش، هەندێ وڵات هەن لە ڕووی ئابووریەوە پشت دەبەستن بە هەناردنی یەک یان دوو کانزا یاخود بەرهەمە کشتوکاڵییەکان. ڕەنگە ئەو وڵاتانە پەیوەندی درێژخایەن دروست بکەن لەگەڵ هەندێ کۆمپانیای زەبەلاحی نێودەوڵەتی. هەردوو لا هەم سەرۆکەکان و هەمیش کۆمپانیا زەبەلاحەکان کەیفیان بە بەرهەم دێت، بەڵام هاوپەیمانێتی حکومەت لە سەر بازرگانی ڕەنگە ببێتە ئاکامی ئەوەی ڕێگە بدەن بە بەڕێوەبەر و سەرۆکەکان پشکیان هەبێت لە سامانی نەتەوەیی لە سەر حیسابی خەڵکی ئاسایی. دابەشکردنی دەسکەوتەکان دەوەستێتە سەر دەسەڵاتی مامەڵەی ڕێژەیی لایەنەکان. گەر کۆمپانیای زەبەلاح بە سەرمایەیەکی جێگیر شتی وەبەرهێنا یاخود ئەگەر ئەو شتەی کە وەبەری هێنا کەرەستەیەکی خاو بێت و تەنها لە چەند شوێنێکی کەم هەبێت لە سەر ڕووی زەوی، ئەوا سەرکردەکانی وڵاتەکە لە پێگەیەکی بەهێزدا دەبن بۆ بەدەستهێنانی ڕێژەیەکی زۆری سوودەکان. بە پێچەوانەوە، گەر کۆمپانیاکە بەرهەمێکی کشتوکاڵی وەبەر بێنێت، وەک مۆز کە بە ئاسانی دەگاتە هەموو شوێنێک، یاخود گەر کەرەستە خاوەکە هەبێت بۆ کۆمپانیاکە لە گەلێ شوێنی جیا جیادا، ئەوا کۆمپانیاکە سوودێکی مامەڵەی دەبێت و دەتوانێت داوا لە وڵات بکات بۆ دابینکردنی ژێرخانی بە سوود و مسۆگەری ئاشتی کرێکاری بکات و باجی کەم وەربگرێت. ڕەنگە هیچ کەس گەندەڵی بە شێوەیەکی زەق لە نێو ئەو ڕژێمانەدا نەبینێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئازار و نەهامەتی وەک دوو ئاکامی نەزۆکی ئەو گەندەڵییە هەموو هاوڵاتییەکی ئاسایی و خەڵکێکی هەژار و ڕەش و ڕووت لە بن

دێنێت. وڵاتیش دەبێتە پەراوێزێک بۆ وەبەرهێنەرە زەبەلاحەکان.

مەرجەکانی قۆرخکردنی دوو لایەنە بۆ گرێبەستێکی تایبەتی سەر هەڵدەدات. بە هەقیقەت، کلێپتۆکراتێک پاڵنەری ئەوەی هەیە ئەو جۆرە مەرجانە بخولقێنێت لە ڕێگەی بڕیاردان لە بارەی ئەوەی پشتگیری چ پرۆژەیەک و کام کۆمپانیا پەسەند بکات. گرێبەست کردن لەگەڵ کۆمپانیا زەبەلاحەکان لە نێو بازاڕی کێبڕکێدا باوی نییە چونکە هیچ سوودێکی گونجاوی بۆ ئەوان تیادا نییە. سەرۆک ئەولەویاتەکانی گرێبەست چەواشە دەکات بەهۆی ئەو پرۆژانەی کە تەنها دەتوانرێن لە لایەن ئەو کۆمپانیایانەوە بەرهەم بهێنرێن کە قازانجێکی یەکجار بە شێوەی قۆرخکردن بەدەست دێنێت. بێگومان، کلێپتۆکراتێکی بەهێز و پشت ئەستوور بە حەسانە نیگەران نابێت دەربارەی ئەو جۆرە باس و خواسانە. زۆر بە ئاسانی دەتوانێت فەندی گشتی یاخود پارەی هاوکاری بنێرێت بۆ نێو حیسابی لە بانق، دواتر لە بەرابەر ئەوەدا ڕێژەیەکی نێودەوڵەتی قازانجی دەست دەکەوێت. ئەم هاودژییەی نێوان کلێپتۆکراتە بەهێز و بێ هێزەکان نوکتەیەکی خۆشمان بیر دێنێتەوە کە هەمیشە دەوترێتەوە لە نێو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا. سەرۆکی "١" کۆشکە نوێیەکەی بە سەرۆکی "٢" نیشان دەدات. ١ ئاماژە بە هێڵە خێرا نوێیەکە دەکات و وەسفی خانووە نوێیەکەی دەکات و دەڵێت " لە سەدا سی". پاشان، ١ سەردانی ٢ دەکات کە کۆشکی ئەو لە کۆشکی ١ زۆر نایابترە. ١ پرسیاری لە ٢ کرد ئەو پارەیەی لە کوێ هێناوە؟، ٢ لە وەڵامدا ووتی " ئەو هێڵە خێرایە لەوێ دەبینی؟"، ١ حەپەسان دایدەگرێت چونکە هەرچەندی سەیری دەرەوە دەکات هیچ هێڵێکی خێرا نابینێت. دواتر ٢ دەڵێت ئەمە " ئەمەیە باسەکە، لە سەدا سەد". واتە لە سەدا سەدی پارەکەی لە خەزێنەی حکومەت سەرف کردووە لە سەر حیساب و خوێنی ڕەش و ڕووتان!

ئەم چیرۆکە هەمیشە بەکار دێت بۆ نیشاندانی ئەوەی کە گەندەڵی کەمتر بە ئازارە گەر ڕێگایەکە بەڕاستی دروست بکرێت. بەڵام ئەو ئەنجامە هەموو جارێ ناسەلمێنرێت. گەر بەرپرس پشتگیری ئەو پرۆژانە بکات کە دیزاین کراون بۆ شاردنەوەی کرێیەکان بە ئاسانی، ئەوا کاریگەری چەواشەکاری ئەو جۆرە بڕیارانە ئێجگار زۆر دەبێت. هێڵێکی خێرای نوێ بەشێکی گرانبەهایە لە ژێرخانی هەر نەتەوەیەک، بەڵام گەر ئەو ڕێگایە تەنها بۆ بەردەم ماڵی سەرۆک بێت ئەوا هیچی تر



پێویست ناکات لەسەری بڕۆین. گەر هیچ ڕێگایەک دروست نەکرێت، واتە ساختەکاری وجوودی هەیە و ئامانجەکانی گەشەپێدان لەباربراوە، بەڵام وڵات نەتەنیوە بە " فیلی سپی" گرانبەها! باجدەران و دامەزراوە هاوکارییەکانی دەرەوە لە ڕووی داراییەوە سامانی سەرۆکیان زیاد کردووە و فەندەکانی خۆیان لە مەبەستە یاساییەکانەوە دزیوەتەوە. ئەمە کارێکی ناعادیلانەیە و بەڵگەیەک دەدات بە دەستەوە بۆ بڕینی ئەو جۆرە هاوکاریانەی دەرەوە. بەڵام لە ژێر هەلومەرجی ئابووری سەرکەوتوو، هیچ شتێک بە قەد ئەوە ناشایستە و قاندڕ نییە کە سەرۆکێک دەستی لەگەڵ سوود و قازانجی بانقەکانی دەرەوەدا هەبێت.

گەر کلێپتۆکراتێک تووشی تاکە بەرتیلدەرێک بێت، ئەوا پێکەوە ڕێک دەکەون و دەسکەوتە ئابوورییەکان لە نێوە خۆیاندا دابەش دەکەن. پارەی گەندەڵ کەمترە لە حاڵەتێکی قۆرخکاری دوو لایەنە بە بەراورد لەگەڵ کلێپتۆکراتێکی یەک لایەنە و بە تەنیا پارە وەرگرێت. بەرتیلدەر دەسەڵاتی مامەڵەی هەیە و بۆ دەسکەوتنی قازانج بەکاری دێنێت. بەڵام، ئەنجامی کۆتایی هەمیشە ئەنجامێک نییە بە دڵی ئەوان. قەبارەی بەرتیلەکان گۆڕانی سەرەکی نین. لە بری ئەوە، چەواشە ئابوورییەکان و کولفەی بەرزی پرۆژە حکومیەکان ئازاری هاوڵاتیان دەپێوێت. قازانجەکانی قۆرخکردنی تایبەتی و بەرتیلەکان حیزبەکان دەوڵەمەند دەکەن و خەڵکی ڕەش و ڕووت و هاوڵاتی ئاسایی هەر بە دۆڕاوی سەر دەنێنەوە.

ئێستا با باسی حاڵەتێک بکەین کە بەرپرس و فەرمانبەرە بێهێزەکان و دەوڵەتێکی بێ سەر و بەر دووچاری بەرتیلی سەربەخۆ دەبنەوە هاوکات دووچاری دەسەڵاتی قۆرخکاریش دەبنەوە لە کەرتی تایبەتدا. ڕەنگە دەوڵەتەکە بنەماکانی دیموکراسی بە خراپی جێبەجێ بکات یاخود سیستەمێکی ئۆتۆکراسی هەیە بەڵام سەرۆکەکەی بێ هێزە. هەروەک لە حاڵەتی قۆرخکاری دوو لایەنە، قۆرخکەر وەک مافیایەکی مەحەلی وایە، دەستەیەکی فراوان بەڵام بە تەنیا، یاخود حاکمێکی توند. لە هەر حاڵەتێکدا، دەسەڵاتی تایبەتی زاڵ دەبێت بە سەر دەوڵەت، کڕینی دەستەی بەرپرسان و فەرمانبەران. بەڵام، کەرتی تایبەتی ئەوەندە بە دەسەڵات نییە زاڵ بێت بە سەر دەوڵەتدا، هەروەها دانیش بەوە دائەنێت کە دەستەیەکی یەکگرتوون. کێشەکە بۆ کەرتی تایبەت ئەوەیە کە نارێکی دەوڵەت توانای گرووپی تایبەت کەم دەکاتەوە لە

کڕینی ئەو شتانەی کە دەیەوێت. دروستکردنی ڕێکەوتنێک لەگەڵ بەرپرسێک هانی ئەوانی تریش دەدات بە دوای ڕێکەوتندا بگەڕێن. ئەو وڵاتەی تیایدا بەرپرسەکان ڕکابەری و کێبڕکێ دەکەن لە سەر ئەوەی کامەیان دەسکەوتی زیاتر لە ڕێگەی گەندەڵییەوە بەدەست دێنێت وڵاتێکی دواکەوتوو و بوودەڵەیە. تاک ناتوانێت خۆی دەسکەوتێکی ئەوتۆ بەدەست بێنێت، ئیتر ناچار دەبێت ڕکابەری یەکتر بکەن بۆ دەستەبەرکردنی پشکێک لەو دەسکەوتانەی کە لە لایەن کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکانەوە بەرهەم دەهێنرێن. دووچاری ئەم جۆرە دەسکەوتە سەربەخۆیە، کۆمپانیای تایبەت کەمتر بەرهەم دەهێنێت. چالاکییەکانی بەرپرسی گەندەڵ وەک باجە لە سەر هاوردە و هەناردن کە ئاستی بەرزی سوودی کۆمپانیاکە لە هەناردن کەم دەکاتەوە.

فلیپینییەکان لەوەتەی سەربەخۆییان وەرگرتووە، نموونەیەکن لە دەوڵەتێکی بێ هێز لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ دەسەڵاتێکی ئۆلیگارشی بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی بازرگانی. سیستەمی یاسایی و ئیداری ئەو وڵاتە پێشبینی نەکراو و هاودژە. کارە عەشواییە سیاسییەکان قەدەغەی گەشەپێدانی کەرتێکی تایبەتی بەرهەمهێنەر دەکات. هەندێ لە سەرکردە بازرگانییەکان سوودی تایبەتی وەردەگرن، بەڵام کاریگەری گشتی لە سەر بازرگانی نێگەتیڤە. خێزانە بازرگانە دیارەکان کات و کۆشش سەرف دەکەن بۆ فرە کردنی پەیوەندییە سیاسییەکانیان وەک زەمانەتێک دژی گۆڕانەکان لە نێو ڕژێمدا.

## پێشبڕکێی بەرتیل

لە حاڵەتی چوارەمدا بەرپرسە پلە نزمەکان مامەڵە لەگەڵ ژمارەیەکی ئێجگار زۆر هاوڵاتی دەکەن. هەروەک لەو حاڵەتەی لە سەرەوە باس کرا، ئەم حاڵەتە ڕوودەدات لە دەوڵەتە دیموکراسیەکاندا کە کۆنترۆڵێکی یاسایی بێهێز هەیە لە سەر گەندەڵی و بەرپرسیارێتییەکی خراپی حکومی هەیە. دەشتوانین بڵێین ئۆتۆکراتێکی بێ هێز خزمەتگوزارییە حکومییەکان پەرت و بڵاو دەکاتەوە.

حاڵەتی پێشبڕکێ لە گەندەڵی وەک پێشبڕکێ نییە لە نێو بازاڕ. کێشەی سەرەکی



ئەگەری بەرزبوونەوەی گەندەڵی لە سەرەنجامی ئەو پێشبڕکێیەیە. گەندەڵی لە لایەن هەندێکەوە دەبێتە هاندەرێک بۆ ئەوانی تریش کە بەرتیل پەسن دەکەن و وەردەگرن تا وای لێ دێت ئەوانەی زۆر ڕاستگۆن بەرەو گەندەڵی دەچن. گەلێ شێوازی تیۆری دیکە ئەم جۆرە ئاکامەی لێ دەکەوێتەوە شان بە شانی پارسەنگی دووەم بە گەندەڵییەکی کەم، ئاستی نزمی گەندەڵی لە ماوەی یەکەمدا هانی هەندێکی تر بۆ گەندەڵی دەدات لە ماوەی داهاتوودا.

بۆ دروستکردنی پەیژەیەکی بەرز بۆ گەندەڵی، قازانجی بەرتیل دەبێ زیاد بکات و دواجار دەبێتە هۆی زۆربوونی گەندەڵی. بۆ نموونە، گریمان بەرتیلدەرە بەهێزەکان کەمتەرخەمن دەربارەی ئەوەی کامە بەرپرس یان فەرمانبەر گەندەڵە. دواتر هەرچەند ڕێژەی بەرپرس و فەرمانبەرە گەندەڵەکان بەرز بێت ئەوەندە بینینی بەرپرسێکی گەندەڵ ئاسانتر دەبێت، هەروەها هەرچەند مەترسی پێشکەشکردنی بەرتیل کەمتر بێت، ئەوەندە ژمارەی ئەو کەسانەی کە پێیان وایە لە ڕێگای بەرتیلەوە سوودێکی زۆریان پێ دەگات زۆرتر دەبێت. بە شێوەیەکی ئاسایی ڕەنگە بابایەک هەبێت بیر لەوە بکاتەوە کە کاتێ ئاستی بەرتیل بەرز دەبێتەوە خەڵکی کەمتر ئامادە دەبن بەرتیل بدەن. بەڵام، لەم حاڵەتەدا، لەبەرئەوەی ڕێژەی بەرپرسە گەندەڵەکان زیاد دەکات شان بە شانی زۆربوونی ئەو کەسانەی کە بەرتیل دەدەن. لە ژێر سایەی ئەم هەلومەرجەشدا چەواشەکاری کولفەکانی گەندەڵی لە نێو بەرپرسەکاندا، گەندەڵی لە هەردوو حاڵەتی بەرپرسی پلە بەرز و پلە نزمدا وجوودی دەبێت. گۆڕانە کاتییەکان دەتوانێت گۆڕانێکی درێژخایەن دروست بکات لە ئاستی گەندەڵی بەهۆی لابردنی سیستەمەکە لە بەرزەوە بۆ گەندەڵی پلە نزم.

دەکرێ ئەم ئەنجامەش بەهێزتر بکرێت بەهۆی گەلێ بیروبۆچوونی ترەوە. هەروەکو لە بەشەکەی پێشوودا پێشنیارم کردووە، گەر بنەما ئەخلاقیەکان لە ناوچوون کاتێ ڕووداوەکانی گەندەڵی زیاد دەبن، ئەوا ئەو جۆرە دیاردانە بەشداری لە پەیژەی بەرز و نزمدا دەکەن. هەمان ئەنجام ڕوودەدات گەر ئەگەری لێکۆڵینەوە سەرنەکەوێت کاتێ ڕووداوەکانی گەندەڵی زیاد دەبن. بۆ نموونە، لەوانەیە ئەمە ڕووبدات، گەر بودجەیەکی جێگیر هەبێت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی گەندەڵی و هەروەها گەر ئەوانەی کە یاسا

دەسەپێن پشت ببەستن بە هاوکاری بەرپرس و فەرمانبەری ڕاستگۆ لە ئاشکرا کردنی کارە گەندەڵییەکان. دواجار، گەر چەند بەرپرس و فەرمانبەرێک گەندەڵ بن، ئەوا سەرچاوەکانی دژە گەندەڵی بە شێوەیەکی کاریگەر بەکاردەهێنرێن بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی سست بوونی گەندەڵی لە داهاتوو. بە پێچەوانەوە، گەر بێت و ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەر و بەرپرسان گەندەڵ بن، ئەوا کۆکردنەوەی بەڵگەکان لە سەر کارە گەندەڵەکانیان زۆری تێ دەچێت و تا ڕادەیەک ناکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی هاندانی گەندەڵی زیاتر لە ماوەی داهاتوودا. تەنانەت گەر ڕێژەیەکی کەمتری لەو ماوەیەدا بگیرێن، ئەوا هەر هانی گەندەڵی دەدات ئیتر بەم شێوەیە گەندەڵی پەرت و بڵاو دەبێتەوە.

چاکسازی پێویستی بە گۆڕانی سیستەماتیکییە لە پێشبینییەکان و هەڵسوکەوتی حکومەتدا بۆ بردنی ئەو جۆرە دەوڵەتە لە گەندەڵی ئاست بەرزەوە بەرەو گەندەڵییەکی ئاست نزم. زۆر پێویستە، ئەو نەتەوانەی دەکەونە حاڵەتی چوارەمەوە، تایبەتتر ئەوانەی کە دەسەڵاتی مەرکەزییان نییە دەبێ ئەو جۆرە چاکسازییە ئەنجام بدەن. سیستەمێکی پێشبڕکێکار و لامەرکەزی گەندەڵی بە باشی بڵاودەکرێتەوە، هەروەها هیچ کەسیش دەسەڵاتی ئەوەی نییە هەڵسێت بە پیادە کردنی سیاسەتێکی پێویست بۆ چاکسازی.



## ئەنجامەکان

پرسێک بۆ ئۆتۆکراسی وەک فۆرمێکی تەکنیکی شایستەی حکومەت، پرسێکی بێ هێزە. کلێپتۆکراسی زۆر بە دەگمەن یەکسان دەبێت بە قۆرخکاری تایبەتی. هیچ سازانێکی سادە نییە لە نێوان ئاست و سەرەنجامەکانی گەندەڵی ڕێکخراوی حکومەت. بۆ نموونە، کەس ناتوانێت بە دڵنیاییەوە بانگەشەی ئەوە بکات کە گەندەڵی لە ئاستی سەرەوەدا ( لای بەرپرسە گەورەکان) زیانی کەمترە بە بەراورد لەگەڵ گەندەڵی لە ئاستی خوارەوەدا ( لای فەرمانبەر و بەرپرسە بچووکەکان). کاریگەری گەندەڵی دەوەستێتە سەر هێز و نەبوونی فشاری کۆمپانیا تایبەتییەکان و ئەو تاکانەی کە بەرتیل دەدەن. لە ژێر قۆرخکاری دوو لایەنەدا، ئەکتەرە بەهێزەکانی نێو حکومەت و کەرتی تایبەت دەسکەوتە ئابوورییەکان لە نێوە خۆیان دابەش دەکەن. ئەو کلێپتۆکراتە بەهێزەی کە تووشی ئەکتەرێکی تایبەتی بێ هێز دەبێت نەک هەر تەنها دەسکەوت بەدەست دێنێت بەڵکو دەوڵەت ئامادە دەکات و ڕێک دەخات سەراپای ببێتە پارە خواردن و گەڕان بەدوای دەسکەوتی شەخسی. ڕووداوی گەندەڵی زۆرە، بەڵام قەبارەی بەرتیل کەمە. تێچووی لێبووردن و لێخۆشبوونی بەرتیل زۆر بەرز دەبێتەوە کاتێک یەکێک وا دادەنێت کە سوودەکان بە لێشاو دەچێتە نێو ئەکتەرە بەهێزە تایبەتەکان لە بەرابەر بەرتیل.

لەگەڵ پەیدابوونی ژمارەیەکی زۆری بەرتیلدەر و بەرتیل وەرگر بازاڕی ئاڵۆز سەر هەڵدەدات. زۆرجار، لە بارودۆخێکی پێشبڕکێکاریدا، بەرتیل دەبێتە هۆی زۆربوونی بەرتیل تا سیستەمەکە چاو بپۆشێت لە گەندەڵی. بەڵام لە ژێر باری هەلومەرجی تردا، ڕاستگۆیی دەبێتە لە دایکبوونی ڕاستگۆیی. چاکخوازان لە بارودۆخە پێشبڕکێکاریەکاندا ئەرکێکی زەحمەتیان لە ئەستۆیە بۆ هاندانی پەیژە بەسوودەکان لە کاتێکدا پەیژە تێکشکێنەرەکان لەناو دەبەن.

دیموکراسی دەتوانێت یارمەتی سنووردارکردنی گەندەڵی بدات گەر بەدیل بدات بە خەڵکی و ناڕەزایی دەربڕن و مەنسەبیان پێ ببەخشێت و پاڵنەریان بۆ بڕەخسێنێت

ڕاستگۆ بن. لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەک من لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەم، ئەوە دەرمانێک نییە بۆ شیفای هەموو نەخۆشییەکان. بۆ هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی دیموکراسی، دەبێ بچینە ئەودیو ناوە سادەکانەوە بۆ هەڵسەنگاندنی فۆرمە بەدیلەکانی دیموکراسی.



## دیموکراسی و گەندەڵی:

## پاڵنەرەکان و چاکسازییەکان

گەر دیموکراسی لە سەر دامەزراوەی یاسایی و بەهێز بونیات نرابێت، ئەوا ئەو دیموکراسیە چوارچێوەیەکی سەقامگیر بۆ چالاکی ئابووری فەراهەم دێنێت. بۆ ئەوەی ئەو چوارچێوەیە بە باشی کار بکات، کەسایەتییە سیاسییەکان دەبێ چاویان لە دووبارە هەڵبژاردن بێت و دەبێ هەست بە ترسێک بکەن دەربارەی ڕوانگەکانیان، بەڵام ترسێکی ئێجگار زۆریش نا. ئەمەش دەبێتە هۆی " هاودژی سەقامگیری". ئاسایشی توند و زۆر لە سەر مەنسەب و کۆنترۆڵ دەبێتە هۆی زیاتر کردنی ڕێکخستنی کاری گەندەڵی. پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاستە: واتە گەر هەر هیچ ئاسایش نەبێت لە سەر مەنسەب و کۆنترۆڵ ئەوا دیسان کاری گەندەڵی زۆر دەبێت.

هێزی بارودۆخی سیاسی پڕ لە پێشبڕکێ پشکەکان بەرز دەکاتەوە و ئەگەری گەندەڵی کەم دەکاتەوە. سیستەمێکی سیاسی پڕ لە پێشبڕکێ دەبێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی گەندەڵی. خێراترین فۆرمی " سزادان" بۆ کەسایەتییە سیاسییە هەڵبژێردراوەکان لە کاتی دەنگداندا ڕوودەدات. ئەوەی هەڵبژێردراوە دەتوانێت شتێک بەدەست بێنێت هەتا گەر بەرتیلەکەی بە شێوەیەکی نهێنیش بێت. بەرتیل و هەڵمەتە نایاساییەکانی کارە خێرخوازییەکان لە بەرابەر سوود دا ئەنجام دەدرێت. زۆرجار " quid pro quo" کەسایەتی سیاسی گەندەڵ نایکەن بە بێ بەرتیل. گەر کەسایەتییە سیاسییەکان دەنگ دژی بەرژەوەندی لایەنگرەکانیان بدەن، ئەوا لە دەنگداندا تووشی ئازار دەبن و دەبێ باجی ئەو کارەیان بدەن. پاڵنەرە جیاکراوەکان بۆ گەندەڵی لە نێو وڵاتە دیموکراسیەکاندا دەوەستێتە سەر ڕێکخستنی پرۆسەی هەڵبژاردن و یاسا دانان، هەروەها دەوەستێتە سەر میتۆدەکانی هەڵمەتی دارایی. ڕەنگە ئەو هۆکارانەش تێکهەڵبکێشرێن. هەندێ لە سیستەمەکانی هەڵبژاردن هانی پێشخستنی حیزبە سیاسییە بەهێزەکان دەدەن لە کاتێکدا ئەوانی تر هانی کەسایەتییە سیاسییەکان دەدەن بۆ پێشخستنی کارە شەخسییەکانیان. ئەگەرە گەندەڵییەکان بەندن بە پەیوەندی نێوان پێکهاتەی سیاسی و سامانی تایبەتی.

## سیستەمەکانی هەڵبژاردن

لە وڵاتێکی دیموکراسیدا، یاساکانی دەنگدان لە هەڵبژاردن و پرۆسەکانی یاسا دانان ئاوێتەی بەرژەوەندییە سیاسییەکان دەبن بۆ کار کردن لە سەر هەڵەکانی گەندەڵی. سیستەمە سیاسییەکان چەند تێکەڵەیەکی جیاوازی سیاسەتە گشتییەکان و سوودەکانی تاک و گروپ دەخاتە بەردەست. هەندێ کاڵای حکومی هەن وەک بەرگری نەتەوەییش سوود دابین دەکات بۆ کۆمپانیا زەبەلاحەکان و ئەو هەرێمانەشی کە گرێبەستی بەرگری و بنکە سەربازییەکان بە دەست دێنن. پاڵنەرەکان بۆ گەندەڵی بەرزترن گەر دەوڵەت سوودی تاک دابین بکات، بەڵام پەیوەست بوونی نێوان گەندەڵی و پێکهاتەی سیاسی پەیوەستییەکی ئاڵۆزە.

## گەندەڵی و ڕێکخراوی سیاسی

با دوو جۆرە ڕێکخراوی سیاسی هاودژ بە نموونە بهێنینەوە. یەکەمیان، سیستەمێکی دیموکراسییە کە سوودی بەرتەسک دابین دەکات و پێویستی بە گەندەڵی نییە بۆ چەند گروپێک تایبەت بە ڕێچکەیەکی سیاسی. بۆ نموونە، لە ناوچەیەک کە سیستەمی فرەیی تیایە و هاوکات حیزبی بێهێزیشی هەیە، سوودمەندانی بەرنامەکانی حکومەت ڕەنگە لە ڕووی جوگرافیەوە چەند گروپێک بن لە نێوان دانیشتوان و کارگە مەحەلییەکان. بە هەمان شێوە، لە نوێنەرایەتی ڕێژەییشدا، بەرژەوەندی تەسک لەوانەیە بتوانێت حیزبی سیاسی نەتەوەیی دامەزرێنێت و کاریگەرییەکی سەرەکیشیان هەبێت. بۆیە لەوانەیە سیستەمێک بە تەواوی نزم بێت لە سەر پێوەری گەندەڵی سیاسی چونکە ئەو گروپانەی کە بەرتیل دەدەن درک بەوە دەکەن کە پێویست ناکات ئەو کارە بکەن.

تەنانەت لەو جۆرە سیستەمانەشدا، هەموو گروپە تەسکەکان کاریگەرییەکی سیاسی ڕاستەوخۆیان نییە. هەندێ لەوانەیە هەوڵی کڕینی سوودەکان بدەن یان لە ڕێگەی هەڵمەتە یاساییەکانی دیاری و یاخود هەڵمەتی نایاسایی بەشداری کردن و بەرتیل دان. ئەو حۆرە پارەدانەش لە لایەن کەسایەتییە سیاسییەکانەوە هەمیشە لێی دەبوردرێت گەر حکومەت بە چاوی زۆربەی هاوڵاتیانەوە سەرچاوەیەک بێت بۆ سوودە



تایبەتییەکان. کەمی گوزەرانی خەڵک گڕ لە چاودێری یاسایی و ئارەزووە نایاساییەکان بەر دەدات. گەر یەکێک چاوەڕێی ئەوە بکات کە ڕووداوی بەرتیل پەیوەندی هەیە بە ئاستی سوودە یاساییەکان بۆ گروپە تەسکەکان، ئەمە مەرج نییە ڕاست بێت. لە بری ئەوە، ڕەنگە کۆمەڵگا بە سەر دوو گروپدا دابەش بێت: ئەوانەی بە ڕێچکەیەکی سیاسی پشتگیری دەکرێن بەهۆی پێکهاتەی سیستەمێکی سیاسی و ئەوانەشی کە ناچارن لە ڕێگەی بەرتیلی نایاسایی کاریگەری بکڕنەوە.

کەسایەتییە سیاسییەکان دواجار هەوڵی پێکهاتە سیاسییەکان دەدەن تاوەکو ئەو دوو گروپە دووچاری ململانێیەکی ڕاستەوخۆ نەبن. بۆ نموونە، کەسایەتییەکی سیاسی دەتوانێت پشتگیری پرۆژەیەک بکات کە سوودی بۆ لایەنگرانی هەبێت و دواجار بەرتیل وەرگرێت لەوانەی کە دەیانەوێ گرێبەست بکەن یان بە دوای کاردا بگەڕێن. هەرچەندە ئەو جۆرە پیادانە ڕەنگە جۆرەکەی کەم بکەنەوە یان نرخی پرۆژەکە بەرز بکەنەوە، ئەمە شتێکی ئاشکرا نابێت بۆ زۆربەی دەنگدەران. بۆ نموونە، گریمان کەسایەتییەکی سیاسی پارەی حکومەت بەدەست دێنێت بۆ دروستکردنی بەندەرێک لە ناوچەکەی خۆی. سیاسییەکە ڕەنگە گرێبەستی دروستکردن ببەخشێت بە کۆمپانیاکان کە بەرتیلی لێ بکەوێتەوە. لایەنگران پرۆژەی ئینتیهازی خۆیان بە دەست بێنن لە هەمان کاتدا هەرکە کۆمپانیا گەندەڵەکە ئارەزووەکان دەستەبەر دەکات. پرۆژەی حکومی تەنها بۆ چەند کەسێک بێت و بەرتیلی نایاسایی لە نێوە خۆیاندا دابەش بکەن.

دووەم، سیستەمێکی سیاسی لەگەڵ حیزبێکی بەهێز و دوو حیزبی نەتەوەیی ڕکابەر. بە شێوەیەکی گشتی، ئەمە سیناریۆیەکە، لە نەبوونی بەرتیلدا، زیاتر خزمەتگوزاری حکومی و پاشەکەوت دەکات کە سوودی بۆ زۆربەی دانیشتوان هەیە. بە سوودە بەڵام تەسکە، گروپەکان هیچ ڕێگایەکیان نییە بۆ پێشخستنی ئەگێندەی سیاسی ڕاستەوخۆ بە بێ ڕێکخستنی هەڵمەتێک کە بتوانێت پشتگیرییەکی گشتی بەدەست بهێنێت. بۆیە بەشداری کردنەکان لە هەڵمەتە یاسایی و نایاساییەکان و گەندەڵی زیاتر دەکەن، نەک کەمتر، ئەمانە کۆنترۆڵی ڕەوشەکە دەکەن چونکە ئیختیارەکانی تر داخراون. جارێکی تر، ئەوانەی کە بەرتیل دەدەن و وەردەگرن زیاتر

لە سەرکەوتن نزیکن گەر بتوانن دەسکەوتەکانیان لەگەڵ ئەو سیاسەتانە گرێ بدەن کە کەسایەتییە سیاسییەکان پێیان باشە بۆ هۆیەکانی هەڵبژاردن. گرێبەست گرێدان و مۆڵەت پێدان لە ڕێگەی گەندەڵییەوە بۆ پاشەکەوت کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان سەرچاوەی زۆر ئاشکرا و ڕوونن بۆ بەرتیل. کار کردن لە دژی ئاستی بەرزی ئابووری ئەگەرێکە لەوانەیە وا لە ڕای گشتی بکات کە زۆر بە توندی لە دژی گەندەڵی پارە بوەستنەوە لە نێو سیاسەتەکان بە شێوەیەکی گشتی. باشتر دەتوانن باوەڕەکانیان کاریگەرتر بکەن گەر دیمەنی سیاسی زۆر پێشبڕکێی تیا بێت، تاوەکو نوێنەرەکان ئازادیەکی کەمیان هەبێت کار بکەن دژی حەزی لایەنگرەکانیان.

لە وەڵامی ئەوەشدا، ئەوانەی بە دوای کاریگەری گەندەڵیدا دەگەڕێن جەخت لە سەر ئەو کەسایەتییە سیاسییانە دەکەنەوە کە زۆر هەرزانن لە کڕیندا! هەموو شتێکی تر یەکسانە، ئەمانەش ئەو نوێنەرانە دەبن بە کورسیە سەلامەتەکانیانەوە تووشی کەمێک ڕکابەری دەبنەوە، " دۆڕاوە سەد دەر سەدەکانیش" دووچاری دۆڕان لە هەڵبژاردن دەبنەوە، یان ئەوانەی کە پلان دادەنێن بۆ خانەنشینی یان بە ئارەزوومەندانە یانیش لە ڕێگەی کاری سنووری ماوەکانیان. سنووری ماوەکانیان دەبێتە چاندنی گەندەڵی بەهۆی دانانی کەسایەتییە سیاسییەکان لە یارییەکی کۆتاییدا کە دڵنیان جارێکی تر ناگەڕێنرێنەوە بۆ سەر هەمان ئەو مەنسەبەی هەیانە.

هەندێ سیاسەتی غەیرە میللی هەن کڕینیان مەحاڵە لە لایەن یاسا دانەرێکی هەڵبژێردراودا. گەر ئاشکرابوونی گەندەڵی ببێتە مردنێکی سیاسی، گەر ئاشکرابوون بووە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرتیل، ڕەنگە هەندێ لە بەرپرسەکان ئامادە نەبن یان نەتوانن بەرتیلی زۆر گەورە پەسەند بکەن. لە ئەنجامدا سوودەکانی بەرتیلی گەورە لە ڕێگەی زیانەوە کێشی زیاتر دەبێت. دوو ئەنجام لە ژێر ئەو بارودۆخانەدا ڕێیان تێ دەچێت. یەکەمیان، بەرتیل بای ئەوەندە زۆرە کە قەرەبوو بکاتەوە بۆ زیانە چاوەڕێ کراوە سیاسییەکانی پەسەند کردنی پارە، هەروەها هەندێ مامەڵەش زۆر گرانە بۆ بەرتیلدەران کە بیکەن. ئەو مامەڵە گەندەڵانەی کە ڕوودەدەن بەرتیل تێوە دەگلێنێت بۆ کەمترین نرخی یاسادانەرێک. دووەمیان، بەرپرس یان فەرمانبەر یان ئەوەتا بەرتیل ڕەت دەکەنەوە یانیش ئەوەتا تەنها بچووکەکان



پەسەندی دەکەن. گەر بەرتیل سەر نەگرێت، لەبەرئەوە نییە کە گروپە تایبەتییەکان ئامادە نین ئەو برە بدەن کە پێویستە، بەڵکو لە بەرئەوەیە کە هەموو بەرپرسێکی سیاسی ناکڕدرێت گەر ئەو مەترسییانەی هەبێت.

سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان مەرج نییە بەشداربووی ناچالاک و نادیار بن. ڕێبازی بەهێزی حیزب دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ زۆرکردنی ئامانجی گشتی، هەروەها دەکرێ بەکاریش بهێنرێت بۆ مامەڵە کردن لە سەر بەرتیلێکی زۆر. کاتێ کۆمپانیای دەوڵەمەند و ڕێک پێک وجوودیان دەبێت لە هەردوو لای پرسەکە، سەرکردەی حیزبەکان و دانەرانی ئەگێندە ڕەنگە هانی پێشبڕکێی پێشکەش کردنی بەرتیل بدەن و ڕەنگە هەڕەشەی ئاشنا کردنی تێکشکاندنی یاسادانانیش بکەن، هەروەها ئالیەتێکیش بن بۆ چەواشەکردنی بەرتیلەکان. گەر حیزبێک یاخود هاوپەیمانێکی سەقامگیر کۆنترۆڵی یاسا دانان بکات، دەتوانێت بەشێکی زۆری دەسکەوتەکان لە مامەڵە گەندەڵیەکان وەرگرێت بەتایبەتی کاتێ کۆمپانیا ڕێکخراوەکان لە پێشبڕکێدان.

بە کورتی، ڕێکخستنی سیستەمە سیاسییەکان بە بێ گرفت و لەگەڵ ئاستەکانی گەندەڵی مەحاڵە. جیاوازییە سەرەکییەکان لە هەر ڕژێمێک توانای ڕێکخستنی گروپی ڕێک و دەوڵەمەندە بۆ بەدەستهێنانی کاریگەرییەکی یاسایی و ڕای دانیشتوانی گشتی بەرەو دابینکردنی گشتی سوودە تایبەتییەکان بەرێت. ئایا خەڵک تووڕە دەبێت بە مامەڵە گەندەڵەکان؟ یان ئایا دەیانەوێت بەشێکی زیاتر لەو گەندەڵییە بۆ خۆیان بێت؟ جەختێکی تایبەتی لە سەر سنووردارکردنی گەندەڵی ڕەنگە چەند سیاسەتێکی چۆنیەتی پێشنیار کردنی بهێنێتە بەرهەم کە چەندین ئەنجامی باشی لێ بکەوێتەوە. گەندەڵی ڕەنگە نەمێنێت گەر کاریگەری یاسایی کۆمپانیا تایبەتییەکان زۆر بێت لەگەڵ کەمێک گۆڕان لە تێگەیشتنی ئەو شەرعیەتەی لە نێو دەوڵەتدا هەیە. ئاراستەی باشتر و زیاتر بۆ چاکسازی ئەو گۆڕانکارییانەیە لە پێشبڕکێی سیستەمە سیاسییەکان و لەو دەسەڵاتانەی کە بە بەرپرسە سیاسییەکان دراون. ئەو بڕیارانەی کە زیان یان سوود دەسەپێنێت بە سەر تاک یان بە سەر گروپی بچووکدا دەتوانرێت لە سیاسەتەوە لاببرێن. نەهێشتنی هەڵبژاردنی

بەڵێندەران لە پرۆسەی سیاسیدا کارێکی زۆر باشە تاوەکو ئەم بڕیارە نەبێتە بەشێک لەو سوودانەی کە بەردەستە بۆ دابەشکردن لە لایەن بەرپرسەکانەوە لە ڕێگەی ئالیەتی یاسایی و نایاسایی. بێگومان، هەروەکو پێشتریش باسم کردووە، گەندەڵی لە گرێبەست گرێداندا کارێکی زەقە گەر بەرپرسە سیاسییەکان خۆیان تێ هەرنەقورتێنن، بەڵام بە لایەنی کەمەوە کۆمەڵێک تەکنیک هەیە کە دەتوانن کاریگەری سنوودار بکەن لە نێو سیستەمی بیرۆکراسیدا. لەگەڵ ولاتدا، جێگرتنەوەی چاودێری بە سیستەمی خزمەتگوزاری مەدەنی دەرفەتی کەمی بەرپرسە سیاسییەکانی هەیە بۆ خۆ دەوڵەمەند کردن و بۆ بەدەستهێنانی ئارەزووە سیاسییەکان لە بەرابەر کارەکاندا.

## نواندن و گەندەڵی لە کۆمەڵگا دابەشبووەکاندا

ئەو سیستەمانەی کە پشت دەبەستن بە ئالووێرکردنی دەسکەوتە سیاسییەکان چاک نابنەوە بە چاکسازی لە خزمەتگوزاری مەدەنی و سیستەمەکانی کڕین. گۆڕانی ڕیشەیی زیاتر لە پێکهاتەی سیاسی پێویستە، بەڵام بێگومان ئەو گۆڕانانەش زۆر بە زەحمەت دەرفەتی بۆ دەڕەخسێت. ڕەنگە کێشەکە گەندەڵی نەبێت وەک سیستەمێکی بلاوبۆوەی تەسکی نێو پەیوەندییەکانی چاودێری. هەندێ لە زانا سیاسییەکان تانوپۆی ئەوە دەکەن کە سیستەمە " دەستووریەکان"ی ئەم جۆرە پەسەندە چونکە سەقامگیری بەرهەم دێنن لە نێو کۆمەڵگا تەواو دابەشبووەکاندا. ئەوانی تر زۆر خەم لە سەقامیگری ناخۆن و زیاتر جەخت دەکەنەوە لە سەر گروپە زۆرینەکان لەگەڵ پشکی گەورەتری دەسەلاتی سیاسی. ڕەنگە ئەو سوودانە بەدەست بێن، بەڵام لە ڕێگەی زنجیرەیەک مامەڵەی زۆر خراپ. تەنانەت خراپتریش، ڕەنگە مامەڵەکان سوود بە خەڵکی ئاسایی نەگەیەنن، بەڵکو تەنها بۆ سوود و بەرژەوەندی سەرکردەکان بن.

پسپۆڕانی تر مشتومڕی ئەوە دەکەن، لە بری ئەوە، کە کۆمەڵگا دابەشبووەکان دەبێ ژیانی سیاسی ڕێک بخەن بۆ هێنانە کایەی پاڵنەرەکانی پێکەوە ژیان. بە تایبەتی " دۆناڵد هۆرۆویتز" سیستەمی هەڵبژاردنی پێشنیار کردووە بۆ کۆمەڵگا



دابەشبووەکان کە پاداشت دەدەن بە بەرپرسە سیاسییەکان بۆ دروستکردنی داواکاری گشتی لە نێو گروپە تایفی و کۆمەڵایەتییەکانی تر. کێشەکە تەنها ناسەقامگیری نییە بەڵکو لایەنەکانی تریشە لە کارەکانی حکومەت بە ڕووداوەکانی گەندەڵیشەوە. لێکۆڵینەوەیەکی بەم دواییانە پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئاستی بەرزی پارچە پارچە بوونی تایفی، کاری دامەزراندنی حکومەتێکی کارا و بەجێ زەحمەت دەکات، بەڵام دەوڵەت دەتوانێت زاڵ بێت بە سەر زیانەکانی دابەشبوونی تایفی لە ڕێگەی دامەزراندنی دام و دەزگای حکومی بەهێز و ئازاد. بۆ نموونە، لە نێجیریا، کێشەی فرە تایفی بە باشی چارەسەر نەکرا، لە ئەنجامدا دەوڵەت هەڵسا جەختی کردەوە لە سەر دابەشکردنی سوود و دەسکەوتەکان نەک دەست بەسەرا گرتنی هەموو شتێک. حکومەتەکان ژیانیان کورتە و هەریەکەو نوێنەرایەتی هاوپەیمانێکی تایفی دەکات. یاسای سەربازی زاڵە لە ماوەکانی هەڵبژاردنە سیاسییەکاندا. ژیانی سیاسی تەنها چاو دەبڕێتە دەسکەوت، نەک چالاکییەکی بەرهەمهێنەر. گەندەڵی لەو جۆرە بارودۆخانەدا نەبوونی توانا و ئیرادەی سیاسی لە سەرەوەی حکومەت دووپات دەکاتەوە. دابەشبوونەکان ئەوەندە زیان بەخشن کە حکومەت ناچار دەبێت هیچ کاری تر نەکات جگە لە هەوڵێکی زۆر بۆ نەهێشتنی شەڕی ناوخۆ.

هەندێ لە دەوڵەتە دابەشبووەکان گروپێکی زاڵیان هەیە کە هەمیشە جڵەوی دەسەلاتی سیاسی دەگرێتە دەست. لەو جۆرە حاڵەتانەشدا، زۆرینەی بەرپرسە سیاسییەکان ئایدیۆلۆژیایەکی میللی دەگرنە بەر کە دەبێتە هۆی شێواندنی ناوبانگی گروپ و تایفە جیاجیاکان بەڵام دواجار بەرتیل پەسەند دەکەن و ڕێگەیان پێ دەدەن زیندوو ببنەوە. ئەمە کارێکی زەقە، بە تایبەتیش گەر کەمینەش لە بازرگانیدا دەوڵەمەند و چاپووک بێت. ئەم جۆرە گەندەڵیەش کێشەیەکی ئاڵۆزتر دروست دەکات بە تایبەتی گەر تێکەڵ بێت لەگەڵ خزمایەتی و عیلاقات شەخسی کە ئەمانەش دەبنە هۆی قۆرخکردنی هەموو پەیوەندییە بازرگانییەکان. لەوانەیە بەرپرسێک هەندێ پاساو بهێنێتەوە بۆ کارە گەندەڵییەکانی لە بەرچاوی خەڵکی ئاسایی. بەڵام ئەو کارەساتە گەندەڵییانەی کە دیاردەکەون تەنها ئاگری ململانێکانی گروپە تایفییەکان خۆش دەکەن، بە تایبەتی گەر بەرتیل نەک هەر تەنها لە نێو بازرگانی بدرێت بەڵکو

ببێتە هۆیەک بۆ سنووردارکردنی پێشبڕکێ لە بەرژەوەندی زیاد کردنی دەسکەوتەکان و دابەشکردنیان لە نێوان سەرکردە سیاسی و بازرگانییەکان. ئا لێرەدا پرسیارێک بۆ چاکخوازان خۆی قووت دەکاتەوە: ئایا زاڵبوونی گروپێک کارێکی حەتمییە یاخود ئایا میتۆدێکی جیای هەڵبژاردنی سەرکردەکان دەبێتە هۆی پێکەوە ژیانی گروپەکانی تر بە ڕێگایەکی ڕەوا و دوور لە گەندەڵی؟

هەتا گەر دابەشبوونێکی ئەوتۆی تایفی و ڕەگەزی لە ئارادا نەبێت لە نێو کۆمەڵگادا، خەڵک ڕەنگە دەیان ڕا و بیروبۆچوونی جیا جیای هەبێت لە سەر سیاسەتی حکومەتدا. گەر پرسی "بۆشایی" ئاڵۆز و فرە ڕەهەند بێت، ئەوا حکومەت ناسەقامگیر و هاوپەیمانی شەڕانگێزی دەبێت. ئەم ناسەقامگیریەش ڕەنگە هانی گەندەڵی بدات وەک ئەوەی سیستەمێک پشت ببەستێت بە تەنها سوود وەرگرتن بۆ چەند کەسێک. هیچ هاوپەیمانێک پێی وا نییە کە دەسەڵات بۆ ماوەیەکی درێژ بگرێتە دەست و بەکاری بهێنێت بۆ دەسکەوتی شەخسی لە بری ئەوەی سیاسەتێک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان دروست بکات. ئەم ئەنجامەش پێشنیاری ئەوە دەکات کە سیستەمەکانی دەنگدان کە هانی سەقامگیری دەدەن گەندەڵی سنووردار دەکەن و هانی چاکسازی دەدەن. ئەم ئەنجامە تەواو پێچەوانەی بانگەشەکەی " مانکور ئۆڵسەن"ە گوایا سیستەمی سەقامگیر ڕێگە بە هاوپەیمانی ناشایستە و دز دەدات. بەڵام، فیکرەکە ڕێکخستنی دەوڵەتێک نییە بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی قۆرخکار ببەخشێت بە گروپێک، بەڵکو پاڵنەر ببەخشێت بە بەرپرسەکان بۆ ئەوەی پێداچوونەوەیەکی تێرو تەسەل بکەن و چاوەڕێی ئەوە بکەن کە دەرفەتێکی باشیان لە بەردەمە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا، ئیتر یان ئەوەتا دەیبەنەوە یانیش دەیدۆڕێنن. بەرپرسەکان دەبێ هەمیشە دڵنیا نەبن لە بردنەوە، بەڵکو دەبێ باوەڕیان بەوە بێت کە دەرفەتی باشیان هەیە بۆ گێڕانەوەی خۆیان بۆ سەر مەنسەبەکەیان. حیزبە ئۆپۆزیسیۆنەکانیش ڕۆڵی کەمینە دەگێڕن، هەڕەشەی ئەوە دەکەن کە گەندەڵی لە سەر ئەو بەرپرسانە بکەنە بابەتێک لە نێو هەڵمەتەکانیاندا. گەر دەنگدەر بایەخ بە سیاسەت بدات، نەک دەسکەوتی تایبەتی، ئەوا ئەو جۆرە پێکهاتەیە هانی دروست کردنی سیاسەتێکی ڕاستگۆ دەدات.



## ئەنجام

بۆ کورتکردنەوەی ئەم باسە، سێ تەوەری سەرەکی هەیە لە دیاریکردنی ڕووداوی گەندەڵی سیاسی. کار لە ئارەزووی بەرپرسە سیاسییەکان دەکەن بۆ پەسەند کردنی بەرتیل و هەڵمەتە نایاساییەکانی دارایی، هەروەها کار لە لێبوردنی دەنگدەران لەو جۆرە بەرتیلانە دەکەن، هەروەها کار لەو ئارەزووە دەکەن کە پارە دەدەن بە گروپە دەوڵەمەندەکان. تەوەری یەکەم، بەرپرسە سیاسییەکان هەموو سوود و دەسکەوتێک لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دابەش دەکەن بە سەر کەسە نزیکەکانیاندا. تەوەری دووەم، توانای گروپە دەوڵەمەندەکانە بۆ بەدەست هێنانی ئەو سوودانە بە شێوەیەکی یاسایی. تەوەری سێیەم، سەقامگیرییەکی کاتی هاوپەیمانێتییە سیاسییەکانە. ناسەقامگیری ڕەنگە لە پێشبڕکێ لە سەر دەسکەوتەکانی مەنسەب سەرهەڵبدات، بەڵام ئەو حکومەتانەی کە کۆمەڵگاکانیان لە ڕووی ئایدیۆلۆژیاوە دابەش بوونە دەتوانن ناسەقامگیر بن. ناسەقامگیری دەتوانێت بەرپرسە سیاسییەکان و بەرژەوەندییە دەوڵەمەندەکان هان بدات بۆ بەدەستهێنانی هەر یەکێک یان هەموو ئەو تەوەرانە.

بۆیە، یەکەم، سیستەمەکە دەتوانێت وا لە بەرپرسی سیاسی بکات چەند ئیختیارێکی شەخسی بکات، یانیش سیستەمی هەڵبژاردن دەکرێ لە ڕووی پێکهاتەوە بگۆڕدرێت تا پاڵنەرێکی گەورەتر بە بەپرسە سیاسییەکان ببەخشێت لایەنگرەکانیان قایل بکەن. دووەم، هەڵمەتە مەدەنی و ڕۆشنبیرییەکان دەتوانن دەنگدەر ڕۆشنبیر بکەن و داوای سوودی گشتی بکەن لە سیستەمی سیاسی، نەک دەسکەوتە شەخسییەکان. ئەمە وا لە گەندەڵی دەکات کە تەنها بە لای گروپە تەسکەکاندا بچێت، بەڵام پەسەند کردنی بەرتیلیش دروست دەکات، ئەمەش ستراتیژیەتێکی مەترسیدارە بۆ پیشەی بەرپرسێکی سیاسی. سێیەم، چاکسازی پێکهاتە دەتوانێت سەقامگیری زیاتر بەرهەم بێنێت بە بێ ئەوەی ببێتە هۆی سیستەمێکی ئۆتۆکراتی. بەرپرسە سیاسییەکان دەبێ نیگەران بن لە دۆڕاندنی

مەنسەب، بەڵام دەشبێ باوەڕیان بەوە هەبێت کە هەڵبژاردنەوە ڕێی تێ دەچێت. گەر ئەو دابەشبوونانەی کە دەبنە هۆی ناسەقامگیری بوەستنە سەر دابەشبوونی کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی ئەوا چاکسازییەکان دەبێ پاڵنەرێک ببەخشن بە بەرپرسە سیاسییەکان بۆ پێکەوە ژیان و ڕای زۆر و جیا جیا یانیش فرە گرووپی لە نێو کۆمەڵگادا.



## کرێنی کاریگەری سیاسی و کرێنی دەنگ

لە نێو وڵاتە دیموکراسییەکاندا کارەساتەکانی گەندەڵی زۆرجار بەندن بە دارایی هەڵمەتە سیاسییەکانەوە. هەندێ وڵات گەندەڵییەکی کەمی بیرۆکراتیان هەیە بەڵام دەناڵێنن لە دەستی پرۆسەی گەندەڵی سیاسی. بەڵام، ناشکرێت بە تەواوی پارە لە سیاسەتدا نەمێنێت. پارە پێویستە لە کاتی هەڵبژاردنەکان، هەروەها بەرژەوەندیەکان پەیوەستن بە ئەنجامەکانی یاسادانان و سیاسەتی حکومەتیش ڕەنگە ئامادە بێت بۆ سەرف کردنی پارەی پسوولەکان. فشارە داراییەکان پاڵنەرێک دەبەخشن بە بەرپرسە سیاسییەکان بۆ پەسەندکردنی بەرتیل، بۆیە کارکردن لە دژی کەمکردنەوەی کاریگەری گەندەڵی دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی کاریگەری لە پێشبڕکێکانی هەڵبژاردن. چاودێرانی سیستەمی سیاسی ئەمریکا نیگەرانن کە تێچووی هەڵمەتە سیاسییەکان هانی مامەڵەکانی "quid pro quo" دەدەن. لە فەرەنسا و ئیتاڵیادا، حیزبە مۆدێرنەکان جەختی ئایدیۆلۆژیان لەدەست داوە و بەرپرسی بازرگانی زاڵ بوونە بە سەریاندا. گەلێ لە کارەساتەکانی بەم دواییە لەو وڵاتانەدا هەڵمەتی نایاسایی تیایدا بەشداربووە. هەمان شتیش ڕاستە بۆ کارەساتەکانی بەم دواییەی کۆریا و ژاپۆن.

### سەرفکردنی پارە لە هەڵمەتە سیاسییەکاندا

سیستەمە سیاسییە دیموکراسییەکان دەبێ ڕێگایەک بدۆزنەوە بۆ پشتگیری دارایی هەڵمەتە سیاسییەکانیان بە بێ هاندانی فرۆشتنی بەرپرسە سیاسییەکان بە بەشداربووەکانەوە! حکومەتەکان هێڵێکیان کێشاوە لە نێوان دیارییە یاسایی و نایاساییەکان بە ڕێگای جیا جیادا، هەروەها چوارچێوە یاساییەکانیش زۆر جیاوازن لەو سنوورانەی کە هەن لە سەر مامەڵەکانی "quid pro quo" لە لایەن بەرپرسە سیاسییەکانەوە.

نیگەرانییەکە لێرەدا " المحسوبیە"یە (favoritism). ئەو گرووپانەی کە فەند دەدەن

بە بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان چاوەڕێی یارمەتی دەکەن لە پرۆسەی یاسا داناندا. ڕەنگە چاوەڕێی مامەڵەی تایبەتیش بکەن لە سەر کێشەکانی تاک لە مامەڵە کردن لەگەڵ بیرۆکراسییەکان یاخود لە گەڕان بە دوای گرێبەست و داشکاندندا. گەر بەرژەوەندییەکانی ئەو جۆرە گروپانە یان تاکانە ناکۆک بوون لەگەڵ ئەوانەی گشتی، ئەمە دەبێتە هۆی پەراوێز خستنی بەها دیموکراسییەکان. پرۆسەی هەڵبژاردن وا لە بەرپرسە سیاسییەکان دەکات نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی لایەنگرانی خۆی بکات، هەروەها ڕەنگە دەنگدەرانیش سزای ئەو کاندیدانە بدەن کە تەنها چاویان لە دزینی پارە و خۆ دەوڵەمەند کردنە. بەڵام دەنگدەران ناتوانن هیچ کارێک بکەن تاوەکو نەزانن ئەو نوێنەرانەی کە پارەیان پێ دراوە چۆن هەڵسوکەوت دەکەن. دیاری یاسایی دەتوانێت کاریگەرییەکی گەندەڵی هەبێت گەر پێویستییان بە ئاشکرا کردن نەبێت و گەر quid pro quo خۆی بۆ دەنگدەران ئاشکرا نەبێت.

هەندێ جار پێشبینییەکان ی quid pro quo زۆر تەواو دەرچوونە. لە کاڕۆلاینای باکوور لە ساڵی ١٩٩٧ دا، کۆمپانیایەکی زەبەلاحی نۆژەنکردنەوە، کاتێ ئەو قازانجەی پێشبینی دەکرد وەری نەگرت داوای گەڕاندنەوەی پارەکەی کرد. لە کەنەدا، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، کۆمپانیاکان بەرتیلیان بەخشی بە کاندیدە سیاسییەکان بۆ یارمەتیدانی پشتگیری دارایی هەڵمەتەکانیان لە پێناو ئەوەی کاندیدەکانیش هاوکارییان بکەن لە وەرگرتنی گرێبەستی حکومیدا. ئەنجامی کارەساتەکەش بووە هۆی یاسایەک بۆ قەدەغە کرنی ئەو جۆرە کارانەی quid pro quo، بەڵام ئێستاش لێرەو لەوێ هەر ڕوودەدەن. لە ژاپۆن، ئەو بەرپرسە سیاسییانەی کە هاوکاری کۆمپانیا مەحەلییەکان دەکەن لە وەرگرتنی گرێبەست لە بەرابەردا داوای ڕێژەیەک دەکەن لە کۆمپانیاکە. لە ساڵانی هەشتاکان لە ئەڵمانیا، کارە خێرییەکان بەخشران بە حیزبە سیاسییەکان لە هەوڵێک بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی quid pro quo. لەو کاتەدا، پارەدان بە ئەندامانی پەرلەمان بۆ دەسکەوت کارێکی سزادەر نەبوو. لە ئیسپانیا، کارەساتەکان بووە هۆی ئاشکرا کردنی ئەو بەرپرسانەی کە لە نەوەدەکان فەندیان بەخشیبوو بە حیزبە سیاسییەکانیان بەهۆی بازرگانی و بانکەکان بۆ کار کردن بۆ لایەنگرەکانیان.



لە سەر ئاستی فیدراڵی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، کڕینی تەواوی دەسکەوتەکان ڕوودەدات کاتێ کە کارەکە بێ دەنگ کراوە و زەحمەتە بچێتە سەر بەڵگەنامە. هەروەکو یەکێک لە نوێنەرە کۆنگرێسییەکان دەڵێت " مشتومڕ کردن زەحمەتە کاتێ موساهەمات دەرگا ناکەنەوە. ئایا من پێم وایە کە ئەندامێک یاخود دەنگێک دەکڕدرێت لە لایەن لایەنگرانەوە؟ نەخێر. بەڵام هەمیشە کاریگەری ڕەها هەیە لە لایەن لایەنگرانەوە". موساهەمەکان لە لایەن گەلێ بەخشەرەکانەوە وەک وەگەڕخستنێکی درێژخایەن سەیر دەکرێن لە پێشخستنی پەیوەندیەکانی متمانەی دوو لایەنە. یەکێک لە دیراسەکان داتای ئەمریکی بەکارهێناوە، ئەوەی ئاشکرا کردووە کە بەخشەرەکان دروست بوون نەک بۆ کڕینی دەنگ بەڵکو بۆ کاندیدی بەسۆز بۆ سەر مەنسەب. جارێک لە نێو ئۆفیسدا، بەرپرسە سیاسییەکان هەوڵ دەدەن کار باش بکەن بۆ لایەنگرانیان. بەڵام لە کردەدا، جیاکردنەوەی نێوان بەرپرسە سیاسییەکان زەحمەتە کە کامەیان مەنسەبی خۆی خوار دەکاتەوە بۆ موساهەمەی دەسکەوتەکان و ئەوانەشی کە هەڵبژێردراونەتەوە چونکە ئەوان بەشداری بیروبۆچوونی ئەو بەشداربووانە دەکەن. بەشداری تایبەتی کاریگەر کە دەسەڵاتی لە دەستە شان بە شانی ئەوەی چۆن بەرپرسە سیاسییەکان لە مەنسەبدا هەڵسوکەوت دەکەن.

نیگەرانی دەربارەی کاریگەری ئەوتۆ خەمێکە گەر فەندەکانی هەڵمەت گرینگ نەبن بۆ سەرکەوتنی هەڵبژاردنەکان. لە هەموو سیستەمە سیاسییە دیموکراسیەکاندا هەندێ دیاری بۆ بەرپرسە سیاسییەکان سەرپێچی یاسا مەحەلیەکان دەکەن. هەتا کاتێ پێودانگە یاساییەکانیش لە سەر فەند شیاو بێت، بەرپرسە سیاسییەکان و هاوشانەکانیان حەز بە دیاری نایاسایی دەکەن بەڵام کەس باسیان نەکات. پاراستنی نهێنی دیاری دەتوانێت کاری quid pro quo بشارێتەوە و هەوڵەکانیش ئاسان دەکات بۆ گلدانەوە فەندەکان بۆ مەرامی شەخسی. دەنگدەران بە هیچ شێوەیەک چاوەڕێی ئەوەیان لێ ناکرێت ڕەچاوی لێبوردن بکەن لە سەر کەمکردنەوەی باج یاخود ئەو گرێبەستانەی لە بەرابەر بەرتیل دەبەخشرێن.

بۆ نموونە، بڕوانامەی بەشداربووانی سیاسی ئیتاڵی لە لێکۆڵینەوەکانی " دەست

پاکان" (Clean Hands) ئەوە ئاشکرا دەکات کە چۆن پراکتیزەکانی گەندەڵی سەنگەری خۆیان دادەکوتن لەو سیستەمانەی کە تەنها بە ناو دیموکراسین. سەرکردەی حیزبەکان ئەو بەرپرسە سیاسیانە دەبن کە کاتێ مەنسەبێکی وا وەردەگرن بەرتیل دانیان لە لا ڕۆتینە. کاری بیناسازی سەرچاوەیەکی بە قازانجی فەندەکان بوو. ژمێریارە پسپۆڕەکانی حیزب کەوتنە کۆکردنەوەی بەرتیل و دابەشکردنی گرێبەستەکان. ئەو جۆرە خەڵکەش هیچ مەنسەبێکی ڕەسمی حکومی نەبوو بەڵام پێناو بوون لە نێوان بازرگانەکان و حکومەت بۆ چارەسەر کردنی کێشەی بازرگانییەکان. بەرتیلیان کۆدەکردەوە بۆ سندوقی حیزب، بەڵام هەندێ لە دەسکەوتەکان لە نێو تاکەکاندا دەبەشرایەوە. یەکێک لە دیراسەکان لە سەر قەزیەک لە ئیتاڵیا پێشنیاری ئەوە دەکات کە موساهەمەی نایاسایی سوودی زۆر تایبەتی هەبوو کە ئەوان لە دەوڵەتیان دەویست و ئەو هەموو پارە زۆرەش نەدەهاتە ژمار. جیاکارییەکی زۆر هەبوو لە نێوان ژمارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە ڕاپۆرتیان دەبەخشی و ئەو حیزبە سیاسیانەشی کە ڕاپۆرتیان وەردەگرت.

## ململانێی بەرژەوەندییەکان

پێویستە یاسادانەری هەڵبژێردراو لە وڵاتە دیموکراسییەکاندا سەربەخۆ بن و بە شێوەیەکی گشتیش دەبێ بەرپرسیار بن. کاتێ پرسێکی سەرەکی وەک ، پێویست نەبوونی ڕێز بۆ شا، لە ئارادا بوو، یاسادانەری میسالی یاسادانەرێکی زەنگین و سەربەخۆ بوو نەوەک بەند بێت بە سەروەرییەوە. بۆیە لە ساڵی ١٩١١دا هەندێ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا دژی ئەو بڕیارە وەستانەوە کە دەسەڵاتی بەخشی بە مووچەی ئەندامانی پەرلەمان لە سەر بنچینەی ئەوەی کە یاسادانەرە بێ مووچەکان سەربەخۆتر دەبن لە تاجی پادشایەتی. لە دژ وەستانەوەی زیادکردنی مووچە لە ساڵانی حەوتاکان هەندێ لە ئەندامان مشتومڕی ئەوەیان بوو کە نابێت مووچەکانیان ئەوەندە زۆر بێت وایان لێ بکات هەست بکەن بەندن بە دەوامکردنی ڕۆژانە لەگەڵ دەسەڵاتەکەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، نە زۆر جیاش بێت لە حیزبە سیاسییە پەرلەمانییەکان. پیادەی گشتی فەرمانبەرە مەدەنییەکان



مۆڵەت وەردەگرن بۆ ئەوەی وەک ئەندام پەرلەمان خزمەت بکەن هەمان پرسیار بەرز بکەنەوە دەربارەی سەربەخۆیی یاسادانان لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا.

لەو ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا، خەمی سەرەکی سەربەخۆیی نییە لە سەر پادشا بەڵکو بەکارهێنانی مەنسەبە بۆ زیادکردنی بەرژەوەندییە داراییەکانی کەسێکی تایبەت. هەرکاتێک بەرپرسێکی سیاسی یان ئەندامێکی خێزانی یان ستافێکی بەشی هەبێت لە بەرژەوەندی کۆمپانیایەک کە کار لەگەڵ حکومەت دەکات یانیش ئەو کۆمپانیایە سوود لە سیاسەتی دەوڵەت وەردەگرێت ئەوا ململانێ سەرەکییەکان لە سەر بەرژەوەندی سەرهەڵدەدات. هیچ بەرتیلێکی گەندەڵ یان هەڵمەتی خێرخوازی ڕوونادات، ئیتر مەترسی فەیڤۆریتیزم هەمان شتە.

زۆربەی وڵاتە دیموکراسییە پێگەیشتووەکان دانیان بەو پێویستییە داناوە بۆ سنووردار کردنی کاریگەری بەرژەوەندیە ئابووریە تایبەتییەکان لە سەر بەرپرسی سیاسی هەڵبژێردراو، هەروەها بە لایەنی کەمەوە داوایان لێ بکرێت ڕاپۆرت بنووسن لە سەر بەرژەوەندیە داراییەکانیان. لە نێو یەکێتی ئەوروپادا هەموو وڵاتێکی ئەندام جگە لە " لۆکسمبۆرگ" ئەو داواکارییەی هەیە بۆ پەرلەمانتاران. هەندێ وڵات هیچ شتێک بۆ یاسایەک دابین ناکات، هەروەها هەندێکیشیان بە یاسای بەهێزەوە پەیوەندی گشتی دابین ناکەن بە تۆمارەکانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەوروپا، خەمی ململانێی بەرژەوەندی دارایی تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا زیادی کردووە. بۆ نموونە، لە بەریتانیا، پراکتیزەی پرسیار کردن لە بارەی تایبەتی ئەندام پەرلەمان لە نێو ئەنجوومەندا لە ژێر یاسایەکەوە هات، هەروەها ئەنجامی کارەساتەکانی ئەمەش کۆتایی بە پیشەی ژمارەیەک بەرپرسی سیاسی هێنا.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، یاسادانەری فیدراڵ و ستافەکانیان تووشی یاساکانی دژە بەرتیل و نیزامەکانی ململانێی بەرژەوەندیەکان دەبنەوە کە دەبنە هۆی سنووردار کردنی دەسکەوتی دەرەوە و دامەزراندنی فەرمانبەری " بن دیوار"، بەڵام بەشی یاسایەکە کە لە سەر ململانێی بەرژەوەندیە داراییەکانە جێبەجێ ناکرێت لە سەر لقی دەسەڵاتی یاسادانان. نیزامەکان زۆر بێهێزترن لە سەر ئاستی ویلایەتدا. بۆ نموونە، دیراسەیەکی بەم دواییە لە سەر دەسەڵاتی یاسادانان لە ویلایەتی "

الینۆیز" گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو نیزامانەی لە سەر ململانێی بەرژەوەندیەکان هەن بێهێزن و زۆر بە خراپی جێبەجێ دەکرێن. هەرچەندە یاسادانەران بێ بەشن لە دەنگدان لە سەر دەسەڵاتی یاسادانان کە کار لە کۆمپانیایەک بکەن خۆیان خاوەنینە، زۆرجار پێشنیار دەکەن و دەنگ دەدەن لە سەر ئەو یاسایانەی کە کار لە کارەکان دەکەن کە خۆیان بەرژەوەندیەکیان تیایە. سەرچاوەکانی ئاشکرا کردن بێهێزن، هەروەها یاسای ئەخلاقی زۆر بەدەگمەن دەسەپێنرێت. بۆیە تەنانەت لە ویلایەتە دیموکراسیەکانیشدا، ئەو ئەگەرە وجوودی هەیە کەبەرژەوەندیە تایبەتییەکانی بەرپرسێکی سیاسی بەریەک دەکەون لەگەڵ ئەو رۆڵەی کە وەک نوێنەری خەڵکی گشتی هەیەتی.

خود مامەڵەکردن لە هەندێ وڵاتدا بەم دواییانە پرسیاری لە سەر کراوە. لە وڵاتە نوێیە دیموکراسیەکاندا، ململانێی بەرژەوەندیەکان نەبۆتە کاری بەرایی چاکخوازان. ئێستا گەر کۆنترۆڵ نەکرێت، ئەوا بەرپرسە سیاسییەکان بە بەرژەوەندیە تایبەتییەکانیان شەرعیەتی حکومەت لە بار دەبەن دڵنیا بە قەد ئەوانەی کە مەزاتی موساهەمەی زۆر گەورە دەکەن. لە وڵاتە سۆشیالیستەکانی پێشوودا، وەک ڕووسیا و پۆڵەندا، کێشەکە زۆر زەقە چونکە گەلێ لە کۆمپانیا نوێیە تایبەتییەکان لە لایەن بەڕێوەبەرەکانی پێشوو کۆنترۆڵ کراون کە هەمیشە بە چالاکی لە نێو سیاسەتدا ماونەتەوە. بە ڕای یەکێک لە لێدوانچیەکان، لە ڕووسیا گەلێ بەرپرس و فەرمانبەری حکومی بە ئاسانی ناگەنە ئاستی ئەو خۆدەوڵەمەند کردنە لە کاتێکدا لە نێو مەنسەبدا تاوانە. لە ئۆکرانیا، ١٥٠ بازرگان و خاوەن بانک هەڵبژێردران بۆ پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٨دا، گەلێکیان بە بەرژەوەندیە ئابووریەکەیانەوە کە لە لایەن ئەو دەسەڵاتەی یاسادانان کە هەرخۆیان ڕەچاوی دەکەن کاریان لێ دەکرێت. هەرچەندە هەندێک هەبوون چەپڵەیان بۆ ئەو پێشکەوتنە لێدا وەک ڕێگایەک بۆ دڵنیاکردنەوەی سەربەخۆیی لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا، ئەمەش کێشەی گەورە دروست دەکات لە سەر ململانێی بەرژەوەندیەکان کاتێ یاساکانی باج لە گرفتدان.

کێشەکە زۆر پەیوەندی هەیە بەو پرۆژە بێهێزانەی کە حکومەت خاوەنیانە. لە هەندێ وڵاتی پێشکەوتوودا، وەزیرەکانی کابینە کورسی دەستەی گشتی



بەڕێوەبەرانی پرۆژەکان دەگرنەوە و سەربەخۆیی خۆیان کەم دەکەنەوە و ململانێی بەرژەوەندی دروست دەکەن. گەر چین تەنیا جارێک بەرەو پێکهاتەی حکومەتێکی دیموکراسیتر هەنگاوی نا بێت ئەوا پێویستی بە تووش بوون هەیە بەو ململانێ بەرژەوەندیانەی کە لە نێو پرۆژەکانی چیندا هەن. هەندێ بەرپرس و فەرمانبەری حکومی چەند مەنسەبێک وەردەگرن لە نێو حکومەت و لە نێو کەرتی تایبەتیشدا. بە پێی دیراسەیەکی دەسەڵاتی کاری چینییەکان، کەسێک لە یەک کاتدا ئەفسەر بوو لە دەستەی دەسەڵات و فەرمانبەریش بوو لە نووسینگەی دەسەڵات. چین مێژوویێکی درێژی هەیە لە " لێڵکردنی هێڵی نێوان حکومەت و کەرتی تایبەت"، بەڵام ئەو مێژووە پێدەچێت باوی نەمێنێت نەک هەر تەنها لەگەڵ پێشکەوتنی پرۆژەی کار و مۆدێرنیزم بەڵکو لە حکومەتێک کە بەرپرسیارێتی زیاتری لە ئەستۆی خۆی گرتووە.

ئا لەو ڕووەوە، یاسای پێناسکراو زەحمەتە بۆ هەموو سیستەمە سیاسییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، بە لایەنی کەم، ئاشکرابوونی بەرژەوەندیە داراییەکانی بەرپرسە سیاسییەکان و بەرژەوەندی خێزانەکانیان زۆر پێویستە بۆ بەرپرسیارێتی دیموکراسی. بە هەمان شێوە، پەیوەندی لەگەڵ بەرگریکەرەکان و دەوڵەمەندە بەرژەوەندچییەکان دەبێ ئاشکرا بکرێن تاوەکو دەنگدەر حوکم بات ئایا هەڵسوکەوتیان لە کاتی نوێنەرایەتیدا هیچ کاریگەرییەکی هەبووە لە سەر ژیانی ڕۆژانەیان یانیش ئەوەتا " زگی تێر ئاگای لە زگی برسی نەبوو، هەرگیز". پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە سەر سوودەکانی دەرەوە و چالاکییەکانی بەرگری کەرەکان قسەی زۆرتر هەڵدەگرن، بەڵام گرینگترین حاڵەت کە قسەی لە سەر بکرێت لەو سیستەمە سیاسییانەیە کە دەنگدەران کەمتر ڕۆشنبیر و چاو کراوەن.

## کڕینی دەنگ

کێشەی پارە لە نێو سیاسەتدا سنووردار ناکرێت بۆ فشارەکانی سەر بەرپرسە سیاسییەکان. لە دیوەکەی دیکەی ئەو پرسەشدا، ئەو پاڵنەرانەن دەدرێن بە دەنگدەرانەوە. شێوازی کارلێکەری گەندەڵی سیاسی ڕوودەدات کاتێ بەرپرسە سیاسییەکان هەڵمەتە نایاساییەکانی موساهەمە پەسن دەکەن و دواجار بەکاریان

دەهێنن بۆ بەرتیلدان بە دەنگدەر لە سەر بنەمای تاکدا. ئەو سیستەمانە تەنها بە ناو دیموکراسین، بەڵام زۆر شتیشیان بە نەریتەکانی چاودێری و خزمانێ دەچێت. ڕەنگە دەنگدەران نارەزاییان نەبێت لە سەر میتۆدەکانی هەڵمەتی دارایی بەرپرسە سیاسییەکان چونکە دەنگدەر سوود وەردەگرێت لە بڵێسەکانی پارەی کاندیدا.

پارە دان بە دەنگدەر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ مێژوویێکی درێژی هەیە، دەگەڕێتەوە سەدەی نۆزدە لە بەریتانیا و ئەمریکا. لەو وڵاتانەدا، چاکسازەکان ئەو جۆرە بەرتیلانەیان سنووردار کردووە، بەڵام وەک خەسڵەتێکی هەڵبژاردنی سیاسی لە هەموو شوێنەکانی تر ماونەتەوە. لە ئیتاڵیا، سەرۆکە سیاسیەکان هەوڵ دەدەن دەنگ بە دەست بێنن نەک هەر لە ڕێگای هەڵمەتەکانیان لە سەر فەند بەخشین بەڵکو لە ڕێگەی بەکارهێنانی سەرەچاوەکانی دەوڵەت و واستە و خزمایەتی و جۆرەکانی تری سوود بۆ ئەوەی تۆڕێک دروست بکات زۆربەی دەنگدەرانی پێوە بێت و ناچار بن دەنگی بۆ بدەن. هەمان کارەساتیش لە ئیسپانیا ڕووی دا کاتێ کارەکانی حیزب و کارە خێرخوازیەکان و بەشداربووە گشتییەکان زۆر کەم بوون بۆ پارە سەرفکردنی هەڵمەتەکان، هەروەها یاساکانیش زۆر بە کەمی سەپێنران. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٦ لە تایلاند بە شێوەیەکی بەردەوام بەرتیل درا بە دەنگدەران تا هەڵبژارنەکە تەواو بوو. هەروەها بەڵێن بە دەنگدەر دەدرا گەر کاندیدەکە بباتەوە پاداشت وەردەگرێت. ئەو بەرپرسە سیاسییانەی کە تۆمەتبار کران بە کۆکردنەوەی سندوقەکانی دەنگ لە هەڵمەتە نایاساییەکان، لە کۆریا و ژاپۆن کارەکانی خۆیان سەلماند لە ڕێگەی داواکاریە داراییەکانیان بۆ هەڵمەتەکانیان لەو وڵاتانەی کە دەنگدەر چاوی دەبڕێتە دیاری یاخود سوودی تری شەخسی لە کاندیدەکانەوە. لەو جۆرە سیستەمە سیاسییانەدا، ڕەنگە دەنگدەر ڕازی بێت بە موساهەمەی نایاساییش گەر سوودی شەخسی وەرگرن لە بەرپرسە سیاسییە گەندەڵەکان. سروشتی سوودی کەسی کە دەدرێت بە دەنگدەر لە لایەن بەرپرسە مەنسەبدارەکان ڕێگا لە بەردەم کاندیدە ئۆپۆزیسیۆنەکان زەحمەت دەکەن بۆ سەرهەڵدان. بێگومان، هەندێ مشتومڕی ئەوە دەکەن گەر زۆربەی بەرتیل و پارەکان لە دەنگدەر سەرف بکرێت ئەوا هیچی تر نامێنێت مایەی نیگەرانی بێت. بەڵام ئەمە هەڵەیە. لەبری



ئەوەی سیستەمێک پشت ببەستێت بە بنەما دیموکراسیەکان، حکومەت پێکهاتەیەکە سوود دەبەخشێت بەوانەی کە زۆرترین سەرچاوە و دەسەڵاتی سیاسیان لە ژێر دەستە.

بەرپرسە سیاسییەکان دەبێ قەدەغە بکرێن لە بەخشینی دیاری و سوودی بەهادار بۆ لایەنگرانیان. گەر ئەمەش بەدەست هێنرا، ئەوا ئاستی مەیدانەکە ڕێک دەبێت و یارمەتی زۆربوونی پشتگیری بۆ چاکسازی ڕیشەیی دەدات. کاتێ پارە و بەرتیلەکان تەنها دەچنە نێو گیرفانەکان و نێو بودجەی هەڵمەتەکانی کاندیدەکان، ڕەنگە دەنگدەران کەمتر سیستەمی گەندەڵ پەسەند بکەن. ڕوونی و ئاشکرایی یەکێکە لە هۆکارە یارمەتیدەرەکانی تر. لە هەردوو کۆریا و ئیتاڵیادا زانیاری پەسەندکراو دەربارەی ئاستی بەرتیل و قەبارەی هەڵمەتی سندوقی شەڕ قەناعەتی بە خەڵک هێنا کە کەمێک لە سوودەکان بەوان دەگەیشت. وێڕای ئەوەش، گەر ئەنجامی ئەو بەرتیلانە بە ئاشکرایی زیانبەخش بن بۆ کۆمەڵگا، ئەوا سەکۆیەکە ڕێکە بۆ چاکسازی.

## چاکسازی

لە سیستەمێکی بەرزی پێشبڕکێکاریدا لەگەڵ دەنگدەری هەشیار کە چاوی لە سوودی کەسی نییە، سیاسەتێک بۆ ئاشکرا کردن شتەکان لە بنەڕەتەوە ڕەنگە بەس بێت بۆ چاکردنەوەی هەموو شتێک. هەر بەرپرسێکی سیاسی کە زۆری پشت بەست بە بەرژەوەندی تایبەتی پارە و بە پارە دەنگی بۆ بدرێت دەدۆڕێنێت. پێوەندی زیاتر و ڕاستەوخۆ پێویستن گەر سیستەمەکە زۆر پێشبڕکێکاری تیا نەبوو و گەر دەنگدەران زۆر هەشیار نەبن،. بەرپرسە سیاسییەکان هەمیشە ڕێگایەکیان هەیە بۆ سوود گەیاندن بە بەشداربووان، هەروەها دیاریەکانیش خۆیان بەکاردەهێنرێن بۆ دەستخەرۆ کردنی دەنگدەر بۆ مەنسەب و هەڵسوکەوتی کاندیدەکان.

کێشەیەکی بنەڕەتی لە نەخشەی سیستەمێکی دارایی هەڵمەت گێڕان نەهێشتنی سەپاندنی پێو ودانگەکانە کە هانی کاری ناڕەوا دەدەن. هەرچەندە یاساکانی دارایی هەڵمەت لە گەلێ وڵاتدا بە ئاشکرا مایەی لێبوردنە، لە وڵاتانی تریشدا زۆر

سنووردارن کە داوای گواستنەوە دەکەن بۆ ئەوەی پارە بۆ هەڵمەتەکانیان سەرف بکرێت. سنوور لە سەر کارە خێرخوازیەکان وەک ڕێگایەک سەلمێنراوە بۆ پشتگیری کاریگەرییە گەندەڵەکان، بەڵام سنووری یاسایی هانی گواستنەوەی نایاسایی بێ ڕاپۆرت دەدات. بۆ نموونە، هەندێ لە ڕەخنەگرانی سیستەمی ژاپۆنی لە هێزدا لە نێوان ١٩٧٥ و ١٩٩٣دا مشتومڕی ئەوە دەکەن کە سیستەمەکە هانی بەرتیلی نایاساییدا بەهۆی سنووردارکردنی بەشداریکردن لە بازرگانی یاسایی. کاتێ قەدەغە کردن لە سەر دەستەی بەشداربووان لە یاسای هەنووکەیی ژاپۆنی دەخرێتە کار لە ساڵی ٢٠٠٠، ئەوا ئەنجامێکی هاوشێوە ڕەنگە ڕووبدات. کارەساتەکانی بەم دواییانەی وڵاتە پیشەسازیەکان ئاماژە بە گرینگی حوکمی یاسای ڕوون دەدەن کە حوکمی پارەی تایبەت بکات و هەروەها گرینگی بە دابینکردنی سەرچاوەی یاسای فەندەکان دەدەن. سەرەڕای ئەمەش، کاریگەری دەستی دیاری بەخشین دەوەستێتە سەر توانای بەرپرسە سیاسییەکان بۆ دابینکردنی سوودی تایبەتی بۆ کۆمپانیا زەبەلاحەکان. گەر ئەو جۆرە سوودبەخشینانە بە پێی یاسا ڕێک نەخرێن یانیش کۆنترۆڵ نەکرێن، ئەوا جیاوازی نێوان بەرتیل و بەشداری یاسای هەڵمەتەکان لێڵ دەبێت و یەکەم دەوەستێتە سەر داواکارییەکانی ڕاپۆرت نووسین، دووەمیشیان دەوەستێتە سەر بەرپەرچدانەوەی دەنگدەران.

سیستەمێکی سەنگەرداکوتانی بەرتیلی نایاسایی هەموو هەوڵەکان ئیفلیج دەکات بۆ چاکسازی فەندی هەڵمەتی سیاسی. لە ئیتاڵیا، یاساکانی دارایی هەڵمەت بە تەواوی ڕێی تێدەچێت ببووردرێت. بەشداربووەکان ڕێگەیان پێدەدرێت تا ئەو ڕادەیەی کە خۆیان ئاشکرا بکەن و لە لایەن دەستەی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکانەوە ڕەزامەندییان هەیە. ئێستاش بەشدار بوونی نایاسایی لە زۆربەی حاڵەتەکانی دژە گەندەڵی جەختی لە سەر دەکرێتەوە. بۆیە هەتا گەر یاساکان مایەی لێبووردن بن و گەر فەندی گشتی هەبێت، ئەوا دەسەڵاتەکانی سەپاندنی یاسا هێشتا پێویستی بە لێپێچینەوە هەیە بۆ پارە دانە نایاساییەکان. چاکخوازان پێویستییان بە سەیرکردنی ئەودیوی وردەکارییەکانی یاسای دارایی هەڵمەت هەیە بۆ گەڕان بەدوای ڕێگاکان بۆ سنووردار کردنی دەسەڵاتی بەرپرسە سیاسییەکان لە بەخشینی دیاری.



مشتومڕ لە سەر چاکسازی لە دارایی هەڵمەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی سەرەکی جەخت دەکاتەوە لە سەر ئەوەی کاریگەری ناپێویست بەخشراوە بەوانەی زۆر دەبەخشن. ئەمەش بووە هۆی داوا بۆ دارایی گشتی و هەوڵی گونجاو بە درێژایی ئەو هێڵانە لە شوێنی خۆی بۆ پێشبڕکێیەکانی سەرۆکایەتی لەوەتی ساڵی ١٩٧٤, یەکێک لە چارەسەرەکان ڕوون و ئاشکرایی بووە. کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەبێ لیژنەی کارە سیاسییەکان پێک بهێنن تاوەکو بەخشەر دروست بکەن، هەروەها هەموو دیاریەکانیش بووترێن و ئاشکرا بکرێن. هەر پەنجا ویلایەت لە ئەمریکا یاسایان هەیە داوا لە وتن و ئاشکراکردنی ئەو خێرخوازییە دەکات، بەڵام سەپاندنی ئەو یاسایە تەواو بێهێزە، هەروەها دۆزینەوەی جێبەجێکاریش زۆر ئاسانە. لە گەڵێ ویلایەت و هەروەها لە سەر ئاستی فیدراڵیش بەشداریکردنەکان بۆ حیزبە سیاسییەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵ نەکراون. بایەخدان بە پاراستنی ڕای ئازاد ئیختیارەکانی سنووردار کردووە لەویلایەتە یەکگرتووەکان.

چارەسەرەکان لە چوار ڕووەوە دەتوانن پەی بە کێشەکان ببەن: یەکەم، تێچووی هەڵمەتە سیاسییەکان دەکرێ کەم بکرێتەوە بەهۆی کەمکردنەوەی درێژی کاتی هەڵمەتەکە. ئەو سیستەمانەی کە بەرواری هەڵبژاردنی داهاتوو تیایدا دیار نییە دەتوانێت ئەو کۆنترۆڵانە بە باشی بسەپێنێت، بەڵام لە هەموو سیستەمەکاندا سنووردارکردنی کات زۆر زەحمەتە ئەنجام بدرێت. پێوەندانگەکانیش دەتوانرێت بسەپێنرێت لە سەر میتۆدەکانی هەڵمەت گێڕان وەک هەوڵێک بۆ کەمکردنەوەی تێچوو. دووەم، یاسای بەهێزتری ئاشکراکردن دەکرێ دامەزرێت. ویلایەتە یەکگرتووەکان پێشتر یاسای زۆر بەهێزی ئاشکراکردنی هەیە، بەڵام گەلێ تۆمار ئاشکرا نەکران تا پاش ئەوەی هەڵبژاردنەکان ڕوویان دا. ئاشکرابوون ڕێگە بە هاوڵاتیان دەدات دەنگ بدەن دژی ئەو کاندیدەی کە پارەیەکی زۆر وەک سوودی کەسی خۆی وەردەگرێت و هەروەها بۆ پسپۆران شیاوی دەکات لێکۆڵینەوە لە سەر کاریگەری دیاری لە سەر هەڵسوکەوتی بکەن بۆ ئەوەی بزانی تا چەند لە بەرتیلەوە نزیکن. سێیەم، یاساکان لە گەلێ وڵاتدا و لە ویلایەتەکانی ئەمریکاشدا خێرخوازی تاک سنووردار دەکەن، هەروەها یاساکانی تر مەسرەفی کاندید سنووردار دەکەن. لە

ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دادگای باڵا سنووری بەشداربووانی دۆزیوەتەوە لە یاسای فیدراڵدا کە یەک دەگرێتەوە لەگەڵ ڕای ئازاد، بەڵام سنووری کەمتر لە هەندێیاسای ویلایەتدا لە لایەن دادگا فیدراڵیەکانەوە سەرکوت کراون. ووردەکاریەکانی زانستی تەشریعی دەستووری ئەمریکی پێویست ناکات لێرە دەستگیرمان بکات، بەڵکو پرسە بنەڕەتیەکە گرینگە ئەویش، تا چ ڕادەیەک حکومەتێکی دیموکراسی دەتوانێت ئاوێتەی حەز و ئارەزووەکانی هاوڵاتیانی بێت بۆ دەربڕینی بەرژەوەندیە سیاسییەکانیان لە ڕێگەی دیاریەکانەوە بۆ پشتگیری حیزبی سیاسی یان کاندیدی تاک؟

چوارەم، سەرچاوە بەدیلەکانی فەند دەکرێ لە نێو کەرتی حکومیەوە بدۆزرێنەوە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، حکومەتی فیدراڵ فەند دابین دەکات تەنها بۆ کاندیدە سەرۆکایەتییەکان لە ژێر چەند مەرجێکی دیاریکراودا، هەروەها چەندین ویلایەتی ئەمریکی فەندی گشتی دابین دەکەن بۆ هەڵمەتە سیاسییەکان. چەندین وڵاتی تر هەیە فەندی گشتی دابین دەکات بۆ هەڵمەتە سیاسییەکان یاخود ڕێگە بە داشکاندنی باج یان کرێدیتەکان دەدات. بە تایبەتی ئەڵمانیا، ئەزموونی چەندین نموونەی جۆراوجۆری هەیە وەک هەوڵێک بۆ قایلکردنی بنەما دەستووریەکانی خۆی.

لە حیزبی باڵا دەستی وڵاتی ئەڵمانیادا، دادگای دەستووری زۆر بایەخ بە کاریگەری نێگەتیڤی فەندی حکومی دەدات لە سەر حیزبە نوێیان بچووکەکاندا. دواترین یاسا بە شێوەیەکی گشتی فەندی گشتی بۆ حیزبەکان دابین دەکات. لە ئەنجامی بڕیاری ساڵی ١٩٩٢ی دادگای دەستووری، یاسای نوێ جەخت لە سەر توانای حیزبەکان دەکاتەوە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خێرخوازەکان و هاوکات دەنگەکانیش. فەندەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی دابەش دەکرێن بە سەر هەر یەک لە توانای دیاریکراوی حیزبەکان بۆ سەرنج ڕاکێشانی دەنگەکان و مافەکانی حیزب لەگەڵ هاوکێشەیەک کە سوود بە گەورەترین حیزب نەگەیەنێت بۆ دەسەڵاتی دەنگ بەدەستهێنانیان. بەشداریکردن لەو بازرگانییانە ڕێگەیان پێ دەدرێت، بەڵام تەنها بەشێک باجی دیاریکراوە بۆ کۆمپانیایەک.

ژمارەیەک پڕۆپۆزەڵ ئامادە کراون بۆ زیاتر کردنی فەندی گشتی لە ویلایەتە



یەککگرتووەکان. ئەوانەی کە دژی ئەو جۆرە چاکسازییانە دەوەستنەوە ، نیگەرانن لە سنوورەکانی فەندی گشتی و خەرجیەکان، حیزبە باڵا دەستەکان دەپارێزن و هیچ سوودێکیش بە حیزبە سەرەکییەکان ناگەیەنن. بە گشتی، خاوەن مەنسەبەکان لەو سوودەوە دەست پێ دەکەن کە تەنها بەرەنگارکارەکان بە ئاستی بەرزی خەرجیەوە دەتوانن زاڵ بن بە سەریدا . هەروەها خاوەن مەنسەبەکان لە پێشبڕکێی فەندەکانیش سوود وەردەگرن. دەکرێ شێوازەکانی فەندی گشتی نەخشەی بۆ دابڕێژرێت بۆ ئەوەی زاڵ بن بە سەر سوودەکانی دەسەڵاتداران، بەڵام ڕەنگە نەخشەی سیستەمێکی کارا زەحمەت بێت. بۆ نموونە، " مینێسۆتا" فەندی گشتی بەخشی بە کاندیدەکان کە ڕێژەکەی یەکسان بوو بە یەک و نیوی ئەو خەرجیە سەربەخۆیانەی دژی ئەوان سەرف کرا .

بەڵام، یەکێک لە توێژینەوەکان گەیشتووتە ئەو قەناعەتەی کە یاسای " مینێسۆتا" سەرنەکەوت لە یارمەتیدانی بەرەنگارکارەکان. لە ساڵی ١٩٩٢دا دەسەڵاتداران نزیکەی ٢٠٠٠ دۆلاریان لە بەرەنگارکارەکان زیاتر بە دەست هێنا لە فەندی گشتی. گەر وردبینەوە، دەبینین کە دابینکردنی مینێسۆتا پێچەوانەی یاسای ئەڵمانییەکانە، کە پاداشت دەدات بە حیزبەکان بە ڕێژەی تواناکانیان بۆ سەرنج کێشکردنی مافەکانی حیزب بۆ سنوورێکی بەرزتر. پرسەکە ئەوەیە ئایا دەبێ سەرف کردنی پارەی گشتی لە سەر حیزبێک بێت یان دژی بێت یاخود توانای کاندید بۆ وەرگرتنی سەرچاوە تایبەتییەکانی فەند. یاسای مینێسۆتا یەک سوودی هەبوو لە سەر یاسای ئەڵمانی. پاڵنەرێکی ساختەی نەبەخشی بە ئەکتەرە سیاسییەکان بۆ سەرنج کێشکردنی پارەی تایبەتی، بەکاری بهێنن بۆ وەرگرتنی فەند، دواجاریش بە شێوەیەکی نهێنی بیدەنەوە. لە بری ئەوە، یاسای مینێسۆتا بە نیازی قورس کردنی کاریگەری فەندە تایبەتییەکانە لە هەڵمەتە سیاسەکاندا .

لە ڕووی بەدیلەوە، فەندە گشتییەکان دەکرێ بدرێن بەو کاندیدانەی کە دەتوانن پشتگیری گشتی بەرجەستە بخەنە ڕوو. یەک لەو ڕێگایانەی بۆ ئەنجامدانی ئەمەش بەخشینی پارەیە بە دەنگدەران بۆ ئەوەی دەنگ بدەن بە کاندیدەکانیان. ئەم پلانەش فەندی گشتی لەگەڵ سیستەمێکی عادیلانە تێکەڵ دەکات بۆ تەرخاکردنی فەند. لە

پێشخستنی بەها دیموکراسیەکاندا، ئەم پلانە کاریگەری بەرژەوەندیە دەوڵەمەندەکان کەم دەکاتەوە. بەڵام گەر ئەو پلانە بە باشی چاودێری نەکرێت، ئەوا پارەدانی نایاسایی زیاد دەکات. تاکە دەوڵەمەندەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان لەگەڵ بەرژەوەندیە بەهێزەکان لە نێو سیاسەتدا فێڵێکی یاسایی گرینگ دەدۆزنەوە بۆ داخستنی ئەو کاریگەریە. ئەوانە دەتوانن کاریگەریان هەبێت لە سەر ئەندامانی کۆنگرێس و کەسبیان بکەن بەڵام ناتوانن لە ڕووی داراییەوە پشتگیرییان بکەن. ئەنجامی ئەمەش دەبێتە دروستبوونی بەرتیلدان لە ژێرەوە بە نهێنی، بەتایبەتی لە لایەن دۆڕاوەکان لە پێشبڕکێی کاندیدەکاندا. یاساکانی ململانێی بەرژەوەندیەکان ڕەنگە پێویستییان بە بەهێز کردنی سەپاندن هەبێت بە شێوەیەکی توندتر چونکە پاڵنەر بۆ بەرپرسە سیاسییەکان بۆ بەکارهێنانی ئەو ڕێگایە بۆ دەسکەوتی دارایی زۆردەبێت بەهۆی پێناسەی سیستەمێکی پشتگیری کردن. چاکسازی لە هەڵمەتە داراییەکان پێویستە بە هەشیاری نەخشەی بۆ دابڕێژرێت گەر پاڵنەری نوێ بۆ ئابووری نەخاتە ڕوو بۆ داخستنی بەدیلە یاساییەکانی پێشوو.



## ئەنجامەکان

هەڵبژاردنە سیاسییەکان چارەسەرێک نین بۆ گەندەڵی. لە بری ئەوە، هەندێ سیستەمی هەڵبژاردن هەیە زۆر لە پێشترن لە سیستەمەکانی دیکە بۆ کاریگەری بەرژەوەندی تایبەتی. کاتێ گروپە بچووکەکان دەسەڵات بەدەست دەهێنن، هەندێکیان ئالیەتی ڕەوا بەکاردێنن، ئەوانی تریش گەندەڵن. هەندێ هەڵبژاردنی تاکتیکییەکان دەتوانرێت کاریگەرییان لێ بکرێت بە هۆی سروشتی سیستەمی سیاسی. لە هەموو وڵاتە دیموکراسیەکاندا هەڵبژاردنە پێشبڕکێکاریەکان یارمەتی سنووردار کردنی گەندەڵی دەدەن چونکە کاندیدە ئۆپۆزیسیۆنەکان پاڵنەرێکیان هەیە بۆ دەرخستنی دەسەڵاتدارە گەندەڵەکان. بەڵام، ئەوەی پێویستە بۆ پشتگیری دارایی هەڵمەتە سیاسییەکان پاڵنەری نوێ ئاشنا دەکات بۆ دەسکەوتی بەرژەوەندیە تایبەتییەکان کە لە نێو ڕژێمی ئۆتۆکراتیەکاندا نین. ئەو پاڵنەرانەش بە تایبەتی بەرزن گەر هەڵمەتە هەڵبژاردنییەکان خێری بۆ دەنگدەر هەبێت، واتە گەر خێری هەبێت بۆ دەنگدەری بەرتیل خۆری سیاسی. بەشداری هەڵمەتە نایاساییەکان و بەرتیلی بەرپرسە سیاسییەکان دەتوانن سیستەمە دیموکراسیەکان لە بار ببەن. هەتا گەر بەرتیل لە تاک و کۆمپانیا دەوڵەمەندەکانیش سوودی بە لیژنەکانی هەڵمەت و حیزبە سیاسییەکان و دەنگدەر بگەیەنێت، نەک بە حیسابی تایبەتی بەرپرسە سیاسییەکان، ئەوا کاریگەری چەواشەکاری نهێنی و پارەدانی نایاسایی بێ شومار دەبێت. هەمیشە بەرتیل دەدرێت بۆ بەدەستهێنانی سوودێکی نیزامی یان تەشریعی. بەڵام، کاریگەرییان دەوەستێتە سەر ڕێکخستنی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ کردن. تاک و کۆمپانیا گەندەڵەکان جەخت دەکەنەوە لە سەر بەدەستهێنانی دەسکەوتی تایبەتی و زۆر. هەڵبژاردنەکان بەس نین بۆ لێپێچینەوە لە بەرتیل. ئالیەتەکانی تر بۆ چاودێری گشتی پێویستن بۆ هێشتنەوەی حکومەت بە بەرپرسیار لە ئەرکەکانی. حکومەتە دیموکراسیەکان سیاسەتی زۆر ڕوون و ئاشکرا دادەنێن بۆ سنووردار کردنی پاڵنەرە گەندەڵییەکان.

## کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی سیاسی

بەرپرسیارێتی گشتی پێویستە بۆ کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی. ڕێی تێ دەچێت، هەردوو سیستەم یان کەسی ئۆتۆکراسی و دیموکراسی تا سەر ئێسقان گەندەڵ بن، هەروەها دەکرێ هەریەکەیان بەرپرسیارێتی بخرێتە ئەستۆ بە ڕێگای جیاجیاوە. هەڵبژاردنەکان دەتوانن زاڵ بن بە سەر بەرپرسە سیاسییەکاندا، بەڵام، هەروەکو بینیومانە، هەڵبژاردنەکان ئالیەتی ناتەواون. بەرپرسیارێتی گشتی تەنانەت لە وڵاتە بێ هەڵبژاردنەکانیش یاخود ئەو وڵاتانەی کە تاک حیزبێکی باڵا دەست هەمیشە دەنگەکان دەباتەوە، کارێکی مەحاڵ نییە و هەیە. ئۆتۆکراتەکان زەحمەتتر لە بەرپرسێکی هەڵبژێردراو ئەو کۆنترۆڵانەیان پەسن دەکەن، بەڵام تەنانەت بەرپرسە دیموکراسیەکانیش بەرەنگاری گەندەڵی دەبنەوە گەر بیانخاتە بەردەم پشکنینی گشتی و ڕەخنەوە. گەندەڵی دەکرێ سنووردار بکرێت هەم بەهۆی پێکهاتەکانی حکومەتی ناوەوە هەمیشە بەهۆی ئەو ڕێکخراوانەی کە کۆنترۆڵی باری ئابووریان کردووە هەروەها بەهۆی فشاری دەرەوەش کە لە ناخی خەڵکی گشتییەوە هەڵقوڵا بێت.

سنوور دانان لە سەر دەسەڵاتی بەرپرس و دامەزراوە سیاسییەکان و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ چاودێری و سەپاندنی سەربەخۆوە ستراتیژیەتێکی زۆر بەهێزە بۆ وەستانەوە دژی گەندەڵی. لە وڵاتێکی دیموکراسیدا، ئەو سنوورانە جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و دەسەڵاتی یاسادانانیش دەگرێتەوە. هەروەها سیستەمێکی قەزائی و پێکهاتەیەکی فیدراڵی دەتوانن دەسەڵاتەی سەرکردە سیاسییەکان سنووردار بکەن. بەڵام پارچە پارچە بوونی دەسەڵاتی سیاسیش کارێکی کاریگەر و لەجێ نییە. بە پێی هەندێ هەلومەرجدا، هەر سیستەمێک چەندین جار ڤیتۆی تیادا بەکارهێنرا ئەوا کاریگەری خۆی لە دەست دەدات، ئەو کاتەش سیستەمی فیدراڵی ڕێگایەک نیشانی دەوڵەت و سەرکردە مەحەلییە سیاسییەکان دەدات خۆیان دەوڵەمەند بکەن لە سەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت. سەرچاوە



سەربەخۆکانی دەسەڵاتی قەزائی کەمتر بە گرفتن، هەرچەندە بێگومان، ئەو دامەزراوانە خۆیان دەبێ بە شێوەیەکی فراوان بەری بن لە گەندەڵی و واستەکاری. سەربەخۆیی ئەمانەش پێویستە بەڵام دوا کار نییە.

گرووپێکی تری چاکسازەکان کراوەیی و بەرپرسیارێتی حکومەت زیاد دەکەن. حکومەت زانیاری کۆدەکاتەوە پێشکەشی دەکات، میدیا و گرووپەکانی هاوڵاتی سەربەخۆ کار دەکەن، هەروەها تاکەکان و گرووپەکان ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی کارەکانی بەرپرسان. هەرچەندە ئەو جۆرە سیاسەتانەش زیاتر لە لایەن ئەو سەرکردانەوە پەسن دەکرێن کە بە دیموکراسی هەڵبژێردراون، ئەو جۆرە چاکسازییانەش دەتوانن کاریگەرییان لە سیستەمە نادیموکراسییەکانیش هەبێت کە سەرکردەکانیان پێویستییان بە پشتگیری خەڵکی گشتی هەیە بۆ ئەوەی لە سەر دەسەڵات بمێننەوە.

### پشکنین و هاوسەنگی لە نێو پرۆسەکانی دەسەڵاتی یاساداناندا

هەر حکومەتێک هاوسەنگی و پشکنینی بەهێز بێت، ئەوا هیچ دامەزراوێکی بەهێزترین دەسەڵاتی بە سەر هەموو شتێکەوە نابێت. ئەمە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەگاتە بەرزترین فۆرم، بەڵام تەنانەت سیستەمە دیموکراسییە پەرلەمانییەکانیش هەندێ پەرت و بڵاوی و زیادەڕۆییان پێوە دیارە لە دەسەڵاتدا. تەنانەت سیستەمە یەکێتییەکانیش زۆرجار لە لایەن هاوپەیمان و حیزبی موعارەزەوە کۆنترۆڵ دەکرێن. ڕەنگە ماڵێکی بەرزتریان هەبێت لە سەر بنچینەی بنەمای جیاجیای نوێنەرایەتیەوە بونیات نرابێت، لە سەر بنچینەی دەسەڵاتێکی قەزائی سەربەخۆ کار بکەن، دەستوورێک کە دەتوانرێت تەنها بەهۆی ڕێنمایی تایبەتی هەموار بکرێت، یاخود لە ڕووی دەستوورییەوە مافەکانیان پارێزراوە.

لە هەر سیستەمێکی سیاسی کە چەندین خاڵی ڤیتۆی جۆراوجۆری تیا هەبێت، وەکو حکومەتی فیدراڵی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بارودۆخی هەنووکەیی بایەخی زیاتر پێ دەدرێت. لە ئەنجوومەنی پیراندا، دوو لە سەر پێنج لەگەڵ یەکێک لە ئەندامان دەتوانن هەڕەشە لە فرۆفێڵی سیاسی بکەن، واتە، دەتوانن ڕەتی سنووردار

کردنی مشتومڕ لە سەر پڕۆژە یاسایەک بکەنەوە. بۆیە، چل و یەک سیناتۆر دەتوانن ئەو پڕۆژە یاسایەی لە لایەن سەرۆکی وڵات و زۆرینەی هەر ئۆفیسێک پەسن کراوە دابخەن. گەر دواخەرێک سەرنەکەوێت یان پێشنیار نەکرا ئەوا ڕێگاکان داوای زۆرینەی دەنگی ئەنجوومەنی پیران و کۆشک دەکەن. دواجار پڕۆژە یاسایەکە بۆ سەرۆک دەنێردرێت. گەر سەرۆک واژۆی بکات، ئەوا پسوولەکە دەبێت بە یاسا. گەر ڤیتۆی کرد، ئەوا پڕۆژە یاسایەکە هەرەس دێنێت تاوەکو دوو لە سەر سێی هەریەک لە ماڵی کۆنگرێس ڤیتۆ بەکارنەهێنن بۆ لابردنی ئەو ڤیتۆیەی سەرۆک. تەنها زیاتر لە سێیەکی ئەندامانی کۆشک دەتوانن ڕێگای پڕۆژە یاسایەکە دابخەن بە پشتگیری زۆرینە لە کۆنگرێس، بەڵام سەرۆک دژی بوەستێتەوە.

ئایا دەکرێت پێکهاتەی حکومەتی ئەمریکی وەک سەنگەرێکی دژە گەندەڵی سەیر بکرێت؟ وەڵامەکە دەوەستێتە سەر ئامانجی گەندەڵچییەکان. گەر بیانەوێت شتێک بلۆک بکەن، ئەوا سیستەمەکە پشکنینی بێ هێزە لە سەر گەندەڵی. ئەوانەی بە دوای کاریگەریدا دەگەڕێن پێویستییان بە دۆزینەوەی لینکی بێ هێزە و ئەو گروپە گەندەڵ بکەن یاخود هەڵمەتێکی بە مەرج بکەن بۆ بەشداریکردن. ئەوانەی لەگەڵ دەسەڵاتن و ئەگێندە دادەنێن پارەدانی گەندەڵ و هەڵمەتی یاسایی خێرخوازی دەبن چونکە دەتوانن هەر مەسەلەیەک لە بەر چاوی خەڵکی بشارنەوە گەر بیانەوێت. دانەرانی ئەگێندە، سوودێکیان هەیە لە بەرزکردنەوەی فەندی هەڵمەتە یاساییەکان. ڕەنگە ببن بە ئامانجی پارە دانی نایاساییش گەر بەخشەر بیەوێت سیستەمی سیاسی دوور بێت لە پرسێکی بەرچاوی جەماوەری. بەدەستهێنانی شتێکی ئەرێ زۆر زەحمەتترە لە داخستنی یاسایەک بە خەرجیەکی زۆر. ئا لێرەدا، ئاڵۆزی سیستەمی ئەمریکی دەکرێ بەسوود بێت بۆ ئەوانەی کە بە دوای کۆنترۆڵی باری ئابووریدا دەگەڕێن. بەڵام، زەحمەتی کارا کردنی ئەو کاریگەرییانە دەوەستێتە سەر ئەوەی ئایا گروپی دەرەوە سوودی ئاشکرا یان نهێنی دەوێت.

لە حاڵەتی سوودی ئاشکرادا، هەندێ لە لینکەکان لە نێو زنجیرەکەدا ڕەنگە پەسنی سیاسەتەکە بکەن بە بێ پارەدان. ڕەنگە هەندێ لە یاسادانەران لایەنگرییان هەبێت کە سوودمەند بن لە سیاسەتەکە تاوەکو یەکێک یان هەردوو خانووەکەی



کۆنگرێس پشتگیری یاساکە بکەن بە بێ پێویستی بۆ پارەدان. ئەو بەرپرسە سیاسییانەی کە پابەند بن بە مەزهەبییەکان ڕەنگە پەسنی سیاسەتەکە بکەن و نەتوانن داوای پارەدان بکەن.

دواجار لە حاڵەتی وادا چەند یاسادانەرێک کە دەنگ دەگوازنەوە ڕەنگە پێویست بێت کاریگەرییان لێ بکرێت. ڕەنگە سەرۆکیش پشتگیری پرۆپۆزەلەکە بکات لە بەر هۆی سیاسی یاخود ئەنجامی سیاسی. دەسەڵاتی قەزائی تەنها زاڵ دەبێت بە سەر ئەو سیاسەتانەی کە سەرپێچی دەکەن لە دەستوور. بۆیە، ئەوانەی دەگەڕێن کاریگەرییان هەبێت لە سەر ئەنجامەکە ڕەنگە بتوانن جەخت تەنها لە سەر چەند خاڵێکی ڤیتۆی سیاسی بکەنەوە. گەندەڵی دەتوانێت کاریگەری هەبێت سەرەڕای ئاڵۆزی پرۆسەی دەسەڵاتی یاسادانان.

لە حاڵەتی سوودی تایبەت و شاراوەدا، گەندەڵی پێ ناچێت سەرکەوتوو بێت لە بەرئەوەی هەر بڕیارێک پێویستە بکرێت. ئەمەش مەترسیدارە و پارەیەکی زۆریشی تێ دەچێت چونکە تەنها یەک بەرپرسی ڕاستگۆ دەتوانێت تەواوی هەوڵەکە لە بار ببات. ئاشکرابوونەکەش نەک هەر تەنها ڕاگەیاندنی بەرتیلە بەڵکو خۆشیانن هەروەها ئاشکرابوونی ئەو مامەڵە تایبەتییانەن نیازی کڕینیان هەبوو.

بێگومان، بەرژەوەندی و سوودی تایبەتی پێویست ناکات هەمیشە بە نهێنی و لە ڕێگەی ئالیەتی ژێردەستەوە بەدەست بهێنرێن. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، مامەڵەکان زۆرجار ئەنجام دەدرێن کە بازرگانی بە کڕینی دەنگ و بە زنجیرەیەک سوودی تایبەتی دەکەن بۆ ئەوەی زۆرینەی پشتگیری بە دەست بێنێت. لە سیستەمێکی سیاسی کە تیایدا پەیوەندییەکانی خێزان و هاوڕێیەتی دیارترن لە نێو حکومەتی فیدڕاڵی ئەمریکیدا، ئەو جۆرە ئەنجامانە گشتیتر دەبن.

لە ئەنجامدا، سەرچاوە فرەکانی دەسەڵات سوودێک بە هەلومەرجی هەنووکەیی دەبەخشن و ئەوەش دەسەلمێنن کە هیچ کەس یان گروپ دەسەڵاتی ڕەهای نییە. هیچ شتێک ناتوانرێت ئەنجام بدرێت تاوەکو هەموو دەستە جوداکان کۆک نەبن. کۆنترۆڵەکان لە سەر دەسەڵاتی یاسادانان لە سیستەمی ئەمریکی ئەوە دەخەنە ڕوو کە دەستەبەرکردنی سوودی نوێ لە حکومەت بە کولفە و ئاڵۆز دەبێت. بەکارهێنانی

گەندەڵی بۆ دەرکردنی یاسایەک مەترسی دار و بە کولفە دەبێت. پارەدان کاریگەرتر و هەزرانتر دەوەستێت گەر ئامانجەکە تەنها داخستنی ڕێگای پرۆژە یاساکە بێت. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا گەندەڵی دەبێ بەکاربهێنرێت بۆ هەوڵی داخستنی دەسەڵاتی یاسادانان و بەرەو حاڵەتێک بچن کە تەنها حکومەت پێوستی بە کاریگەری هەیە. نموونەی ئەمریکی پێشنیاری ئەوە دەکات، کە سوودەکەی هەرچییەکی تر بێت، حکومەت بە دەسەڵاتی بەهێزی جیا وەک ئالیەتێکی دژە گەندەڵی بە نهێنی چاوی لە سەرە.

## بەرپرسیارێتی جێبەجێکردن

هەمیشە یاسادانەران جێبەجێکردن جێدەهێڵن بۆ دەسەڵاتی جێبەجیکردن. من پێشتر باسی ئەوەم کردووە کە ئەمە ڕێگایەکی ویستراوە بۆ سنووردار کردنی گەندەڵی سیاسی. بۆیە پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە زۆرجار یاسادانەران ئارەزوومەندانە یاسا دەنووسن کە کۆنترۆڵی خۆیان سنووردرا دەکەن لە سەر جێبەجێکردندا. یاساکان گەشەی پێوانەووردەکان بۆ دامەزراوەکانی حکومەت جێدەهێڵن، بەڵام ڕەنگە داواکاری بە وردی تیادا بگرێتەوە. سەلماندنی تەقلیدی بۆ ئەم جۆرە تەکنیکە باوەڕی پسپۆری ئاژانسەکانی جێبەجێکردن تێکەڵ بەو بانگەشەیە دەکات کە یاسادانەران نابێت کارمەندی تاک دانێن و ئیختیاری پرۆسەی کڕین بکەن یاخود بڕیار بدەن ئەولەویاتەکان بسەپێنن. بۆیە نووسینی یاسا بۆ ئەوانە چونکە یاسادانەر بۆی نییە ئەو کارە جێبەجێ بکات کە خۆی دایناوە، هەروەها زۆر ئاشکراشە کە ئەرکەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی و قەزائی گونجاو نییە بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە ژێر ڕۆشنایی جودا کردنەوەی بنەمای دەسەڵاتەکان.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، "تێری مۆو" پێکهاتەی یاساکانی ئەمریکا وەک وەڵامێک بۆ نادڵنیایی شی دەکاتەوە دەربارەی ئەوەی کێ کۆنترۆڵی دەسەڵاتی یاسادانان دەکات لە داهاتوودا. نیگەرانی خۆی دەربڕیوە کە ڕکابەرەکان کۆنترۆڵ دەگرنە دەست، گرووپی بەرژەوەندی پاڵپشتی ئەو یاسانە دەکەن کە سیاسەت لە ئیدارە جودا دەکاتەوە. کاریگەری کەمتر بۆ خۆیان پەسن دەکەن وەک ڕێگایەک بۆ داخستنی



دەمی ڕکابەرەکانیان. ئەو ڕکابەرانەی کە خۆزگە بە ئیفلیج کردنی کاریگەرێتی یاسا دەخوازن پشتگیری دروستبوونی پرۆسەی ئیداری ئیفلیج دەکەن، هەروەها پاڵپشتیشیان دەبێت چونکە دڵنیا نین لە کاریگەری سیاسی داهاتوویان. مۆو پێی وایە کە سیستەمە پەرلەمانییەکان بابەت نین بۆ هەمان فشار. مۆو و مایکل کالدوێڵ مشتومڕی ئەوە دەکەن کە سیستەمی بەریتانی لەم ڕووەوە لە پێشترە چونکە کاتێ یاساکان دەردەچن زۆر ئاسانن بۆ هەڵوەشانەوە. ئەمەش کارێکی باش دەکات بەڵام کارێکی ئەوتۆش نییە بۆ بونیاتنانی پێکهاتەی بیرۆکراتی توند چونکە سیاسەت لە گۆڕان لە نێو حکومەتدا ناپارێزن. هەردووکیان ئەوە شی دەکەنەوە کە ئاژانسە گشتییەکان بەهۆی یاسا سەپێنراوە دەرەکییەکانەوە کەمتر قورساییان هەیە و کاتێ سیستەمی بیرۆکراسی سادەترو ماقوڵتر و گونجاوتر دەبن.

بانگەشەکانی مۆو و کالدوێڵ زۆر چڕوپڕن. هەرچی شیکردنەوەیەک بۆ شاندە کۆنترۆڵکراوەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەبێت، ئەنجامەکان بە گشتی و یەکگرتوویی خراپ نین. ئەو نیزامە گشتییانەی دەردەچن لە لایەن ئاژانسەکانەوە لە ژێر بە تواناکردنی یاساکان هێزی یاساییان هەیە. بۆیە ئەو پرۆسەی کە ئەو یاسانەی لێوە دەرچووە پێویستی بە بەرپرسیارێتی هەیە چونکە ئەو پرۆسانە ڕەنگە بە ڕاستگۆیی یان گەندەڵی کاریگەرییان لە سەر هەبووبێت لە پێناو سوودی گروپە تەسکەکان. ئایا یەکێک جەخت لە سەر دەسەڵاتی یاسادانان دەکات بەرپرسیارە لە خەڵکی گشتی یان لە سەر نەهێشتنی پارە دان و گەندەڵی، ئەمە لە یاسای ڕێنماییەکانی ئیدارەی ئەمریکییەوە بەهادارە. لە ژێر یاسای ئاژانسەکانی ئەمریکادا دەبێ سەرنجێکی نیازی خۆیان بدەن بۆ دەرکردنی نیزامێک، بەڵگەنامە پەسن دەکەن لە زنجیرەیەکی بەرفراوانی گروپ و تاک، هەروەها لێدوانێک بۆ هۆیەکان دەردەکەن شان بە شانی حوکمی کۆتایی. حوکم دەتوانرێت لە نێو دادگادا ڕووبەڕووی بکرێتەوە گەر ڕێنماییە بەرچاوەکان بەدوادا نێن یان گەر ئەنجامی کۆتایی لەگەڵ یاساکە یەکی نەگرتەوە. ئەم پرۆسەیە ڕەخنەی لێ گیراوە لە ڕووی کات بە فیڕۆدان و ماندووبوونێکی زۆر، بەڵام نەگونجان نرخی سنوورەکانە لە سەر دەسەڵاتی عەشوائی دەسەڵاتی یاسادانان.

گەر بەراوردێک بکەین، دەبینین سیستەمی پەرلەمانی ئەڵمانیا کۆنترۆڵی کەمتر بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا دەسەپێنێت، بەڵام ئەو نیزامە فیدراڵیانەی کە لە لایەن ویلایەتەکانەوە بەڕێوەدەبرێت دەبێ لە لایەن ئەنجوومەنی داهاتەوە ڕەزامەندی لە سەر بدرێت، کە نوێنەرایەتی حکومەتەکانی دەوڵەت دەکات. جگە لەوەش، ڕێنماییەکانی حوکمی ئەڵمانی زۆر کەمتر شەفافترن لەوانەی ئەمریکا و ڕەخنەشیان لێ گیراوە گوایا زۆر کراوەن بۆ کاریگەری پیشەسازی. پارەدان گرفتێک نییە بەڵام کاریگەرییەکی زۆر ڕەنگە ببێتە گرفتێکی گەورە. بەریتانیا پرۆسەیەکی ئیداری سەربەخۆتری هەیە لەوەی ئەڵمانیا. ئەمە دەتوانێت پرۆسەیەکی ئیداری ماقوڵ کار پێ بکات، بەڵام ئەنجامەکەی باش نابێت، هۆیەکی مەنتقی هەیە گەر بپرسین بۆچی دەبێ ئەوە ئەنجامەکەی بێت. گەر گروپەکانی بەرژەوەندی کاریگەریان بوێت، دەتوانن ئەو کاریگەریە لە شوێنێکی گەندەڵتر و شێواوتر بە دەست بێنن لە ژێر سیستەمێکی بەریتانی قەزائی بێ چاودێری. ڕەنگە مۆو ڕاست بکات کاتێ دەڵێت ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆنترۆڵی زۆر دەسەپێنێت بە سەر کارە ئیداریەکان. بەڵام، سیستەمی یاسایی ئیداری کە زیاتر پەیوەست بێت بە زۆرینەی دەسەڵاتی یاسادانان و کەموکوڕی قەزائی هەبێت بەسە بۆ کاریگەری بەردەوامی گروپە تەسک بینەکان. کەواتە لە ڕوانگەی کۆنترۆڵی گەڕان بە دوای دەسکەوتدا لە لایەن بەرپرسە سیاسییەکان و گروپە تەسک بینەکان، کۆنترۆڵە یاساییەکانی ئیداری کە لە لایەن حکومەتە پەرلەمانییەکانەوە بەرهەم هێنراون گرفتی بەرپرسیارێتی دروست دەکەن جدی ترن لەو گرفتانەی نێو سیستەمێک کە تیایدا دەسەڵاتی یاسادانان پاڵنەر و دەسەڵاتی هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی بیرۆکراسییەکان.

کۆمەڵە گرفتێکی تر دەکرێ سەر هەڵبدات لەو سیستەمە سیاسییانەی کە دەسەڵاتی یاسادانیان بێ هێزە. ڕەخنەگرانی حکومەتەکانی ئەمریکای لاتین مشتومڕی ئەوە دەکەن کە زۆربەیان دەسەڵاتی جێبەجێکردنی زۆر بەهێزیان هەیە و دەسەڵاتی یاسادانانیش هیچ. بە پێچەوانەی کۆنگرێسی ئەمریکی، یاسادانەرەکانی ئەمریکای لاتین زۆربەی جار کاریگەری کەمیان هەیە. کە ئەنجام، پاڵنەرەکان بۆ گەڕان بە دوای دەسکەوت و پاڵنەرەکان بۆ گەندەڵی ئێجگار زۆرن لە نێو دەسەڵاتی



جێبەجێکردندا. سەرۆک دەسەڵاتێکی گشتی بەهێزی هەیە، ڕەنگە بتوانێت کۆنترۆڵی نهێنییەکانی باری دارایی بکات کە دواجار بەکاری بهێنێت بۆ پاداشتکردنی پشتگیریکەرانی، هەروەها کەمتریش دەرفەتی ئاشکرا بوونی هەیە کاتێ هەر لە ئۆفیسەکەی ئەو کارانە ڕاسپێرێت. سەرەڕای ئەمەش، دەسەڵاتی قەزائی کەمتر سەربەخۆیە لە کردەدا، هەتا بەم دواییيانەش، زۆر بە دەگمەن توانیویەتی زاڵ بێت بە سەر دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا. هەمان ئەو شێوازە لە هەندێ وڵاتی ئاسیادا بەرچاو دەکەوێت. بۆ نموونە، لە تایلاند، لە ڕابردوودا دەسەڵاتی جێبەجێ کردن چالاکییەکانی دەسەڵاتی یاسادانانی کۆنترۆڵ و سنووردار کرد بوو تاوەکو بتوانێت بە بڕوای خۆی تەواوی حوکمەکان بدات. ئیتر حوکمەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن بووە هۆی دامەزراندنی پەیوەندی زۆر نزیک لە نێوان بازرگانی و حکومەتدا. نەبوونی بەرپرسیارێتی دەسەڵاتی جێبەجێ کردنە ڕێگە بۆ گەندەڵی خۆش دەکات بە هۆی بە ناوەندنی کردنی دەسەڵاتی نیزامی و بەخشینی دەسەڵاتێکی بێ سنوور بە دەسەڵاتی جێبەجێکردن. لە گەلێ وڵاتدا، دەسەڵاتی قەزائیش زۆر بێ هێزە. چین حاڵەتێکە لەوپەڕی ئەو مەسەلەیە دایە، کە هەندێ دادگا بەڕێوە دەچن کە تەنها هەندێ خەڵکی نەتەوەیی کۆنگرێس، نەک بەرپرسانی نێو دادگا، بڕیار دەدەن لە سەر حوکمە ئیداریەکانی سەر بە دەسەڵاتی یاسادانان. وێڕای ئەمەش، دادوەرەکان سەربەخۆ نین لە تەواوی کارەکانی نێو حکومەتدا. لە هەموو ئاستەکانی نێو حکومەتدا بودجە و کارەکانیان لە لایەن حکومەتەوە کۆنترۆڵ کراوە. پێکهاتەی حکومەت هەرچی بێت، بەرژەوەندیەکانی گروپە تەسک بینەکان دەتوانن دەست بە سەر هەموو شتێکدا بگرن گەر هیچ گروپێکی فشار یان موعارەزە نەبینن. گەر ئەو جۆرە گروپانە لە دەسەڵاتێکی بەهێزەوە دەست پێ بکەن، ڕەنگە بتوانن هەوڵەکانی چاکسازی بە تەواوی داخەن و لە بار ببەن. هەموو ئەو حاڵەتانە پێشنیاری ئەوە دەکەن کە چاکسازی یاسایی ئیداری دەبێ بەشێک بێت لە هەر ستراتیژیەتێکی دژە گەندەڵی. مەرجەکانی باکگراوند کە حوکمدان لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دووپات دەکاتەوە دەبێ تاقی بکرێتەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بین لەوەی کە بەشدارییەکی بەرچاوی هەبێت و شەفافیەتی پێوە دیار بێت. خەڵکی گشتی پێویستی بە چەند ڕێگایەک هەیە بۆ

داواکردن لە دەسەڵاتی قەزائی گەر حکومەت بە دوای ڕێنماییەکانیدا نەچوو یان بە شێوازێک دوور لە یاسا کاری کرد. ئامانجی ئەمەش زەحمەتکردنی مامەڵە گەندەڵییەکانە بۆ شاردنەوەی دەسەڵاتی پێداچوونەوەی پرۆسەکە و ئەنجامە بەردەستەکان. پرۆسەی پێداچوونەوە بە مەبەستی بەدەستهێنانی سیاسەتێکی باشە و بەرپرسیارێتییەکی دیموکراسی دەتوانێت بە ناڕاستەوخۆ شەڕ لەگەڵ گەندەڵی بکات.

بەڵام، وڵاتێک کە دەسەڵاتی قەزائی بێ کۆنترۆڵ و گەندەڵ بێت ئەوا ئاشکرایە دەوڵەت دەسەڵاتێکی زۆرتری پێ نابەخشێت. وێڕای ئەمەش، گەر دەسەڵاتێکی قەزائی سەربەخۆ یاساکان بسەپێنێت کە لە بەرژەوەندی دارودەستەکەیدا بێت ئەوا چاکسازی زۆر زەحمەت دەبێت بە بێ پێوانەیەکی یاسایی. بۆ نموونە، لە فلیپین سیستەمی چاودێری کردنی پیشەسازی بانک لە ساڵانی هەشتاکان ڕێگەی لێ گیرا بەهۆی بەرزکردنەوەی داوای یاسایی لە لایەن بانکەکانەوە دژی ئاژانسە نیزامییەکان و بەرپرسە گشتییەکانی خۆیان. هەروەک یەکێک لە بەڕێوەبەرانی بانک خۆی دانی پیانا، داوا تۆمارکردنەکان ڕێگایەک بوون بۆ قەدەغەکردنی بەرپرسەکان لە جێبەجێ کردنی نیزامەکان. تۆ بیرۆکراسیەت دەترسێنی.

هەرچەندە وردەکارییەکانی نێو پرۆسە ئیدارییەکانی ئەمریکا دەتوانن بە دڵنیاییەوە چاکسازی بەکاربێن، بنەما بنەڕەتییەکان کرۆکی هەڵسوکەوتی بیرۆکراتە بەرپرسیارەکان دەردەبڕن. یاسا ڕێنماییەکانی ئیدارە داوای ئەوە دەکات کە حوکمدان دەبێ بە بەشداری سەرنج و بەشداری خەڵکی گشتی و ئەرکی حکومەت بێت بۆ ئاشکرا کردن و شیکردنەوەی کارەکانی. ئەوە داواکارییەکانە نەک هەر تەنها بەردەوامن لەگەڵ حکومەتی دیموکراسیدا بەڵکو مەودای مامەڵە گەندەڵەکان سنووردار دەکەن. تەنانەت وڵاتێک بە دەسەڵاتێکی یاسادانانی بێ هێزەوە یاخود سیستەمێکی پەرلەمانی یەکگرتوو دەتوانێت دەرفەتەکان بۆ گەندەڵی و جۆرەکانی تری کاریگەری سنووردار بکات بەهۆی پرۆسە شەفافییەکانی ئیداری.



## فیدراڵیزم: دەرچوون و دەنگ

لە سیستەمێکی فیدراڵیدا هەر قەوارەیەکی حکومی دەسەڵاتێکی سنوورداری هەیە، دەتوانێت لە نێو چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتە سنوورداره پیادەی دەسەڵاتی خۆی بکات. پێویستی بە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی نییە لە هەر یەکەیەکی تری حکومەت تەنانەت لە نێو دەسەڵاتە قەزائیەکەشی. حکومەتی نەتەوەیی دەتوانێت ویلایەتەکان کۆنترۆڵ بکات، هەروەها ویلایەتەکانیش دەتوانن مەحەلیەکان کۆنترۆڵ بکەن. ئەو جۆرە دەسەڵاتەی بەرز کردنەوە خاسیەتی گرفتاری هەیە چونکە ئەوانەی جڵەوی دەسەڵاتی بەرزیان لە دەستە ناتوانن هیچ بانگەشەیەکی ڕاستەوخۆ بکەن بۆ نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندییە کاریگەرەکانی هاوڵاتیان. لە کۆنترۆڵی گەندەڵیدا، بەڵام، دوو حاڵەت هەیە کە تیایدا دەکرێ دەست تێوەردان بسەلمێنرێت.

یەکەم، بەرپرسە سیاسییە گەندەڵەکان ڕەنگە بازرگانی کۆت بکەن لە نێو سنوورەکانی دەوڵەتدا. لە سەر ئاستی نێودەوڵەتییەوە، ئەو بەرپرسانەی هاوکاری کۆمپانیا بازرگانییە گەندەڵەکان دەکەن لەکەیەک دەخەنە سەر ڕاستگۆیی بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان و ناوی ئەوانی تریش پیس دەکەن. لە وڵاتێکدا، ویلایەت یان حکومەتێکی ئینتیقالی ڕەنگە بازرگانی دەوڵەت سنووردار بکات بۆ پاراستنی بازرگانییە مەحەلییەکان. لەو جۆرە حاڵەتانەشدا، دەسەڵاتە نەتەوەیی یا نێودەوڵەتییەکان کارە پاراستنییەکانی حکومەتە ئاست نزمەکان سنووردار دەکەن.

دووەم، دەوڵەت و حکومەتە مەحەلیەکان ڕەنگە لە ژێر کۆنترۆڵی نوخبەیەکی تەسک بن کە ئامێر بەکاردەهێنێت بۆ حکومەت لە پێناو دەسکەوتی شەخسیدا. هەرچەندە پێشبڕکێ لە نێوان دەسەڵاتە قەزائیەکان لە پێناو سەرچاوەکانی وەگەڕخستن ئەگەرەکانی گەندەڵی سنووردار دەکات. بەڵام لە ناویشیان نابات. بچووکترین هەڵەی دەسەڵاتی قەزائی ڕێ بۆ پەیوەندیە گەندەڵەکان خۆش دەکات. بە هەقیقەت، گەندەڵترین و بە واستەترین حکومەت لە گەلێ وڵاتدا لە سەر ئاستی مەحەلیدایە، بە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشەوە وەک ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیا. هاوکاری نزیکی نێوان دەسەڵاتە گشتییەکان و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان سیاسەتە پارتیزانییەکان و

ئەو چاودێرییەشی کە دابینی دەکەن سنووردار دەکەن.

لەو جۆرە حاڵەتانەدا، زۆرجار دەستێوەردان لە لایەن حکومەتی ئاست بەرز کارێکی ویستراوە. بۆ نموونە، نووسینگەی فیدراڵی لێکۆڵینەوە چالاکە لە کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی سەرەکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. بە هەمان شێوە، کاتێ حکومەتی فیدراڵی گرانتێک دەبەخشێت بە حکومەتی ئاست نزمتری خۆی، زۆرجار داوای ئەوەیان لێ دەکات کە سیستەمێکی بەرپرسیارێتی دامەزرێنن. لە شانشینی یەکگرتوودا، کۆمیسیۆنێکی چاودێری هەڵدەستێت بە چاودێری کردنی بەردەوامیەتی حکومەتی مەحەلی لە کارەکانیدا. هەندێ چڕی لە دەسەڵاتە قەزائیەکاندا ڕەهەندێکی نێودەوڵەتی هەیە. هەڵاتووێک لە قۆرخکردنی تلیاک لە کۆڵۆمبیا سیستەمی دادوەری ئەمریکی هەڵبژارد لە سەر کۆڵەمبییەکان. ئەمە وای لێ کرد بتوانێت پارەدانی بەرپرسە سیاسییە کۆڵۆمبییەکان ئاشکرا بکات.

هەندێ جار کۆنترۆڵی گەندەڵی لە لایەن دەسەڵاتێکی سنووورداری حکومەتی مەرکەزییەوە بەهێز دەکرێت لە بەرابەر دەوڵەت. لەم سیناریۆیەشدا، هەڕەشەی دەرچوون دەکرێ ببێتە میتۆدێک بۆ کۆنترۆڵ. دەرچوون داوای هەوڵێکی تۆکمەی ڕێکخراوەیی ناکات. لە جیهانێکی پڕ لە حکومەتی یەکساندا، گەندەڵی و ناشارەزایی بەرپرسە حکومییەکان سنووردار دەکرێت بەهۆی توانای دەنگدەران و کۆمپانیا زەبەلاحەکان کە هەر شوێنێکی تریان بوێ بە ئاسانی بۆی دەچن. کۆمپانیا زەبەلاحەکان هەوڵ دەدەن بڕیاری ئەوە بدەن لە کوێ کارگەیەکی دارچاندن دامەزرێنن کە بەرتیلدان و وەرگرتن تیایدا کەم بێت و خەڵکی ئەوێش چاوی لە دزی نەبێت. سەرنشینانی گوندێک کە بەرپرسەکانیان ئاسایی پارە بەدەست دێنن لە بەرابەر خزمەتەکانی دەتوانێت بچێت بۆ هەر شوێنێکی هەمان کاری خۆی بکات و پارەی خۆی بە دەست بێنێت. جووڵەی خەڵک و کار توانای بەرپرسان سنووردار دەکەن کە بەرابەر خزمەتەکانیان پارە وەردەگرن.

بەڵام جووڵەی ئەم دووانەش هەمیشە یارمەتیدەر نییە گەر مانای ئەوە بێت کە بالادەستێکی تاکی قەزائی پێی زەحمەتر بێت کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتێکی نەویستراو بکات. بۆ نموونە، وا دانێ، کە حکومەتێک هێزێکی پۆلیسی زۆر ڕاستگۆی داناوە و



هەڵدەستێت بە دەستگیر کردنی قومارە نایاساییەکان. قومارچییەکانیش زۆر بە ئاسانی دەتوانن بچن بۆ شوێنێکی دراوسێی ئەو شارە کە دەتوانن ئەوێ کۆنترۆڵ بکەن و کاری خۆیان بکەن، هەروەکو هەندێ جار ئەمەش لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ڕوودەدات. ئەو کارئاسانییەی کە بەهۆیەوە فەندەکان دەتوانن سنوورە نێودەوڵەتییەکان ببڕن، دێتە سەر ئەوانی تریش لە " گەلێ بەهەشتی داراییدا"، ئەمەش نموونەیەکی ترە کە چۆن فرە دەسەڵاتی قەزائی و پێشبڕکێکاری دەتوانن کۆنترۆڵی گەندەڵی و تەزویر و داماڵینی باج و کارە نایاساییەکانی تر بکەن، لە کردەدا ڕەنگە وتنی جیاوازی لە نێوان پێشبڕکێی ڕووخێنەر و بونیاتنەر زەحمەت بێت، لامەرکەزی بوونی پێکهاتەکانی حکومەت دەتوانێت بە باشترین شێوە بەشدارییەکی لابەلا بکات بۆ کۆنترۆڵی گەندەڵی.

## دامەزراوە قەزائییە سەربەخۆکان

گەلێ وڵات هەیە یاسای دژە گەندەڵی نموونەیی هەیە کە هیچ پەیوەندییان بە نێو واقیعی جیهاندا نییە. هەتا گەر مودەعییەکانی نەتەوەیەک بە چالاکی تێوەگلابن، ئەمە ماناو کاریگەرییەکی کەمی هەیە تاوەکو وڵات سیستەمێکی قەزائی ڕاستگۆی نەبێت. لە نەبوونی ئەو جۆرە دامەزراوە بنەڕەتییەدا، ئەو دەستە تایبەتییانەی کە تەنها جەخت لە سەر گەندەڵی دەکەنەوە زۆر پێویستن.

### دەسەڵاتی قەزائی

لەبەرئەوەی دەسەڵاتی قەزائی یارمەتی دیارکردنی دابەشکردنی سامان و دەسەڵات دەدات، حاکمەکان دەتوانن مەنسەبیان هەڵقۆزنەوە بۆ دەسکەوتی تایبەتی. دەسەڵاتێکی قەزائی گەندەڵ یان حیزبی دەتوانێت ئاگری ئاستی بەرزی گەندەڵی خۆش بکات، دەتوانێت چاکسازی لە بار ببات و هەروەها پێوەرە یاساییەکانیش لە بەرژەوەندی خۆیدا بەکاربێنێت. کاتێ دەسەڵاتی قەزائی بەشێکە لە سیستەمە گەندەڵەکە، دەوڵەمەندان و گەندەڵەکان بە حەسانە کار دەکەن، پشتی خۆیان لێ دەکەنەوە زۆر دڵنیان لەوەی کە هەر گرفتێکیان بۆ پێش بێت بە پارە چارەسەری

دەکەن. کاریگەری ئەمەش فراوان دەبێت و دەچێتە ئەودیوی کەرتە حکومیەکانەوە بۆ نێو مشتومڕی تایبەتی لە سەر گرێبەست و موڵک. مامەڵە بازرگانییەکان ڕەنگە بە ناکاریگەری پێک هاتبن بۆ نەهێشتنی ڕکابەرانی سیستەمی قەزائی، هەروەها خەڵکی ئاسایی سیستەماتیکی سوودیان وەرگرتبێت چونکە هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ گفتوگۆ و گەڕان بە دوای چارەسەر. ڕەنگە شەڕەکانی مەزات زیاتر بن کە حیزبەکان تیایدا پێشبڕکێ دەکەن و پارە دەدەن دژی لایەنی بەرامبەر.

دەسەڵاتێکی قەزائی ڕێزدار و ڕاستگۆ ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە لە بەرەنگاری بوونەوەی حکومەتە گەندەڵەکان و پاراستنی حوکمی یاسا. لە ئیتاڵیا، بۆ نموونە، دادوەرە بەرزە سەربەخۆیەکان هۆکاری سەرەکی بوون بۆ سووربوون لە سەر لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە و داوا تۆمارکردن دژی گەندەڵی. لە هیندستان، دادگای باڵا پاڵی بە لێکۆڵینەوەیەکی دژی گەندەڵی نا کاتێ حکومەت دەیویست پەکی بخات. دادگا سەرۆک وەزیرانی لە کۆنترۆڵی ئاژانسی فیدراڵی لابرد کە لە مەسەلەکەی دەکۆڵییەوە. لە ئیسپانیا، دادگای باڵا بەرپرسەکانی ناچار کرد ئەو ڕێگا نهێنییە ئاشکرا بکەن کە حیساباتەکانی وەزارەتی ناوخۆ لە سەری دەڕۆیشت. وای لە بەرپرسەکانی نێو ئەو وەزارەتە کرد کە ئاسایی دەوڵەت بەکار نەهێنن وەک بەرگریەک گەر چالاکییەکانی تاوان شکی لێ کرا. لە کۆریا، دادگای ئیستئنافی پاڵپشتی گرتنی دوو سەرۆکی پێشووی کرد بە تۆمەتی گەندەڵی. لە بەڕازیل، دادگای باڵا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە سزای کۆنگرێسی سەرۆک " کۆلەر" بە ئاشکرا ئەنجام بدرێت و دەنگی هەر ئەندامێکی کۆنگرێس بە کراوەیی بدرێت. ئەو داوایانە وایان لە پرۆسەکە کرد بە بەردەوامی ڕاستگۆ بێت و بووە هۆی دەرکردنی سەرۆکێکی تەواو گەندەڵ لە سەر حوکم.

دەسەڵاتی قەزائی گرینگییەکی تایبەتی هەیە لەو وڵاتانەی هەوڵ دەدەن دیموکراسی و حوکمی یاسا دامەزرێنن. ئێستاش گەلێ لەو جۆرە وڵاتانە، بە تایبەتی لە ئەمریکای لاتین و ئەوروپای ڕۆژهەڵات، دادگا و سیستەمی یاساییان زۆر هەژارە و کار بە باشی ناکەن. گەندەڵی وەڵامێکە بۆ گرفتەکان لە نێو ئیدارەی دادوەریدا، بەڵام وجوودی پارەدانێکی فراوان چاکسازی زەحمەت دەکات. سێ جۆرە گرفت



هەیە: سروشتی یاساکان، بێ هێزی لە ئیدارەی دادوەریدا، هەروەها هەبوونی دەسەڵاتێکی قەزائی کە نەتوانێت لە کاری نێو لقەکانی تری حکومەت بکۆڵێتەوە، هەریەکەیان داوای جۆرە وەڵامێک دەکات.

یەکەم، لەو وڵاتانەی کە تازە پابەند بوونە بە دیموکراسی و بازاڕی ئازادەوە، ئەو یاسایانەی کە حوکمی بازاڕی تایبەت دەکەن یان ئەوەتا وجوودیان نییە یانیش لێڵ و هاودژ و شاراوەن. ڕەنگە حاکمەکان ئەزموونێکی کەمیان هەبێت یان چەند خولێکیان دی بێت لە چارەسەر کردنی کێشە یاساییەکان بە دەرن لە مامەڵە بازرگانییە تایبەتییەکان و جێبەجێ کردنی نیزامی نوێ و یاسای باج. یاسای سەر کتێبەکان ڕەنگە زۆر مانایان نەبێت و هەندێ جاریش زەحمەتە لە نێو کتێبان ئەوە بدۆزیتەوە کە یاسا لە سەر حاڵەتێکی تایبەتیدا چی دەڵێت. لە ئەمریکای لاتیندا، یەکێک لە دیراسەکان دەگەڕێتەوە سەر " یاساکانی دارستان" حوکمی گرێبەستە تایبەتییەکان دەکات و مشتومڕی ئەوە دەکات کە ئەو دەسەڵاتەی بە حاکمەکان دراوە پاڵنەری گەندەڵی زیاد دەکات، لە بەرابەریشدا دوودڵی لە کەش و هەوای بازرگانیدا زیاد دەکات.

دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن یاساگەلێک بەرهەم دێنن، لە بەر زۆری یاساکانیش بابایەک چوزانێت کامەیان کاریگەرترە و لە کاردایە، زانینی زەحمەتە. ئەم دوودڵییەش دادگاکان دەکات بە شوێنێکی میسالی بۆ مامەڵەکردن و گەندەڵی و گەڕان بە دوای دەسکەوتدا. زۆرجار، بۆ پارێزەران زەحمەتە بتوانن دەقی یەک لە یاساکان یان نیزمەکان بدۆزنەوە. لە وڵات گەلێکدا لە نەریتی یاسای مەدەنیدا، وەک ئەمریکای لاتین، دوودڵی دەربارەی یاساکان بە شێوەیەکی تایبەت دژ یەکە چونکە شتە میسالیەکە کۆمەڵێک نەریتی یاسایین کە بە شێوەیەکی مەنتیقیش لە حاڵەتەکانی تاکدا جێبەجێ دەکرێت. سازانێکی کەم هەیە لە نێوان یاسای ڕەسمی و واقیعی مشتومڕێکی تایبەت. لە هەر شوێنێکی تر، هەندێ وڵاتی پێشکەوتوو هەیە کار دەکات بەو یاسایانەی کە بە زمانی دەسەڵاتی ژێردەستەیی نووسراوەتەوە یان بەردەوام دەبێت لە هێنانی یاسایەکی تەواو لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی چەندین ساڵ لەمەو بەر. بۆ نموونە، لەو بەشانەی ئاسیادا کاریگەری بەریتانیایان لە سەرە،

هەندێ یاسا بەوانەی کە پەیوەستن بە گەندەڵییەوەش، بە ئینگلیزی نووسراون بۆیە زۆربەی دانیشتوان لەو یاسایانە ناگەن.

گەر یاسا لە نێو کتێبان مانای نەبێت و سیستەمی قەزائیش کاری خۆی بە باشی نەکات، ئەوا خەڵک هیچی تر گرفت و مشتومڕ ناهێنێتە نێو دادگاکان تاوەکو دڵنیا نەبن لەوەی کە بەرتیل لە نێو دادگادا نییە. جگە لەوەش، هەوڵی دۆزینەوەی چەند ڕێگایەک دەدەن بۆ پێچ و پەنا کردن لە سیستەمی دادگادا بە هۆی بە کرێ گرتنی ناوبژی تایبەت و بەکارهێنانی میتۆدی تر، وەک پاراستن لە لایەن تاوانی بە ڕێکخراوەوە. دەسەڵاتی قەزائی ئەمریکای لاتین ئەوەندە سست و خاوە تا ئەو ئەندازەیەی کە خەڵک هەوڵ دەدەن دادگا بەکار نەهێنن لە چارەسەرکردنی کێشەکانیان. لە ئەنجامدا، کەرتێکی نافەرمی سەر هەڵدەدات. لە پیرۆ، بۆ نموونە، نووسەرێک دەڵێت ئەمە دەبێتە هۆی " بەکارهێنانی پارێزەری ساختەچی و بەڵگەنامەی هەڵە و ناوونیشانی تەزویرکراوی پرسەکەو بەکارهێنانی ناسنامە کە هەر وجوودی نییە و دواجار هیچ گرێنتیەکی یاسایی نییە". لە ئەندەنووسیا، دادگاکان سست و خاون و هیچ کاریگەرییان نییە لە بەر بڵاوبوونەوەی ئەو باوەڕە گشتییەی کە گەلێ لە حاکمەکان گەندەڵن. " ئاژانسە کۆکەرەوە" تایبەتەکان وەک بەدیل بەکار دەهێنرێن لە لایەن قەرز بەخشەکان بۆ چەواشەکردنی پارەدانەوەکان. بە ڕای " ڕۆبێرتۆ ماک لین" قەرز بەخشێک لە جاکارتا ڕەنگە زەمبیلێک مار بدۆزێتەوە یان سندوقێک لە جاڵجاڵۆکە لە ماڵەکەی. لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕووسیادا کوشتنی بازرگانان و خاوەن بانکەکان کارێکی زەق و بەرچاوە. گەلێکیان شێوازی جێبەجێکردنی کوشتن دەزانن کە بەشێکن لە سیستەمە تایبەتییە دڕندانەکەی " چارەسەر کردنی کێشە".

لەو حاڵەتانەدا، گەندەڵی هێمایەکە بۆ گرفتی قووڵتر لە نێو سیستەمی یاساییدا. ئامانجی چاکسازی تەنها باشتر کردنی کاری دادگاکان نییە، بەڵکو هەوڵدات بۆ زیاد کردنی چوارچێوەیەکی یاسایی زامن بۆ چالاکی بازاڕی تایبەت. پاڵنەرە گەندەڵییەکان دەکرێ کەم بکرێنەوە بەهۆی ئەو یاسایانەی کە بە باشی نووسراونەتەوە و ڕوونتر و بەردەستیشن. پڕۆژەکان، وەک ئەو پڕۆژەی بەم دواییەی



لە کۆستاریکا، بۆ بە کۆمپیوتەر کردنی هەموو نیزام و یاسا حکومییەکان، کارێکی هەرە بەرزی بەراییە لە شەڕ کردن دژی گەندەڵی. گەر یاساکان ڕوون بن، نەک هەر تەنها ئەو قەزیانەی کە دێنە ناو دادگا چارەسەرکردنیان ئاسانە، بەڵکو کێشەی کەمتریش سەر هەڵدەدەن. لە وڵاتانی تردا، یاسا پێویستە دامەزرێت لە هەمان کاتی ئاشکرا کردنی. هاوردن لە ئابووری بازاڕە سەرکەوتووەکان و دیموکراسییە دامەزراوەییەکان شوێنێکی گشتی ڕووداوەکانە هەرچەند بۆ پسپۆران پڕ لە گرفت دێنە بەرچاوان. بە لایەنی کەم هەندێ لە وڵاتانی کەرتی یەکێتی سۆڤیەتدا، هاوردن، هەرچەندە لێڵە، کاریگەریشە. تەنانەت لە کۆماری کازاخستان لە ئاسیای ناوەڕاستدا، بە مێژوویێک و کەلتوورێک دوور لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان، کۆدی وەگەڕخستنی دەرەوە، بە پشت بەستن بە کاری ڕاوێژکارە دەرەکییەکان، بە سەرکەوتوویی سەیر دەکرێت لە لایەن سەرکردەی بازرگانە مەحەلییەکان. لە چاوپێکەوتنەکاندا زۆربەیان ئاماژە دەکەن بە گرینگی ئەو کۆدە لە چاکتر کردنی پابەندی کازاخستن بۆ دابینکردنی بیئەیەکی پاڵپشت و سەقامگیر بۆ وەگەڕخستنی دەرەوە.

دووەم، هەتا گەر یاساکان تا ڕادەیەک ڕوون بن، بەرتیل دەتوانێت هەندێ لە کولفە و نەگونجانی کاری قەزائی نەهێڵێت. ڕاپرسییەکانی ڕای گشتی لە ئەمریکای لاتیندا نەبوونی متمانە لە سیستەمی یاساییدا دەخەنە ڕوو. ڕووپێوێک ئەنجامدرا لە ئەرژەتین لە ساڵی ١٩٩٤، ئەوەی دۆزییەوە کە لە سەدا ٤٩ پێیان وابوو ئیدارەی دادپەروەری خراپ یان زۆر خراپە، هەروەها لە سەدا ٦٥ گرفتەکانیان گەندەڵی و دواخستن بوو لە کارەکان. لە بەڕازیل و پیرۆ ڕێژەیەکی بەرز نەبوونی متمانە بوو لە سیستەمی قەزائیدا. دیراسەیەک لە سەر حەوت وڵات لە ئەمریکای لاتین ئەوەی خستە ڕوو کە دواخستن و تەگەرە خستن لە بەردەم کارەکاندا بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیادی کردووە لە نێوان ساڵانی ١٩٧٣ تا ، ١٩٩٣ لە ساڵی ١٩٩٣ لە ئەرژەنتین، کاتە چاوەڕێ کراوەکان بۆ ڕێکخستنی قەزیە بازرگانی و مەدەنی و خێزانییەکان ٩,٥،٣ و ١٢ ساڵ بوون. دواخستنی ئاسایی ڕێژەیەکی زۆر بەرزی هەبوو.

پارەدان دەکرێ ڕێگەیەک بێت بۆ خێرا کردنی بڕیارەکان کاتێ دواخستن و تەگەرە

تێخستن بەرز بن. بەرتیل دەران دەچنە پێشەوەی سڕەکە، چاوەڕێکردن بۆ ڕاستگۆکان زیاد دەکەن و هانی ئەوانی تر دەدەن پارە بدەن بۆ خزمەتی چاوەڕێ کراو. هەتا گەر حاکمەکانیش خۆیان گەندەڵ نەبن، فەرمانبەرەکان ئەوانەی کە شتێکیان بەدەستە و فایلەکان دەچێتەوە لای ئەوان داوای یان پەسنی بەرتیل دەکەن. نەبوونی کرێیەکی ڕەسمی دادگا پاڵنەر دروست دەکات بۆ فەرمانبەرەکانی دادگا و حاکمەکان بۆ داوا کردنی کرێ کە دەسەڵاتیان نییە داوای بکەن. بۆ نموونە، لە ڤەنزوێلا، پارەدانی نافەرمی ئاسایی و بەرچاوە لەگەڵ خزمەتێکی باش و خێرا لە سەر قەبارەی پارەدانەکە دەوەستێت. لە نێو تەواوی وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا، پیادەی کۆبوونەوە تایبەتەکان لە نێوان دادوەر و پارێزەرەکان بۆ بەرژەوەندی خاوەن کارەکان وەک پاڵنەرێک بەکاردەهێنرێت بۆ کارمەندانی نێو دادگا بە دادوەریشەوە. هەمان هەڵسوکەوت هەیە لە چین کە تیایدا بەرپرسە یاساییەکان زۆرجار داوا لە لایەنەکان دەکەن بۆ تۆمار کردنی داوا تاوەکو مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن پێش ئەوەی دادگاکە دەست پێ بکات. ئەم سیستەمە سوودێک بە داواکارەکان دەبەخشن، وا دەردەکەون کە دەتوانن پارە بدەن بۆ خێرا کردنی پرۆسەکە بە شێوەیەکی بەرچاو و کاریش بکەنە سەر ئەنجامەکە.

زۆربەی جار بەرتیل لە لایەن ئەو دادوەر و کارمەندانی پەسن دەکرێت و داوا دەکرێت کە مووچەیان کەمە و کار لە ژێر چەند مەرجێکی خراپتر دەکەن لە چاو پارێزەر و هاوکارە تایبەتییەکانیان. وێڕای ئەمەش، ڕەنگە خولی زیاتر پێویست بێت بۆ دادوەران گەر کار بکەن لە سەر جۆرە نوێیەکانی هەر پرسێک کە دێتە پێش دادگاکانیان لە ئەنجامی گەشەی ئابووری بازاڕدا. بڕیاردان لە سەر قەزیەیەک لە سەر بنچینەی بەرتیل ڕەنگە ڕێگایەکی ئاسان بێت بۆ دادوەرێک کە نەتوانێت بە باشی بە پرسێکی ئاڵۆزدا بچێتەوە.

چاکردنی هەلومەرجی پسپۆڕی و مووچە و هەلومەرجی کار کردنی دادوەران زۆر پێویستە، بەڵام دەبێ ئاوێتەی هەوڵەکان بکرێن بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرەکانی بەرتیلدان. ئەوانەی قەزیەی بێهێزییان هەیە ڕەنگە هیچ چاریان نەبێت جگە لە بەرتیل، بەڵام تەنانەت ئەوانەی کە وا دەزانن دەبەنەوە ڕەنگە بەرتیل بدەن بۆ خێرا



کردنی قەزیەکەیان. بۆ نموونە، توێژینەوەیەک لە سەر دەسەڵاتی قەزائی ئەمریکای لاتیندا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی چاکردنی ڕەوشەکان لە سیستەمی دادگادا دەبێ بە دەست بێت لە ڕێگەی تەکنیکی باشتری ئیدارە بە کۆمپیتەر کردن و دروستکردنی دادگای زیاتر و دامەزراندنی سیستەمێکی ئیداری یەکگرتوو.

ئەم جۆرە چاکسازییەی دەسەڵاتی قەزائی هاودژییەک دروست دەکات. گەر خزمەتەکانی نێو دادگا چاک کران، خەڵکێکی زیاتر ئەو خزمەتانە بەکاردێنن، ئەمەش دەمانبات بەرەو پێوستی سەرچاوەی زیاتر بۆ بەردەوامی جۆری خزمەتەکان. بۆ نموونە، کاتێ ئیکوادۆر زۆر بە باشی ڕەوشی دەسەڵاتی قەزائی خۆی باشتر کرد لە ساڵی ١٩٩٢دا، ژمارەی قەزیەکان ئێجگار زیادی کرد. توێژینەوەکان لە نێو وڵاتەکانی ئەمریکای لاتیندا هیچ پەیوەندییەکی نەدۆزییەوە لە نێوان سەرفکردنی پارە لە کارمەندان و دواخستنەکانی دادگا. لە زۆربەی بازاڕەکاندا، نرخ لە سەر شتەکان دانراوە لە ڕووی چەندایەتی و جۆرایەتییەوە، بەڵام گەر زۆری و بۆری بوو بە گرفت، بەکارهێنەری هەر خزمەتێک نرخ لە سەر ئەوانی تر دەسەپێنێت، بازاڕیش لەو کاتەدا بە باشی کار ناکات. هەرچەندە دادوەر و کارمەندانی دادگا کەمتر خۆشیان بەوە بێت بەرتیل وەربگرن، پارێزەر و تۆمەتبار وازیان لێ نەهێنن و بەرتیلیان بدەنێ بۆ ئەوەی قەزیەکەیان بۆ بێننە پێشێ. دەکرێ بەرتیل بەکاربهێنرێت وەک ناوەندێکی باش، بەڵام پێوەرەکانی هەڵسوکەوتی قەزائی پێشێل دەکەن و بەرپرسەکانی نێو دادگا هان دەدات بۆ ناساندنی دواخستنی بە ئەنقەست بۆ زیادکردنی پارەدان. بۆ نەهێشتنی ئەم ئەنجامەش، بە تایبەتی بۆ قەزیە بازرگانییەکان، چاکخوازان دەبێ ئەو ڕێگایانە ڕەچاو بکەن بۆ سەپاندنی کولفەی سیستەمەکە لە سەر تۆمەتبار و نەهێشتنی پاڵنەرەکان بۆ زیادکردنی دواخستن، وەک پارەی پارێزەران کە پاداشتیان دەکەن لە سەر بنچینەی ئاڵۆزی قەزیەکە. ڕێگایەک بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە بەخشینی پاڵنەری یاساییە بە کارمەندانی دادگا بۆ کار کردن بە خێرایی. چاکسازەکان دەتوانن زانیاری ببەخشن لە سەر دواخستنەکان بەهۆی جۆری قەزیەکە و پاڵنەری پارەدان دروست بکەن بۆ دادوەرەکان کە پەیوەستن بە چاککردنی کارەکانیان.

سێیەم، دەسەڵاتێکی قەزائی گەندەڵ زۆر گران دەوەستێت بۆ دیموکراسی چونکە ناتوانێت بە متمانەوە ڕۆڵی خۆی بگێڕێت لە چاودێری کردنی بەها دەستووریەکان یان چاودێری کردنی ڕاستگۆیی لقەکانی تری حکومەت. ئەمە ڕۆڵێکی گرینکە بۆ دادگاکان کە پێشکەش ناکرێن لە سیستەمێکی دەسەڵاتداریدا.

گەر مامەڵە سەرەکییەکانی وەگەڕخستن دەوڵەت بخاتە نێو مەسەلەکەوە وەک کڕیار، تایبەتکار یاخود دابینکەری داشکاندنێک، سیستەمێکی سەربەحۆی دادگا مسۆگەر کەرێکی پێوستە بۆ وەگەڕخستن. گەر ئیمتیاز و لێهاتوویی دەسەڵاتی قەزائی دامەزرێت، ئەوا سەربەخۆییان لە لقەکانی سیاسییەوە دڵنیا دەکرێتەوە. ئاشکرایە، سەربەخۆیی بەهادار نییە گەر دادوەرەکان بە ڕێزەوە سەیر نەکرێن، هەتا گەر ڕێزیان لێ بگیرێت، دادوەرە سەربەخۆکان دەتوانن حوکم دەرکەن کە ببێتە هۆی لەباربردنی چاکسازی. بۆ نموونە، لە بەڕازیل، دادگای باڵا تایبەتمەندێتی سەرەکی دواخست هەرکە بە بەرەنگاریەکانی فرۆشتن داچۆوە. لە فلیپین، دادگای باڵا، گرێبەستێکی گۆڕی بۆ تایبەتکردنی هۆتێلێک و یاسایەکی نادەستووری ڕاگەیاند بۆ بێ نیزامی پیشەسازی نەوت.

تەنانەت لە ئەرژەنتینیش دادوەرە ناڕازییەکان هیچ ناڕەزاییەکیان دەرنەبڕی لە بەرابەر یەکەم خولی چاکسازی ئابووری سەرۆک " مینێم"، بڕیارێک لە ساڵی ١٩٩٧ متمانەی سەرۆکایەتی هێنا خوارەوە کە ئەمیش پێشکەشکردنی داشکاندن بوو لە سەر فڕۆکەخانەکانی وڵات. هەرچەندە ئەو جۆرە حوکمانە نەسازاو بوو بۆ چاکخوازان، بەڵکو کولفەی دەسەڵاتێکی قەزائی سەربەخۆ بوو کە توانیشی پاڵپشتی دەستوور بکات و قەزیەی ئابووری بەرپرسە ئاست بەرزەکان چارەسەر بکات. وێڕای ئەمەش، لە هەندێ بارودۆخدا، کێشەکە سەربەخۆیی دەسەڵاتی قەزائی تاک نییە، بەڵکو کارەکتەرێکی چاک نەکراوی یاساکان و بنەما دەستوورییەکانە کە دەبێ شی بکرێتەوە.

زەحمەتە ئیدارەیەکی ڕاستگۆی حکومەت دامەزرێت گەر دەسەڵاتی قەزائی گەندەڵ و بەرتیلخۆر بێت. قوربانییانی بەرپرسی گەندەڵ هیچ شوێنێکیان نییە بۆی بگەڕێنەوە و پەنای بۆ بەرن، بێ ویژدانەکانیش دەتوانن بە حەسانەوە بەرتیل بدەن بە



بەرپرسەکان. مەترسی بەرپرسە گەورەکان لە ئەنجامدانی گەندەڵی و مامەڵەی ساختە کەمتر دەبێتەوە گەر سیستەمی دادگا خۆی گەندەڵ و بێ کەڵک بێت و سەربەخۆ نەبێت. هەندێ جار، تۆڕی ئاڵۆز پێک دێن بۆ درێژەدان بە سیستەمە گەندەڵییەکە. ئەوەتا لە ڤەنزوێلا، "هۆزە" قەزائییەکان وجوودیان هەیە کە پێک هاتوون لە تۆڕی نارەسمی حاکمەکان و کارمەندانی قەزائی و پارێزەری تایبەت و بەرپرسە سیاسییەکان. لە پێناو کرێ و پارە، ئەو گروپانە ئەنجامی چالاکییەکانی قەزائی سەبارەت بە قەزیە تایبەتەکان مسۆگەر دەکەن. لە کۆتاییدا، دەسەڵاتێکی قەزائی گەندەڵ دەبێتە بەشێک لە سیستەمێکی چەواشە کە تیایدا هەڕەشەی ئاشکرا کردن، تەنانەت بۆ بەرتیلدانیش، بەکار دەهێنرێت وەک ڕێگایەک بۆ دەستەبەرکردنی هاوکاری تایبەتی نێوان تاک و کۆمپانیا زەبەلاحەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ژێر فشاری چەند هەلومەرجێکدا، دەسەڵاتێکی قەزائی ڕاستگۆ دەتوانێت یارمەتی پاراستنی سیستەمێکی گەندەڵ بدات. وا دابنێ کە تاکە تایبەتەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان مامەڵەی گەندەڵی بە نهێنی لەگەڵ بەرپرسە حکومیەکان دەکەن. ئەکتەرە تایبەتییەکان ئامادەن پارە بدەن چونکە دڵنیان لەوەی کە گرێبەستەکانی کڕین و داشکاندنەکان و مامەڵە تایبەتییەکان کە بە دەستی دێنن پاڵپشتیان لێ دەکرێت لە لایەن سیستەمێکی قەزائی ڕاستگۆوە. وا دابنێ، هەروەک لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاش، داواکاری گشتی بەشێکە لە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی حکومەت، نەک بەشێک لە دەسەڵاتی قەزائی. گەر حکومەت، لە دەرەوەی دەسەڵاتی قەزائیدا، ڕێک بخرێت بۆ ئاسانکاری گەندەڵی، کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتییەکان دڵنیان کە کەس داوا لە دژیان تۆمار ناکات. هەتا گەر کارەساتێک سەر هەڵبدات، ئەوا لە ڕووی سیاسییەوە تەنها بەرپرسە حکومییەکان دەناڵێنن. ڕەنگە ئەمە هەندێ بەرپرسی حکومی لابدات، بەڵام زاڵ نابێت بە سەر تاکی تایبەت.

باشترین نموونە لە سەر گەندەڵی لە سەر بنچینەی برادەرایەتی لە نێو سیاسەتەوە لە ساڵانی سەرەتای ئەمریکای کۆماردایە. فرۆشتنی زەوییەک بە گەندەڵی ڕەزامەندی وەرگیرا لە لایەن یاسادانەرێک لە جۆرجیا لە سەرەتای هەشتاکان و

پاڵپشتی لێ کرا لە لایەن دادگای باڵای ئەمریکا لە قەزیەی " فلێچەر بەرامبەر پێک" (Ed.L٣. ١٦٢–١٨١ (١٨١٠)). دادگا لە بەردەم ئەو ڕاستییە چۆکی دانەدا کە تەنها یەک یاسادانەر بەرتیلی دراوەتێ. کاتێ کارەساتەکە ئاشکرابوو، تەواوی دەسەڵاتی یاسادانان لە هەڵبژارنی داهاتوودا دۆڕاندیان، بەڵام دادگا ڕایگەیاند کەوا گرێبەستەکە ئەرکێکی یاسایی بووە لە ویلایەتی جۆرجیا. چ ڕێگایەکی باشتر هەیە بۆ هاندانی پارەدان جگە لە سیستەمی یاسایی کە پاڵپشتی گرێبەستێکی گشتی بکات، جا گرینگ نییە چ مامەڵەیەکی گەندەڵ بێت؟

قەزیەی " فلێچەر بەرامبەر پێک" زەنگێکە و ئاگادارمان دەکاتەوە کە دامەزراندنی دەسەڵاتێکی قەزائی سەربەخۆ بەس نییە گەر گەندەڵی پەرش و بڵاو بوویێتەوە. چاکسازی قووڵتر لە نێو سیستەمی سیاسیدا پێویستە. بەڵام، گەر دەسەڵاتی قەزائی سەربەخۆ پێچ و پەنای تیا بێت، فیکرەیەکی بەهادارە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، ماوەی خزمەتی ژیان و سنوورەکان لە سەر تاوانی کۆنگرێسی بۆ کەمکردنەوەی مووچە یارمەتی چەسپاندنی سەربەخۆیی دا لە دەسەڵاتی قەزائی فیدراڵدا، بەڵام زۆر وڵات هەیە دەسەڵاتی قەزائی سەربەخۆیان هەیە بەبێ ئەو کۆنتڕۆڵانەش. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، پرۆسەی دامەزراندن "تەعینات" خراوەتە نێو قاڵبی سیاسەتەوە لەگەڵ تەعیناتی سەرۆکایەتی دواتریش ئەنجوومەنی پیران دووپاتی کردەوە. گەر ئەنجوومەن کۆنتڕۆڵ بکرێت لە لایەن حیزبێک جیا بێت لەوەی سەرۆک، ئەوا ئەمە تەعیناتی پارتیزانی سنووردار دەکات، بەڵام گەر وا نەبێت، ئەوا ئەو کۆنتڕۆڵە بە ئاشکرا جێبەجێ نابێت. لە سەر ئاستی ویلایەت و مەحەلیدا، هەندێ دادوەر هەڵدەبژێردرێن. لە هەندێ وڵاتی تردا، تەعینات بۆ دادگای دەستووری زۆر بە توندی کۆنترۆڵ کراون لە لایەن پسپۆری یاساییەوە، هەروەها لە وڵاتی تریشدا لیژنەی تایبەتی هەیە ئیختیارەکان هەڵدەبژێرێت. لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە یاسای تەقلیدی مەدەنییان هەیە، دادوەر لە دادگا نزمەکاندا پیشەی بیرۆکراتی پێویستن کە پیشەیەکی قەزائی هەڵدەبژێرن لە سەر یاسای تەواو کردنی قوتابخانە. بەڵام، دەسەڵاتی قەزائی بە جیا لە خزمەتە مەدەنییەکانی تر ڕێک دەخرێت و دروست دەکرێت بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکی بەردەوام بێت. بۆیە، تاکە دەسەڵاتێکی قەزائی



بەرچاو نییە بەردەست بێت بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە بەدەست دەهێنرێت، بەرپرسە سیاسییە گوماندارەکان درێغی ناکەن لە پشتگیری کردنی دەسەڵاتێکی قەزائی سەربەخۆ وەک هەنگاوێکی پێوست لە دروستکردنی دەوڵەتێکی باوەڕپێکراو و پابەند بە حوکمی یاسا.

لە ڕووی سیاسییەوە چاکسازی لە دەسەڵاتی قەزائی زەحمەتە. هەرچەندە ڕووپێوەکانی هاوڵاتیان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە ناڕازی بوون لە دەسەڵاتی قەزائی لە گەلێ وڵاتدا، دادوەرەکان خۆیان بەمە دڵخۆش نین. ڕەنگە پشتگیری ئەو بەرنامانە بکەن بۆ زیاد کردنی مووچە و باشتر کردنی مەرجی کارکردن بەڵام نەک ئەو چاک کردنانە پەیوەست بن بە پێداچوونەوەی ئەنجامدانی کارەکان. ڕەنگە دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیش هەمبەر بێت لە بەردەم چاکسازی گەر دادگاکان پڕ بن لە تەعیناتی بە واستە. ڕاپۆرتێکی بەم دواییە بە وردی باسی ئەو گرفتانە دەکات کە دووچاری پڕۆژەی یەکەمی چاکسازی قەزائی بانکی جیهانی دەبنەوە لە ڤەنزوێلا. چاکخوازان تووشی ئەو پرسیارە دەبنەوە ئایا کارمەندان و دادوەرانی ئێستای نێو دادگا کەسب کەن یانیش هەوڵ بدەن گروپێکی نوێ لە شوێنی ئەواندا بنێت. لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ڕەخنانەدا، باسێکی بانکی جیهانی لە سەر چاکسازی دەسەڵاتی قەزائی پێشنیاری چوونە پێش دەکات تەنها گەر دادوەرانی ئێستای نێو دادگا هاوکاری یەکتر بکەن. هەرچەندە ڕەنگە بانکی جیهانی ئیختیارێکی کەمی هەبێت بۆ پڕۆژەکانی خۆی لەم ناوچانەدا، ڕەنگە ئەمە ئیختیارێکی ڕاست نەبێت لەو وڵاتانەی کە سیستەمێکی زۆر گەندەڵیان هەیە. گۆڕانکاری لە کارمەندان پێویستە، بەڵام تەنانەت دوای ئەوەش، هەرگیز نابێ ئەمە کاری کۆتایی بێت. گەر دواخستن بۆ ماوەیەکی درێژ و پێوەرە یاساییەکان پاڵنەری گەندەڵ دروست بکەن، ئەمە وا پێ ناچێت کە گۆڕانێک لە ڕووەکان زۆر بە دەست بێت. گۆڕانی کارمەندان دەبێ بەند بێت بە چاکسازی پێکهاتەیی و ئیدارییەوە.

# ئاژانسە سەربەخۆکانی دژە گەندەڵی

زۆرجار داواکارەکان گەندەڵی پشت گوێ دەخەن و جەخت لە سەر ئەو پرسە هەستیارانە دەکەنەوە کە کەمتر بەندن بە سیاسەتەوە. وەڵامێک بۆ ئەمە دروستکردنی کۆمیسیۆنێکی سەربەخۆی دژەگەندەڵییە یاخود ژەنیراڵە پشکنەرەکان تەنها راپۆرت بکەن بۆ دەستەی سەرۆکایەتی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن یان پەرلەمان. باشترین نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە لە هۆنگ کۆنگ و سەنغافورایە، هەردوو "دەوڵەت شار" و ژێردەستە بەریتانییەکانیش. لە هەردوو حاڵەتدا، کاتی تەواو لە گەندەڵی پابەندبوونی لە سەرەوە تێکەڵ کردووە لەگەڵ سەپاندنی یاسا لە لایەن ئاژانسە سەربەخۆکانەوە کە کار دەکەن لە ژێر یاسای بەهێزدا، هەروەها لە ژێر چاکسازی خزمەت گوزاریە مەدەنییەکاندا.

گەندەڵی لە هۆنگ کۆنگ لە سالانی شەستەکان ئێجگار زۆر بوو. لەو کاتەدا گەندەڵی بە هۆی ویستی خەڵکەکە بۆ گەندەڵی رەگی داکوتا بوو. هەموو خەڵک ئیختیاری ئەوەی هەبوو " بچێتە نێو پاسەکە" یاخود " بژیت لەگەڵ پاسەکە" ( واتە دوور بوەستێت و تەداخولی سیستەمەکە نەکات). " وەستان لە پێشەوەی پاسەکە" ( راپۆرت کردن لە سەر گەندەڵی یان بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی) ئیختیارێکی ویستراو نەبوو. بەهۆی کارەساتێک لە لایەن ئەفسەرێکی پلە باڵای پۆلیسدا کارەکە تەقیەوە، حاکم هەڵسا بە دامەزراندنی کۆمیسیۆنێکی سەربەخۆ دژی گەندەڵی (ICAC) لە ساڵی ١٩٧٤ ICAC راپۆرتی تەنها بۆ حاکم دەبرد و سەربەخۆش بوو و هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ هێزی پۆلیس نەبوو. فەرمانبەرانی ICAC مووچەیان زیاتر بوو لە بیرۆکراتەکانی تر، هەروەها بە هیچ شێوەیەک نەدەگوێزرانەوە بۆ بەشەکانی تر. هیچ فەرمانبەرێکی ICAC لە کۆتاییدا بۆی نەبوو کار بکات لەگەڵ ئەفسەرێکی پلە دار کە موعەرەز بوو بۆ لێکۆڵینەوە. ICAC تەواو دەسەڵاتی پێ بەخشرا بوو بۆ لێکۆڵینەوە و داوا تۆمار کردن لە سەر قەزیەکان، پێشنیاری گۆرانی ئیداری و یاسایی بکات بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵەکان، هەروەها بۆی هەبوو بەشدار بێت لە هەڵمەتی گشتی بڵاو کردنەوەی هۆشیاری.



سیاسەتە نوێیەکە سەرکەوتنێکی بەرچاوی هێنا لە گۆرینی باوەر و تەوەقوعاتی هاولاتیان. متمانەی دامەزراوە نوێیەکە دیاری کرا بە هۆی ژمارەی زۆری نارەزاییەکان کە بە دەستی گەیشت لە سەر تەعینات، لەوەش باشتر ئەوە بوو کە رێژەیەکی زۆری ئەو نارەزاییانە نهێنی نەبوون. سەرەرای سەربەخۆیی ICAC، پابەندبوونی حکومەت بۆ چاکسازی دیاری کرا لە لایەن تەعین کردنی کەسێک بۆ لێپرسینەوەی هەموو کەسێک بە یەک چاو، گەر سەرۆکی ICACش بێت، ئیتر بە هۆی سیاسەتی نوێی لێکۆڵینەوە داوا تۆمار کردن لە سەر " پڵنگە گەورەکان" بوو بە کارێکی ئاسایی. هاوکات، هەوڵەکان بۆ پاک کردنەوەی سەندیکا گەندەڵەکان لە نێو پۆلیس، یەکی گرتەوە لەگەڵ نارەزاییەکان، دواتر ICAC پاشەکشێیەکی کرد و لێبوردنێکی گشتی بەخشی بۆ ئەو کارانەی ئەنجامدراون پێش ١/١ ١٩٧٧ ئەم پاشە کشێیە زیانبەخش بوو، بەلام ICAC توانی جەختێکی زۆر لە سەر بڵاوکردنەوەی هۆشیاری بکاتەوە و زاڵ بێت بە سەر ئەو زیانانە. چەندین رووپێو لە سەر خەڵکی گشتی ئەنجام درا لە نێوان ساڵانی ١٩٧٧ و ١٩٩٤، ئەو رووپێوانە ئەوەیان خستە روو کە تێگەیشتنی خەڵک لە گەندەڵی فەشەلی هێنا لە ساڵانی بەرایی ICAC. بەڵگەی ناراستەوخۆ پێشنیاری ئەوە دەکات کە بە هەقیقەت گەندەڵی کەم بۆوە لەگەڵ تێگەیشتنی خەڵکی و ئاشکرابوونی.

پاش ئەوەی هۆنگ کۆنگ لەگەڵ چین یەکی گرتەوە، داهاتووی ICAC کەوتۆتە گومانەوە، هەروەها دەرفەتەکانی کار لە سەر خاکی سەرەکی(چین) سوودەکانی گەندەڵی زیاد کردووە. هۆنگ کۆنگ مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە بگەرێتەوە سەر باری پێشووی گەندەڵی پێش دامەزراندنی ICAC. سەرۆکی ICAC لە کاتی گواستنەوەدا مشتومرێکی کرد لە چاوپێکەتنێک لە ساڵی ١٩٩٧ کە ICAC ی بەهێز زۆر پێویست بوو بۆ گۆرانێکی سەرکەوتوو و رایگەیاند کە ئاژانسەکە بەردەوام دەبێت بۆ جەختکردنە سەر سێ تەوەرەکەی کارکردنی کە ( سزادان و نەهێشتنی گەندەڵی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری) بوو. ئەوانی تر زۆر گەشبین نەبوون، هەرچەندە ICAC بەردەوام بوو لە هێنانی قەزیە بۆ بەردەم دادگا.

سەنغافوراش چیرۆکێکی دیکەیە کە سەرکەوتنێکی باشی تۆمار کرد. لە نێو ولاتە

ئاسیایەکاندا، سەنغافورا یەکێک لە هەرە پاکترین وڵاتە بۆ کار کردن. جار جار، لێرە و لەوێ، گەندەڵی ڕوودەدات، بەڵام ئێجگار زۆر و زیانبەخش نین. بەڵام لە سەردەمی داگیرکاریدا، سەنغافورا شوێنێکی زۆر گەندەڵ بوو. چۆن بە سەر ئەو گەندەڵییە بازی دا؟ دوای جەنگی جیهانی دووەم، فەرمانبەرە حکومییەکان مووچەیەکان زۆر کەم بوو و بە باشی سەرپەرشتی نەدەکران. گەندەڵی لە نێو پۆلیسدا ئێجگار زۆر بوو. کاتێ " حیزبی کرداری خەڵک" (PAP) لە ساڵی ١٩٥٩ دا دەسەڵاتی گرتە دەست، کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی کردە یەکێک لە بەرنامە هەرە سەرەکی و پێشەکییەکانی. وەک بەشێک لە ستراتیژیەتی، حکومەتی PAP دەسەڵاتی نووسینگەی لێکۆڵینەوە لە کارە گەندەڵیەکان بەهێز کرد (CPIB). ئەو بەشەش لە ساڵی (١٩٧٠ )وە ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆک وەزیراندایە. CPIB سەرکەوتنێک بوو، بەڵام هەندێ لە هەمان گرفتەکانی ICAC لە هۆنگ کۆنگ بۆ پێش هات. CPIB بەند نەبوو بە لێپێچینەوە دەرەکبیەکان، هەروەها ئەوانەی تۆمەتبار بوون بە گەندەڵی هەندێ جار هەڵسوکەوتی قورسی ئاژانسەکەیان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە مافەکانیان پێشێل دەکەن.

سەنغافورا داوا لە وەزیرەکانیش دەکات بە کارەکانیاندا بچنەوە بە مەبەستی کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵییەکان. ستراتیژیەکان ئەمانە دەگرێتەوە: دواخستنەکان و خولانەوەی ئەفسەرەکان و زۆرکردنی سەرپەرشتی. وڵاتەکە پاڵنەرە گەندەڵییەکان کەم دەکاتەوە بەهۆی بەخشینی فەرمانبەرە حکومیەکان بەشێک لە کارەکانیان لە ڕێگەی مووچەی بەرز و پاداشت و مەرجی گونجاوی کار کردن. مەبەستی ئەمەش قەرەبوو کردنەوەی فەرمانبەری حکومی بوو بە بەراورد لەگەڵ فەرمانبەرانی کەرتی تایبەت.

لە هۆنگ کۆنگ و سەنغافورا پابەندبوون کاتی تەواوی گەندەڵی لە سەرەوەی تێکەڵ کرد بە سەپاندنی یاسای باوەڕپێکراو بەهۆی ئاژانسێکی سەربەخۆوە کە لە ژێر یاسایەکی بەهێزدا کار بکات، هەروەها چاکسازی لە خزمەتە مەدەنییەکاندا. پێش یەکگرتنەوەی هۆنگ کۆنگ لەگەڵ چین، ICAC کۆنترۆڵێکی باشتر بوو لە نووسینگەی سەنغافورا بەهۆی لیژنەی پێداچوونەوە و دەسەڵاتی قەزائی سەربەخۆ.



ئاژانسێکی توند و سەربەخۆی دژە گەندەڵی دەکرێ ببێتە ئالیەتێکی بەهێز و پابەندبوونێکی درێژ خایەن بنوێنێت و بە هەڵە بەکارهێنانی سیاسیەت بنبڕ بکات.

سەرکەوتنەکانیش هەندێ جار دروستبوونی ئاژانسی دژە گەندەڵی زیاتری بە دواوە دەبێت کە تایبەت چاودێری سیستەمی حکومەت دەکات. بۆ نموونە، " دەسەڵاتی قوتابخانەی ئاوەدانکردنەوە" لە شاری نیۆرک ئاژانسێکی لە ناوەخۆ دامەزراند کە هەندێ سەربەخۆیی هەبوو بۆ گەڕان بە دوای بەڵێندەرە گەندەڵەکان و پێشنیاری ڕێکخستنەوەی ناوەکی کرد بە مەبەستی کەمکردنەوەی گەندەڵی. ئەم ئاوێتە بوونە نەک هەر تەنها جەخت دەکاتە سەر واقیعی دوای سەپاندنی یاسا بەڵکو یارمەتی سیستەمێکی ناوەکی بۆ کۆنترۆڵکردن دەدات. هەرچەندە هەندێ ڕەخنەگر پێیان وایە کە زۆر توند و هەڵقوڵتێنەر بوو، قوتابخانەی دەسەڵاتی ئاوەدانکردنەوە بە ئاشکرا پارەی خۆی سەرف کرد لە ڕێگەی گێڕانەوەی ملیۆنەها دۆلار بۆ شارەکە. ئەم ئەزموونە پێشنیاری ئەوە دەکات کە بەهای تێکەڵکردنی سوودەکانی دەستەیەکی داواکاری سەربەخۆ لەگەڵ توانای چاودێریکردن لە ناوەوەی ئاژانسێکی گشتی گرینگە. ئەم ئیختیارە گرفتی هەڵخەڵەتێنەر دەخاتە ڕوو بۆ نەهێشتنی گەندەڵی، بەڵام بەڵێنی ئەوەش دەدات چاکسازی پێکهاتەیی گونجاو بکات گەر لەودیو بوارە دامەزراوەکانی هۆنگ کۆنگ و سەنغافوراوەش بێت.

ئاژانسە سەربەخۆکانی دژە گەندەڵی پێشنیاری چاکسازی گشتین بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان. سەرەڕای هۆنگ کۆنگ و سەنغافورا، ژمارەیەکی تری دەسەڵاتی قەزائی وەک لە مالیزیا و بۆتسوانا و مالاوی و ویلایەتی ئوستوراڵی نیو ساوس وەیلز هەمان دامەزراوەیان هەیە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت CIAC ی هۆنگ کۆنگ بێ گیروگرفت نییە. لە ژێر سایەی حوکمی بەریتانی، CIAC ڕاپۆرتی تەنها بۆ حاکمی عەقید دەنارد. کۆمیسیۆنێکی دژە گەندەڵی ڕاپۆرتی لە سەر حاکمە ئۆتۆکراتەکان دەکرد دەکرێ بەکاربهێنرێت وەک ئالیەتێک بۆ داپڵۆسین دژی ڕکابەرە سیاسییەکان، هەتا CIAC نەبۆتە ڕێگر لە بەردەم ئەو بەرپرسیارێتیانە. دەسەڵاتە پەرت و بڵاوبووەکانی CIAC لەو سیستەمانەی کە کەمتر پابەندن بە حوکمەکانی یاسا هەڕەشەیان لێ دەکرێت. لە هۆنگ کۆنگ زنجیرەیەک لیژنەی چاودێری و دەسەڵاتی سەربەخۆی قەزائی لێپێچینەوەیان لە CIAC کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جار جار

کارەساتێک هەر دروست بووە. وەک لێپێچینەوە لە سەر دەسەڵاتی، ئەو جۆرە ئاژانسە ڕەنگە ڕاپۆرت نەنێرێت بۆ بەڕێوەبەری جێبەجێ کردن بەڵکو بۆ یاسادانان بنێرێت، هەروەک نووسینگەی ژمێریاری گشتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.

کێشەیەکی زەقی تر کەمی جەختە لە سەر چاکسازییە پێکهاتەییەکان. بۆ نموونە، پرۆسەی وەرگرتنی مۆڵەتی لێخوڕین لە هۆنگ کۆنگ زۆر درێژ و سەختە. CIAC بەوەی زانی کە بەرتیل دراوە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی لێخوڕین بە خێرایی. لەگەڵ ئەوەشدا، مەندوبی کۆمیسیۆنەکە چەند ڕێگایەکی تیایە بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرە گەندەڵیەکان، ئاژانسەکە جەختی کردەوە لە سەر یاسای دژی شوفێرە گەندەڵەکان و فەرمانبەرە حکومیەکان نەک لە سەر چاکسازی بیرۆکراسی بۆ باشکردنی باری مۆڵەت پێدان. سیاسەتێکی دژە گەندەڵی زۆر بەکەڵک نابێت گەر لە شوێنی خۆی یاسا و پرۆسەی نابەجێ دەربکات کە ببنە هۆی زۆربوونی پاڵنەر بۆ بەرتیل. ئاژانسێکی دژە گەندەڵی دەبێ تەنها یەک بەش بێت لە ستراتیژیەتێکی فراوانتر کە چاکسازی ڕیشەیی زیاتر لەخۆ گرتووە و دەبنە پاشکۆی بەرنامەکانی سەپاندنی یاسا.

## کراوەیی و بەرپرسیارێتی

خەڵکی گشتی دەتوانن ببن بە سەرچاوەیەکی گرینگی لێپێچینەوە لە سەر پیادەکردنی دەسەڵات لە لایەن حکومەتەوە. بەڵام، ئەم لێپێچینەوەیە کار دەکات تەنها گەر حکومەت زانیاری لە سەر کارەکانی ببەخشێت. هاوڵاتیان دەبێ ناوەندی گونجاویان هەبێت بۆ ناردنی نارەزاییەکانیان و بپارێزرێن لە بیری تۆڵە سەندنەوە. بێگومان، بەرپرسە حکومیەکانیش دەبێ وەڵامدانەوەی ئەو نارەزاییانە لە بەرژەوەندی خۆیاندا بدۆزنەوە. دوو ڕێگای گشتی هەیە بۆ فشاری گشتی: نارەزایی بە گروپ و کۆمەڵ لە لایەن هاوڵاتیانەوە دەربارەی سەرنەکەوتنی گشتی حکومەت و ئەو نارەزاییانەشی کە لە لایەن تاکێکەوە بەرز دەکرێتەوە لە دژی مامەڵەی دەسەڵاتداران لەگەڵ هاوڵاتیاندا. ڕێگای بە تاک و بە کۆمەڵ یارمەتی خێرا کردنی چاکسازی پێکهاتەکانی حکومەت دەدات.



## زانیاری و پێداچوونەوە

پێشە مەرج بۆ هەر جۆرێک لە نارەزایی زانیارییە. ئاسانە گرینگی پۆستەر و لافیتە و ڤیدۆ کەم بکەیتەوە کە لە ڕێگەی ئەوانەوە بە خەڵکی ڕادەگەیەنن چی لە بەرپرسە ڕاستگۆیەکان چاوەڕێ دەکەن و چۆنیش نارەزایی دەردەبڕن. لە زۆر حاڵەتدا، ئەو جۆرە کارە پڕ لە زانیارییە نوێنەرایەتی هاوڵاتی ئاسایی دەکات کە بۆ یەکەم جارە گوێی لەوە بووە کە مافیان هەیە دژی دەسەڵاتێکی خراپ.

سەرەڕای زانیاری بنەڕەتی لە سەر پێوەرە ڕەسمیەکانی هەڵسوکەوت، هاوڵاتیە چالاکەکان پێویستییان بە زانیاری ڕوونترە. دەبێ حکومەت پێیان بڵێت چی دەکات لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بودجە پاڵپشتکراو و کۆکردنەوەی داهاتوو و حوکم و یاساکان و چالاکییەکانی دەستەی دەسەڵاتی یاسادانان. ئەو جۆرە پیادانەش پێوەرن لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، بەڵام گەلێ وڵاتی پێشکەوتوو هەیە بە جدی کەم وکوڕیان هەیە لەم ڕووەوە. داگیرکراوەکانی پێشوو زۆرجار ئەو سیستەمە بەکاردەهێنن کە لە لایەن داگیرکەرەکەوە سەپێنراوە، ئیتر ڕەنگە لەگەڵ بارودۆخی مەحەلیدا نەگونجێت. زانیاری دارایی دەبێ چاودێری بکرێت و بڵاوبکرێتەوە لە لایەن دەسەڵاتە سەربەخۆکان وەک نووسینگەی ژمێریاری گشتی (GAO) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاخود کۆمیسیۆنی وردکاری لە بەریتانیا. GAO چاودێری دەسەڵاتی فیدراڵی جێبەجێ کردن دەکات بەڵام ڕاستەوخۆ ڕاپۆرت بۆ کۆنگرێس دەنێرێت. چارەسەری کێشەکانی گرێبەست دەکات و کاری ژمێریاری ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێک دەخات و هەموو نارەزاییەکان بۆ/ یان لە دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان چارەسەر دەکات و زانیاری کۆدەکاتەوە بۆ کۆنگرێس، هەروەها پێشنیاریش دەخاتە بەردەست بۆ کێشە زۆر گرینگەکان. کۆمیسیۆنی ووردکاری بەریتانی وورد دەبێتەوە لە حکومەتە مەحەلیەکان و خزمەتگوزاری تەندروستی نەتەوەیی و ڕاپۆرت بۆ حکومەتی نەتەوەیی دەنێرێت. هەردوو دەزگا سەربەخۆن لە چاودێری کردنی دام و دەزگا حکومیەکان، ئەمەش مەرجێکی پێویستە بۆ متمانەی کارەکانیان. خود-چاودێری کردن گومانی لە سەرە چونکە دامەزراوێکی حکومی کە

شت ئاشکرا بکات و ڕاپۆرت بنێرێت ڕەنگە کاریگەری و ئەنجامی نێگەتیڤی لێ بکەوێتەوە. بۆیە پاڵنەرەکەی بێهێزە لە چاودێری کردنی هەڵسوکەوتی فەرمانبەرەکانی.

لە هەموو وڵاتە دیموکراسییەکاندا، دەسەڵاتی یاسادانان دەتوانێت ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕێت لە پێداچوونەوەی خەرجیەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن. لە سیستەمە سەرۆکایەتیەکاندا، لیژنەکانی کۆنگرێس، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا لە لایەن GAO وە هاوکاری دەکرێن، دەتوانن بە بەردەوامی چاودێری بکەن. لە سیستەمە پەرلەمانییەکاندا لە سەر شێوازی " وێستمنیستەر"، لیژنە گشتیەکانی ژمێریاری (PAC)، زۆرجار ئەندامێکی موعارەزە لە نێو پەرلەمانی سەرۆکایەتی دەکات، هەمان کار ئەنجام دەدات. بۆ نموونە، لە شانشینی یەکگرتوودا، PAC ڕاپۆرتێکی دەرکرد لە ساڵی ١٩٩٤، باسی ئەوە دەکات کە ژێرکەوتنە مەترسیدارەکان لە سیستەمە دارایی و ئیداریەکاندا وجوودیان هەبوو و بووە هۆی ئەوەی پارەیەکی زۆر بە فیڕۆ بچێت و لە هیچ سەرف بکرێت. PAC لە کینیا، وەک پەرلەمانی خۆی، لە ڕووی سیاسییەوە دابەش کراوە و ناتوانێت بە شێوازێکی کاریگەر بە سەر دەسەڵاتی جێبەجێ کردنەوە کار بکات.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و دیموکراسیەکانی وێستمنیستەردا، تەداخولی بەرپرسە سیاسییە موعارەزەکان لە ناوەندی چاودێری کردندا و پێداچوونەوەکە ستافێکی سیاسی دەوێت. واریدەکان ڕەنگە لە فۆرمی دۆکیومێنتی ژمێریاریدا بن، بەڵام مشتومڕەکە لە لایەن فاکتەرێکی سیاسییەوە کاریگەری لێ دەکرێت. ئەمە دەبێ لە دیموکراسیەتێکی کارادا هەبێت، بەڵام ڕێگایەکی زۆر زەحمەتە بۆ لابردنی شکستی ئابووری. گەر سەرپێچیەکانی یاسای تاوانکاری ئاشکرا بکرێن، ئەوا دەبێ سیستەمێکی قەزائی سەربەخۆش هەبێت بۆ بەدوادچوونی بانگەشەکان.

لە گەلێ وڵاتدا پێداچوونەوەی دەرەوە بەربەستی لە بەردەمە چونکە فەندی نهێنی و چاودێری نەکراو هەیە بۆ دەستەی سەرۆکایەتی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و وەزیرەکان. ئەو فەندانە داوەتن بۆ گەندەڵی لە تەواوی جیهاندا. لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بودجەی دەزگاکانی ئاسایشی نەتەوەیی وەک CIA بڵاوناکرێتەوە.



بەڵام لیژنەیەکی تایبەتی سەر بە کۆنگرێس چاودێری دەکات، ئاستێکی پێداچوونەوە کە دەچێتە ئەودیو چەندین وڵاتەوە کە تیایدا دەسەڵاتی جێبەجێ کردن هیچ دەسەڵاتێکی سەرەکی نییە بە سەر خەرجیە نهێنییەکانەوە. بۆ نموونە، " کارلۆس ئەندریا"ی سەرۆکی ڤەنزوێلا دەستی لە کار کێشایەوە پاش ئەوەی تۆمەتبار کرا کە ١٧ ملیۆن دۆلاری لە ڕێگەی فەندە نهێنییەکانەوە خراپ بەکارهێناوە. بۆ نموونە، پێش ساڵی ١٩٨٩، شانشینی یەکگرتوو بە ئاسانی ئەوەی ڕەت کردەوە بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕایبگەیەنێت کە دەزگایەکی هەواڵگری لە ناوەخۆیدا هەبووە. لە بەڕازیل، کاتێ سزای سەرۆک کۆلەر لە بەردەمی کۆنگرێسدا بوو، چاودێران نیگەران بوون لەوەی کە هاوپەیمانەکانی بە دوای هەلێکدا دەگەڕێن فەندە حکومیە نهێنییەکان بەکاربهێنن بۆ بەرتیلدان بە ئەندامەکان بۆ ئەوەی بڕیارێکی گونجاوی بەسەردا بدەن.

هەندێ حکومەت زانیاری باش کۆدەکاتەوە لە سەر کار و چالاکییەکانی بەڵام ئاشکرای ناکات و بڵاوی ناکاتەوە. لەو جۆرە حاڵەتانەدا، ئەو یاسایانەی کە ماف دەبەخشن بە هاوڵاتیان بۆ وەرگرتنی زانیاری دەکرێ ببن بە مەرجی گرینگ بۆ چاودێری گشتی بە ئاشکرا. سەربەخۆیی یاسای زانیاری لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئەم کارە دەکات، هەروەها یەکێتی ئەوروپاش چەند وڵاتێکی ئەندامی لێکۆڵەریان هەیە بۆ دەرکردنی ئەو یاسایانە لەگەڵ ڕێز بۆ زانیاری. ئەو یاسایانە ڕێگە بە هاوڵاتیان دەدەن زانیاری لە سەر حکومەت بە دەست بێنن بە بێ ئەوەی پێویستیان دەربخەن بۆ زانین. ڕەنگە داوای زانیاری بکەن وەک ئەندامانی گشتی بە بێ نیشاندانی ئەوەی کە بارودۆخی تایبەتی کەسایەتییان لەکەدار بێت. شازەکان تایبەتمەندێتی و یاداشتە لێک گەیشتنەکانی ناوخۆ و یەکرێزی داواکاری بەردەوام دەپارێزێت.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، تا ئاسایشی نەتەوەیی لە مەترسیدا نەبێت، دانیشتنەکانی دەسەڵاتی یاسادانان کراوەن بۆ خەڵک، وەک گەلێ لە کۆبوونەوە و دانیشتنەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن. سەبارەت بە ئاژانسە فرە ئەندامەکانەوە، حکومەت لە بەندی "سەنشایندا" ڕێگە بۆ هاوڵاتیان خۆش دەکات بگەن بە هەموو کۆبوونەوەیەک کە بڕیاری تیادا دەردەچێت. هەندێ ڕەخنەگرانی ئەو بەندە مشتومڕی ئەوە دەکەن کە کۆبوونەوەی کراوە زۆر باشتر دەبێت گەر بڵاو بکرێتەوە و پێشتر

باکگراوندێکی لە سەر پێشکەش بکرێت. ئەوانی تر مشتومڕی ئەوە دەکەن کە بەندەکە پرۆسە ئەنقەستەکانی ئاژانسەکە ئیفلیج دەکات. بەڵام هەتا ڕەخنەگرەکانیش ئەو داوایە دەکەن کە دەنگدان و بڕیارە گرینگەکانی تر دەبێ لە کۆبوونەوەی کراوەدا پێشکەش بکرێن.

هەندێ وڵاتی تر هەیە یاسای ئەمریکییان کۆپی کردووە کە داوای زانیاری و کۆبوونەوەی کراوە دەکات، بەڵام پێویستی بنەڕەتی بەیەکگەیشتنی گشتی لە هەموو شوێنێک سەرهەڵدەدات. پرسی ئێستا مافی خەڵکیە بۆ وەرگرتنی زانیاری لە سەر دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و فێری هۆیەکانی بڕیاردان بن و ئەوانەش دیار بخەن کە کاریگەری گەندەڵی خۆویستیان لە سەرە.

بەڵام ئازادی بەندی زانیاری بەهای کەمە گەر حکومەت زانیاری زۆر کۆنەکاتەوە. گەلێ وڵات دەبێیەکەم جار سیستەمەکانی زانیاری ڕێک بخەن، ئەو زانیاریانە بخەنە بەردەستی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە بە دۆکیومێنت، هەروەها خەڵکیش دڵنیا بکەنەوە کە ئەو زانیارییانەی تا ئێستا بڵاو نەکراونەتەوە بە دەستیان دەگات. بە هەمان شێوە، حوکمێکی کۆبوونەوەی کراوە بەهای کەم دەبێت گەر یاسای فەرمی نادیار بێت و هەر بڕیارێک دەربچێت دووپات نەکرێتەوە.

## میدیا و ڕای گشتی

تەنانەت حکومەتێک کە بەردەوامە لە سەر تۆماری باش و زانیاری دەخاتە بەردەستی خەڵک ڕەنگە بە حەسانە کار بکات گەر کەس سەری خۆی نەیەشێنی بۆ شیکردنەوەی زانیارییە بەردەستەکان، یان گەر شرۆڤەکاران بترسێن لە هەڵبڕینی دەنگیان. سێ ڕێگا هەیە بۆ بەرپرسیارێتی. گەر مەبەست فشار خستنە سەر حکومەت بێت تا کار بکات لە بەرژەوەندی خەڵک، ئەوا ڕۆڵی میدیا و ڕێکخراوەکان زۆر گرینگە. گەر مەبەستیش بەرپرسیارێتی حکومەت بێت بۆ تاک، ئەوا ڕێگاکان بۆ نارەزایی تاک دەبێ دامەزرێت. لە هەموو ئەو سێ حاڵەتانەدا، میدیا و گروپ و تاک، گرفتێک هەیە ئەویش ترسە. گەر بەرپرسە حکومییەکان یان هاوپەیمانە نافەرمییەکان هەڕەشە لەوانە بکەن کە قسە دەکەن و بیان تۆقێنن، ئەوا پێکهاتە



فەرمییەکانی بەرپرسیارێتی بێ مانا دەبن.

میدیا دەتوانێت ڕێگە بۆ گفتوگۆی کراوە خۆش بکات گەر ئەهلی بێت و ئازاد بێت لە ڕەخنە گرتن لە حکومەت بە بێ ترسی تۆڵە لێ کردنەوە. هەتا سەرکردە نادیموکراسیەکانیش هەستیارن بەرابەر ڕای گشتی گەر بیانەوێت تەنگ و چەڵەمەی مەدەنی نەهێڵن. بۆیە ڕۆژنامەوانی ئازاد سەرچاوەیەکی گرینگی لێپێچینەوەیە، بە تایبەتی لە وڵاتە نادیموکراسیەکان کە ئالیەتی تری نییە بۆ زاڵ بوون بە سەر بەرپرسە سیاسییەکان و بیرۆکراتەکان. هەروەها گەر هەڵبژاردنەکان گرینگ بن، میدیاش دەورێکی کاریگەر و گرینگی هەیە.

ئازادی ڕۆژنامەوانی تەنها بە ناو هیچ کارییگەریەکی نییە گەر میدیا بەند بێت بە حیزبێکی سیاسییەوە. لە ئیتاڵیا، گەندەڵی بوو بە هەواڵێکی گەورە کاتێ ڕۆژنامەوانی ئیتاڵی سەربەخۆتر بوو لە سیستەمی سیاسی. حکومەتیش دەتوانێت ڕۆژنامەوانی بەلا وەنێت لە ڕێگەی ڕێکلام و چاپکردنی گرێبەست و پارەدان بە ڕۆژنامەنووسان. بۆ نموونە، ڕۆژنامەکانی مەکسیک لە ڕێگەی ئەو میتۆدانەوە کۆنترۆڵ کراون. فۆرمێکی تری کۆنترۆڵ زاڵ بوونە بە سەر نەدانی باج لە لایەن نووسەران و کۆمپانیاکانی میدیایە، خۆیان لە ئەگەری داوا تۆمارکردن وەک هەڕەشە دەپارێزن.

لە گەلێ وڵاتدا، یاساکانی ناوزڕاندن پاراستنی تایبەتی دەبەخشن بە بەرپرسە حکومییەکان. ئەمە تەنها پێچەوانەی ئەو شتەیە کە پێویستە. بەرپرسە سیاسییەکان و کەسایەتییە ناودارەکانی تر دەبێ زەحمەتر ناویان بزڕێت لە چاو هاوڵاتی ئاسایی نەک ئاسانتر. نابێ حەسانەی تەواویان هەبێت و بە کەیفی خۆیان تێدا بسوڕێنەوە و گەندەڵی بکەن و کەسیش یاخەیان نەگرێت، نەوەک ناویان بزڕێت! لەمەدا ویلایەتە یەکگرتووەکاندا باشترین نموونەیە لە یاسایەکدا ناوزڕاندنی بەرپرسی گەورە زەحمەتر دەکات لەوەی تاکی تایبەت و ناوزڕاندنیش بە هێرشێکی مەدەنی وەسف دەکات نەک تاوانکاری. ئەوانەی لە بەرچاوی خەڵکن مەترسی ئاسایشی گشتیان ڕەچاو کردووە و ڕێگەیان هەیە بۆ میدیا و تۆمەتبار کردن. بە هەمان شێوە، بەشداربووان لە مشتومڕی ئەڵمانیا هەندێ پاراستن لە یاسای ناوزڕاندنا لا دەبەن،

هەروەها لە هۆڵەنداش بەرگری گشتی هەیە بۆ بەرپرسان نەوەک لە ڕێگەی سیاسەتەوە ئەو کەسە دەست گیر بکرێت و بێ سەر و شوێن بکرێت تەنها لە بەر ئەوەی ناوی بەرپرسێکی زڕاندووە. هەڕەشەی داوا تۆمارکردن زۆر گرینگە و تا ڕادەیەکیش بەرپرسانیش لێی دەترسن. بەریتانیا بەرگری کەسی گشتی نییە. هەندێ دەڵێن کە یاسی ناوزڕاندنی ناهێلێت هیچ زانیاریەک بە بەرژەوەندی گشتی بگات گەر ڕاپۆرتێک بنووسرێت لە سەر بەرپرسێک. باشترین نموونە لە سەر کاریگەری بەهێزی یاسای ناوزڕاندن لە سەنغافورایە کە بەرپرسە سیاسییە گەورەکان زۆر چالاک بوون لە دۆزینەوەی میدیا و ڕکابەرە سیاسییەکانیان. لە ئوردن، لە ساڵی ١٩٩٨ یاسا بڵاوکردنەوەی هەواڵ وەک هەڕەشە بۆ شا و خێزانی شا قەدەغە دەکات. لە ئەمریکای لاتین، ناوزڕاندن زۆرجار وەک تاوانێک داوای لە دژی تۆمار دەکرێت نەک وەک کارێکی مەدەنی.

بەڵام لە وڵاتە هەژارەکاندا لەگەڵ ڕێژەی بەرزی نەخوێندەواری میدیا ڕۆڵێکی زۆر کەم و سنوورداری هەیە. زۆر خەڵک ئاستی ڕۆشنبیری زۆر کەم و کەم لە چالاکییەکانی حکومەت دەگات. ئەمە دوو باڵی هەیە بۆ چاکخوازان. یەکەم، حکومەت یان ڕێکخراوە تایبەتە سەربەخۆکان ڕەنگە بەرنامەی ڕۆشنبیری دابین بکەن بۆ یارمەتیدانی خەڵک تا لەوە بگەن کە چی لە حکومەتێکی شەرعی چاوەڕێ بکەن. هەندێ ئاستی نزمی بەرتیل سەرهەڵدەدات چونکە خەڵک وا دەزانێت کە دەبێ دیاریەک ببەخشێت تاوەکو بەرپرسەکە کارێکی بۆ بکات، یاخود بڕیارێک بدات. ڕەنگە هاوڵاتی بێ ئاگا بێت لەوەی کە قەرداری بەرپرسە حکومیەکان نین، بەڵکو هەمیشە بەرپرسی حکومی قەرداری هاوڵاتیانن.

دووەم، حکومەت پێوستی بە ئالیەتێکە بۆ ناساندنی خەمەکانی هەژار و گروپی پەراوێزخراو بە بێ ئەوەی بیانکاتە بابەتی سزادان لە بەرئەوەی کە قسە دەکەن. میدیای ئازاد ئا لێرەدا یارمەتی دەدات گەر چاودێری یان ڕووپێوی ڕای گشتی بڵاو بکاتەوە. هەتا گەر میدیا ڕۆڵێکی سنوورداری هەبێت لە هۆشیار کردنەوەی هاوڵاتیان دەربارەی ئەوەی حکومەت چی دەکات، دەشتوانێت بە حکومەت بڵێت کە خەڵکی بیر لە چی دەکەنەوە و خەڵی ئاسایی تووشی چ گرفتێک دەبنەوە کاتێ مامەڵە لەگەڵ بیرۆکراسەکان دەکەن.



## کۆمەڵە تایبەتەکان و ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان وەک بریکاری گۆڕان

تەنها کار و لێپێچینەوە نییە وا دەکات میدیای ئازاد بە ئاسانی زانیاری لە سەر کارەکانی حکومەت دەست کەوێت، بە تایبەتی لە وڵاتێکی ئۆتۆکراتیدا. میدیا دەتوانێت جەخت بکاتەوە لە سەر کارەساتێکی نادیار و ڕەنگە هیچ بەرژەوەندی ڕاستەقینەی نەبێت لە چاکسازی کە لێشاوی ڕووداوە گەندەڵیەکان کەم دەکاتەوە. کۆمەڵ و تاک دەبێ فشار دروست بکەن بۆ گۆڕان. تاک تووشی هەمان گرفتی " بەلاش سواربوون" دەبێتەوە. ڕەنگە زانیاری بەردەست بێت، بەڵام ڕەنگە کەس پاڵنەری نەبێت سەیرێکی بکات. ئەو کارەساتانەی ئاشکرا بوون بەهۆی لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسانەوە ڕەنگە ببێتە هۆی تووڕەیی، نەک کردار.

ئەو یاسایانەی کە دامەزراندنی کۆمەڵە تایبەتەکان و ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان ئاسان دەکەن ڕەنگە یارمەتی بدات. ئەمەش ڕێگە خۆش دەکات بۆ دروستکردنی گروپی چاودێری وەک شەفافیەتی نێودەوڵەتی، کە ڕێکخراوێکی قازانج نەویستی نێودەوڵەتییە جەخت دەکاتەوە لە سەر کەمکردنەوەی گەندەڵی لە نزیکەی پەنجا وڵاتدا. ئەو ڕێکخراوە مەحەلیانە زنجیرەیەک چالاکی ئەنجام دەدەن، لەوانەش زنجیرەیەک وێرکشۆپ ڕێک دەخرێن بە هاوکاری " ئەنیستیتۆی گەشەپێدانی ئابووری" سەر بە بانکی جیهانی و هەندێ لە ئاژانسە دوانەییەکان. وێرکشۆپ ئەنجامدراوە لە تانزانیا و ئۆگەندا و مالاوی و ئوردن. خەڵکی لە کەرتی حکومی و تایبەتی داوەت دەکەن و پێکەوەیان کۆدەکەنەوە بۆ گفتوگۆ کردن لە سەر چارەسەر کردنی گەندەڵی. هەندێ لە وێرکشۆپەکان ئەنجامی زۆر باشیان لێ کەوتۆتەوە وەک ئەوەی هەندێ لە بەشداربووان (بەرپرسی حکومی) بەڵێنیان داوە دەست هەڵگرن لە گەندەڵی. کۆبوونەوەیەک لە تانزانیا لە ساڵی ١٩٩٥ بەڵێنی لێ کەوتەوە لە بەرپرسە حکومیە بەرزەکان بۆ ئاشکرا کردنی موڵکی خۆیان و خێزانەکانیان و ئەمەش بووە هۆی دامەزراندنی کۆمیسیۆنێکی سەرۆکایەتی دژی گەندەڵی.

هەندێ حکومەت، نیگەران بوون لەوەی کە ڕێکخراوە ناحکومیەکان بەکاردەهێنرێن بۆ چاودێری کردنی مەبەستەکان، هەڵسان بە سنووردار کردنی ئەو ڕێکخراوانە یان

دامەزراندنی زۆر بە کولفە و زەحمەت کرد. بۆ نموونە، شەفافیەتی نێودەوڵەتی بەوەی زانی کە دانانی بەشی مەدەنی لە ولاتە پێشکەوتووەکان زەحمەت دەبێت گەر خەڵکی مەحەلی بە پەرۆش بن بۆ ڕێکخستنی ئەویەشە. لە هەندێ ولاتدا چەندین ساڵ تێپەڕی بە سەر ئەمە بە بێ ئەوەی یەک ئەنجام بە دەست بێت. هەموو ئەو شتانەی کە دەنووسرێن لە سەر کاغەز لە بەرژەوەندی ئەو ڕێکخراوانە هیچ مانایەکی نییە لە گەلێ ولاتدا چونکە دەوڵەت توانای سەپاندنی نییە. هەندێ جار ئیفلیجی دەوڵەت دەبێتە سەرچاوەیەک بۆ ئازادی. کێشەیەکی تر کەسب کردنە. هەندێ لە ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان چەند بەرنامەیەک لە پێناو خزمەتکردنی هەژاران دەخەنە کار. ڕەنگە پاڵپشتی داراییان لە لایەن دەوڵەتەوە یان ئەو فەندە هاوکاریانەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە بەڕێوە دەچێت، دابین بکرێت. بۆیە وجوودیان دەوەستێتە سەر جۆری هاریکاری لەگەڵ دەسەلاتە حکومیەکاندا. لە ئەنجامدا، ڕەنگە ئامادە نەبن بە کراوەیی ڕەخنە لە بەرپرسان بگرن. بۆ نەهێشتنی ئەو فشارەش، هەر ڕێکخراوێکی ناحکومی کە کار لە دژی گەندەڵی دەکات نابێ بەشداری بکات لە دابین کردنی خزمەتەکان. لە ئاسیا و ئەفریقیای باشووردا زۆرێک لەو ڕێکخراوە قازانج نەویستانەی کە خزمەت پێشکەش دەکەن بە هەژاران هەمووی سەرچاوەی پارەیان یان بەشێکی لە لایەن حکومەتەوەیە. بە پێچەوانەوە، ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان لە ئەمریکای لاتیندا هەندێ جار پەیوەندیان لەگەڵ حکومەت پەیوەندیەکی دوژمنانەیە. بۆیە لە دوو ناوچەی یەکەمدا، گروپەکانی دژە گەندەڵی پێویستە سەر لە نوێ دروست بکرێنەوە جیا لە ڕێکخراوەکان، هەروەها لە ئەمریکای لاتیندا گروپە هەنووکەییەکان ڕەنگە گونجاو تر بن پێوست بە ڕێکخراوی نوێ ناکات.

ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان دەتوانن بە سەرکەوتوویی ڕووپێو لە سەر ڕای گشتی ئەنجام بدەن و بلاوبکەنەوە کە بیروبۆچوونی گشتی بەرامبەر بە خزمەتەکانی حکومەت ئاشکرا بکەن. شاکاری ئەم جۆرە ڕووپێوانە لە لایەن " سەنتەری کاروباری گشتی" لە بەنگەلۆر، لە هیندستان ئەنجامدرا. یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی لە سەر پێشکەش کردنی خزمەت بوو بە گەڕەکە شەعبی و هەژارەکان لە پێنج شاردا. هەرچەندە گەندەڵی لە تەواوی شارەکاندا پەرت و بلاو ببۆوە، کەچی لە هەموو



شوێنەکانی تریش هەر هەبوو. لە هەر شارێک، چەند گەندەڵی زۆر بێت ئەوەندە توانای یاخود ئامادەیی ئاژانسەکانی خزمەتگوزاری گشتی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان کەمتر دەبێت. ئینیستیتۆی گەشەپێدانی ئابووریش سەرپەرشتی چەندین ڕووپێوی کردووە کە شێوازی بەسوود پێشکەش دەکەن. ئەو جۆرە ڕووپێوانە ڕێگایەکن بۆ پەراوێز خستنی کاریگەری گەندەڵی لە سەر ئەو هەژارانەی کە دەرفەتیان زۆر کەمە بۆ ناڕەزایی تۆمار کردن دژی گەندەڵی.

لە ولاتێک کە سیستەمێکی قەزائی سەربەخۆ و ڕاستگۆی هەبێت، ئەگەرێکی تر سەر هەڵدەدات بۆ کۆنترۆڵی ناڕاستەوخۆی گەندەڵی. دەتوانرێت ماف ببەخشرێت بە تاک و گروپەکان سکالا بکەن لە سەر باج بۆ ئەوەی یاساکان بە ناچاری بسەپێنرێن. مەبەستی ئەو جۆرە سکالایانەش بۆ ئاشکرا کردنی بەرتیل نییە بەڵکو بۆ بە دەستهێنانی پابەندبوونی یاساکانی پەیوەست بەو بوارەیە. هیچ بەڵگەیەک لە سەر گەندەڵی ناخرێتە بەر دەست. لە بری بەڵگە، جەخت لە سەر پێشێل کردنی یاسای باج و نیزامەکان دەکرێتەوە.

لە هیندستان، هاولاتییان زۆر ناڕەحەتن بە کارە نایاسایی یاخود داپلۆسێنەرەکانی حکومەت، بۆیە هاولاتی دەتوانێت کاری بەرژەوەندی گشتی بهێنێت بۆ پشتگیری مافەکانی خەڵک. داواکارە گشتییەکان پێویستییان بەوە نییە دەستەیەکی سوێندخۆران نیشان بدەن. دادگای بالای هیندستان پاڵپشتی فراوان بوونی مافی هاولاتیان دەکات، باسی ئەوە دەکات کە " هەر هاولاتییەک باوەڕی بە حوکمی یاسا هەبێت ئەوا خزمەتی یاسایی و کۆمەلایەتی دەگەڕێننەوە بە هۆی سروشتی ناخیانەوە". کاری هاولاتیان ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە پاڵنان بە دادگا بۆ ناچار کردنی حکومەت لێپێچینەوە لە بەرپرسە گەورە گەندەڵەکان بکات.

بە پێچەوانەوە، سیستەمە یاساییەکانی تر هیچ دەرفەتێک نابەخشن بە تاک بۆ سکالا کردن بۆ پاراستنی بەها گشتییەکان. دەبێ ئەوە بخەنە ڕوو کە مافەکانیان یاخود بەرژەوەندیەکانیان بەڕاستی بریندار بووە، تەنها دواتر دەتوانن لە بەردەم دادگا بوەستن. بێگومان، هەندێ جار تاکێک دەتوانێت ئامانجەکانی بەرژەوەندی گشتی زۆرتر بکات لە پرۆسەی یاساو هێنانەوە بۆ مافەکانی خۆی، بەلام

سەرنەکەوتنی ئیداری لە پشتەوەی دادگان لەم جۆرە سیستەمانە. پرۆسەی چاوپیاخشانەوەی قەزائی ژاپۆنی و ئەڵمانی ئەم خاڵە لاوازەیان هەیە. یەکێک لە لێدوانچیەکان لە سەر یاسای ژاپۆنی دەڵێت " چەند چالاکییەکی ئیداری دەتوانن زیانێکی زۆر بە خەڵک بگەیەنن هەروەها لە ماوەیەکی درێژتریشدا کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت لە سەر تاک، بە بێ ئەوەی ببێتە هۆی زامێکی تایبەتی و کەسی و قزائی دەستبەجێ بۆ هیچ کەسێک. هەندێ جۆری گەندەڵی کە زیانەکان زۆر دەکات و کاریگەری حکومەت کەم دەکاتەوە لەو جۆرەن.

لە دەرەوەی ویلایەتە یەککگرتووەکاندا، هەمیشە لایەنی دۆڕاو لە سکالا کرێی هەردوو لا دەدات. بەڵام ئەمریکا داهێنانی لەمەدا کرد و کرێیەکەی کردە یەک لایەنە: ئەو داواکارە گشتییانەی کە سکالای هاولاتیان دژی حکومەت یان بەرپرسە دزەکان دەهێنن بە کرێیە یاساییەکەیان قەرەبوو دەکرێنەوە گەر ببنەوە بەڵام داوایان لێ ناکرێت پارەی لایەنی بەرابەریش بدەن گەر بدۆڕێنن. ئەمە داهێنانێکی بەهادارە کە دەکرێ لە یاسای دژە گەندەڵیشدا بەکار بهێنرێت. قەزیە سەپێنراوەکان سوودی ڕوونی دەرەوەیان هەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە دەسکەوتیان هەیە لە حکومەتە ڕاستگۆکانەوە. هەرچەندە لایەنەکانی بەرامبەری سکالای هاولاتیان نیگەرانن لەو دەرفەتانەی کە بۆ سکالای بێ سوود دروست دەبن، کرێی یەک لایەنە وەلامێکی گونجاوە. پاڵنەرێک دەدات بە گروپی بەرژەوەندی گشتی بۆ جەخت کردنە سەر قەزیە گرینگەکان و شایەنەکان. سوودی زیاترە لە کۆمپانیای زەبەلاح کە دەسکەوت وەردەگرێت لە بەرتیلدان بۆ دانی زۆربەی نرخی سەپاندنی یاسا دژی ئەوان.

هەر وڵاتێک کە حکومەتی سست و دادگای بێهێزی هەبێت، هەوڵەکانی چاکسازی ڕوو لە کاڵبوونەوە دەکات. گەر گروپێک ئاگادار بێت کە حکومەت بە باشی کارەکانی خۆی ناکات، ئەوا دەتوانێت سەرنەکەوتنەکانی بکات بە دۆکیومێنت و نارەزایی دەربڕێت. کەناڵەکانی میدیاش نارەزایی گروپەکان دەخاتە ڕوو و دەبن بە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی مشتومڕی خەڵک. بەڵام ڕەنگە حکومەت هیچ بەرسڤێکی نەبێت. تەنانەت گەر حکومەت ڕەخنەگران ڕاستەوخۆ شەرمەزار نەکات، ڕەنگە دیوارێک بە ڕوویاندا دروست بکات تا گروپە نارەزاییەکان ماندوو دەبن لە وزە و سەرچاوەکانیان. لە وڵاتانی دیموکراسیدا، لایەنی ئۆپۆزیسیۆن دەتوانێت گەندەڵی لە سەر لایەنی بەرامبەری هەڵقۆزێتەوە. لە سیستەمێکی ئۆتۆکراسیدا، لێدوانە سیاسییەکان بێهێز دەبن. ڕێکخراوی دژە گەندەڵی زۆر کەم شتی پێ دەکرێت بە بێ هاوکاری سەرکردایەتی سیاسی ئەو وڵاتە. ئا لێرەدا، ڕەنگە گەندەڵی پرسێکی ئاسانتر بێت بۆ هاولاتیان بۆ چارەسەر کردن لە چاو گرفتە ئاڵۆزەکانی تر وەک چاکسازی لە زەوی و زار یان مافەکانی کرێکار. هەرچەندە هەندێ ئۆتۆکرات هەن بە حەسانەوە کار دەکەن، جودا نین لە ڕای گشتی ناوەکی و ڕەخنە لە جیهانی دەرەوە، ئەوانی تر ئاوا متمانەیان بە خۆیان نییە و دەسەڵاتدار نین. لەو حاڵەتانەدا، ڕەنگە چاکسازی ڕێی تێ بچێت لەگەڵ هاوکاری ڕێکخراوە ناحکومیەکان بۆ فشار خستنە سەر دەوڵەت بۆ گۆڕان و کار بکات لە پێناو هێنانە دی چاکسازی.

لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەوڵە جدیەکانی دژە گەندەڵی پێویستی بە پەیوەندیەکی تۆکمەیە لە نێوان خەڵکی ئاسایی و دەوڵەتەوە. ڕەنگە هاولاتی لەوە بترسێت کە نارەزاییان شتەکان خراپتر بکات و ڕەنگدانەوەی خراپتری لە سەر کەسایەتی خۆیان هەبێت. بەڵام گەر خەڵک هەمووی یەک دەنگ و ڕا بوو ئەوا دەوڵەت و حکومەت و حیزبیش دەستەوسان دەوەستێت و هیچی بەرامبەریان پێ ناکرێت. بەڵام، هەندێ ئۆتۆکراتیش هەن بەوەیان زانیوە کە چاکسازی سوودێکی زۆری هەیە لە پێشخستنی گەشەی ئابووری و ژێرخانی وڵات. زاڵ بوون بە سەر ئالای چاکسازی، لە لایەن هەندێ سەرکردە وەک ئەوە وایە کە هیچی تر و هیچ کەسی تر ناتوانێت دەسەلاتیان لێ بسەنێتەوە و ڕەخنەگرانیش دەم کوت دەکەن.

## ئەنجام

دەکرێ گەندەڵی بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ بە هۆی سنووردار کردنی دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵ بکرێت. من ڕەچاوی دوو جۆرە سنوورم کردووە. یەکەمیان پێکهاتەکانی حکومەتە کە دەنگی ڤیتۆ و سەرچاوەی سەربەخۆی سیاسی دروست دەکەن. دووەمیان، ڕێگایەک بە خەڵک دەبەخشێت بۆ ناڕەزایی دەربڕین دەربارەی حکومەت و خزمەتکردنی هاوڵاتیان بە خراپی. حکومەت زانیاری لە سەر کارەکانی خۆی پێشکەش دەکات، کەناڵەکانی میدیا و خەڵکی گشتی دەتوانن دەنگ هەڵبڕن، هەروەها ڕێکخراوە تایبەتییەکان و تاکیش دەتوانن هانی بەرپرسیارێتی خەڵکی گشتی بدەن لە سەر حکومەت. جۆری یەکەمی سنوور زیاتر لەگەڵ پێکهاتەی حکومەتە دیموکراسییەکان دەگونجێت، بەڵام تەنانەت ئۆتۆکراتەکانیش هەندێ جار حەز دەکەن لە دەسەڵاتی خۆیان بپێچنەوە وەک ڕێگایەک بۆ دروستکردنی شەرعیەتێکی شەعبی. جۆری دووەمیان، کە کراوەیی زۆرتر دەکات، حکومەت ڕووبەڕووی ناڕەزایی خەڵک دەکاتەوە. بۆیە گەلێ لە ڕژێمەکان، تەنانەت ئەوانەی کە بە ناو دیموکراسین، ڕەنگە بە گومانەوە بڕواننە ئەو جۆرە سیاسەتە. لەگەڵ ئەوەشدا، لێپێچینەوە لەو ڕژێمانە لە سەر گەندەڵی زۆر پێویستە، هەروەها دەبێ ڕێگای تر بگرنە بەر بۆ بەخۆداچوونەوە چونکە گەر هەموو خەڵک دەنگی کردە یەک و بە یەکەوە ناڕەزایی دەربڕن بە هیچ شێوەیەک ئەو لێشاوە ناوەستێت.

# رۆڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی

گەندەڵی یەکێکە لە خەمە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. کۆتایی جەنگی سارد هاوسەنگی هێزەکانی گۆڕی و پێداویستییە سەرەکییەکانی نەهێشت بۆ هاوکاری کردنی ڕژێمە گەندەڵییەکان لە بەر هۆیەکانی ئاسایشی نەتەوەیی. گەندەڵی پەرش و بڵاو و کاریگەری تاوانی ڕێکخراو لە کەرتی پێشووی ڕۆژهەڵات وای لەو کێشەیە کرد کە هەرگیز پشت گوێ نەخرێت، هەروەک لە بەشەکانی تری جیهانیشدا کێشەی لەم جۆرە هەن. هەوڵی جیهانی بۆ تایبەت کردن و شێواندنی داواکارییەکان، بیرکردنەوەیەکی ترە بۆ پەیوەندی نێوان بازاڕ و دەوڵەت، هەروەها پێزانینێکە بە هەلی نوێی کاری گەندەڵی کە لە لایەن ئەو هەوڵانەوە دروست کراون بۆ بەهێز کردنی ڕۆڵی بازاڕی تایبەت.

هەندێ لە چاودێران پرسیار دەکەن لەو خەمە نوێیەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان. وەک کێشەیەکی سیاسی مەحەلی سەیری گەندەڵی دەکەن کە دەبێ وڵات خۆی بە تەنیا چارەسەری بکات. بە پێی بۆچوونی ئەو ڕەخنەگرانە، هەوڵەکانی چاکسازی لە دەرەوە مانای ئەوەیە کە چەند هەوڵێکی پەسەند نەکراون بۆ سەپاندنی " بەها ڕۆژئاواییەکان". بەڵام گەلێ لە پسپۆران لە وڵاتانی پێشکەوتوودا مشتومڕی ئەوە دەکەن کە ئەم جۆرە ڕەخنەیە بە پەرتەوازە بوونی پیادە مەحەلیەکانەوە بەندە. ئەو پسپۆرانە ڕوونی دەکەنەوە کە داب و نەریتی "دیاری بەخشین" مانای ئەوە نییە کە گەندەڵی بە شێوەیەکی بەرفراوان پەسەند و پیادە بکرێت. ڕووپێوەکان و دەربڕینی تووڕەیی هاوڵاتیان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە لێبوردنی گەندەڵی وەها گشتی و بەربڵاو نییە، واتە کەم شوێن هەیە لە گەندەڵی ببوورێت و چاوپۆشی لێ بکات.

هەندێ وڵاتی پێشکەوتوو بەرگەی ئەو هەوڵانە دەگرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی چونکە پێیان وایە کە بەرتیل لە وڵاتانی پێشکەوتوودا سوود بە بازرگانی ناوخۆیان دەگەیەنێت. ڕۆژئاواییەکان بە هیچ شێوەیەک ئەوە پەسەند ناکەن پێیان بووترێت لە نێو کەلتووری ئێوە گەندەڵی دیاردەیەکی پەسەندکراوە. سەرەڕای ئەوەش، بەڵگەی



ئۆپۆزیسیۆنی گشتی بۆ گەندەڵی لە وڵاتە کەم دەرامەتەکان کاریگەری هەیە لە سەر بۆچوونی وڵاتانی پێشکەوتوو. گەندەڵی دەبێتە شتێکی ڕۆتین و باو بە بێ ئەوەی پەسەند بکرێت لە لایەن ئەو دانیشتوانەی کە بەرگەی باجەکانی دەگرێت.

لە سەرێکی ترەوە ئەو ڕەخنەیە لەبارەی تەکنیکیشە. هەندێ مشتومڕی ئەوە دەکەن کە کۆنترۆڵی گەندەڵی نابێ ببەسترێتەوە بە بازرگانی و سیاسەتی نێودەوڵەتییەوە. هەروەک مشتومڕەکانیان لە سەر مافەکانی مرۆڤ و پێوەرەکانی کرێکار، باس لەوەش دەکەن کە کەسایەتییە نێودەوڵەتییەکان نابێ سیاسەتی بازرگانی و هاوکاری گەشەپێدان ببەستنەوە بە پرسە نائابوورییەکان. بەڵام گەندەڵی پرسێکی ئابوورییە. گەندەڵی کاریگەری هەیە لە سەر پێشبڕکێیەکانی ئابووری جیهانی و پڕۆژە جیهانییەکانی گەشەپێدان و وەگەڕخستن. وێڕای ئەمەش، هێزی بەرزکردنەوەی ئابووری ڕەنگە تاکە ڕێگایەکی کاریگەر بێت جەخت لە سەر چاکسازی بکاتەوە.

## پێنج ڕێگەی فراوان هەیە بۆ دەستتێخستنە نێودەوڵەتییەکان:

* کاتێ فەندەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەوەستن، جا چ بە قەرز یان بەخشین بێت، ئەو ڕێکخراوانە بەرژەوەندیەکیان هەیە لە بەکارهێنانی سەرچاوەکانیان بە شێوەیەکی کاریگەر.
* گەر وڵاتان بە نیازی چاکسازی بن، ئەوا ڕەنگە ئاژانسەکانی هاوکاری کردن یارمەتی هەوڵەکانی دژە گەندەڵی بدەن وەک چاکسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان و بودجە و بەڕێوەبردنی سیستەمە داراییەکان. گەر قەیرانە دارایی و ئابوورییەکان زیاتر بکرێن بەهۆی پێکهاتەی دامەزراوەیی گەندەڵی، ئەوا هاوکاری نێودەوڵەتی بە مەرج دەبێت لەسەر چاکسازی هەتا گەر حکومەت بە پەرۆشی گۆڕانیش نەبێت.
* هەوڵە نێودەوڵەتییەکان ڕەنگە جەخت بکەنەوە لە سەر کەمکردنەوەی بەرتیلدان لە لایەن بازرگانەکانی وڵاتە فرە نەتەوەکان و جەخت دەکاتەوە لە سەر لیست کردنیان لە نێو هەوڵەکانی چاکسازیدا. لە هەندێ وڵاتی پێشکەوتوودا، وەگەڕخەرە فرە نەتەوەکان زیاترن و بەهێزترن لەو دەوڵەتانەی کە کاریان لەگەڵ

دەکەن، هەروەها تەنانەت گەر واش نەبێت، فەرمنەتەوەکان زۆرجار هێزێکی بەرچاویان هەیە بۆ بەرزبوونەوە لەگەڵ حکومەت.

* بەرنامە نێودەوڵەتییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی لێشاوی فەندە شاراوەکان دەتوانن لە گەندەڵی بپێچنەوە بەهۆی بەربەستی گواستنەوەی نهێنی فەندەکان بۆ شوێنێک لە دەرەوە کە کەس نەتوانێت شوێن پێیان بکەوێت. جۆرەکانی تری هاوکاری کردن لە کۆنترۆڵی چالاکییە نێودەوڵەتییەکانیش لەمەڕ تاوان دەتوانێت ڕۆڵێک بگێڕێت لە کەمکردنەوەی گەندەڵی.
* کەمکردنەوەی گەندەڵی ڕەنگە پێویستی بە دامەزراوەی نێودەوڵەتی بێت. ژمارەیەک چاکسازی پێویستی بە هاوکاری هەیە لە نێوان سنوورەکان گەر بیانەوێ بە چاکی کار بکەن. ئەمەش ڕەنگە پێویستی بە دەستەی نوێ بێت بۆ پێداچوونەوە و بەدواداچوون.

کۆنترۆڵی گەندەڵی ئێستا خەمێکی هەنووکەیی نێودەوڵەتییە، بەڵام ڕەنگە ئەمە تەنها زیادەڕۆیییەکی کاتی بێت. کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە خاڵێکدایە کە قسەکان دەبێ بکرێن بە کار نەک هەر زیاد وتن بن. ژمارەیەک شت هەن دەبێ قەدەغە بکرێن و زۆرێکی نوێش هەن دەبێ ئەنجام بدرێن. یەکێک لە مەترسییەکان ئەوەیە کە فۆرمە نوێیەکانی گەندەڵی و گەڕان بە دوای دەسکەوتدا ڕەنگە لە ئەنجامی چاکسازی بۆ باشتر کردنی کاری ئابوورییەوە سەرهەڵبدەن یان لە ئەنحامی دیموکراتیزەکردنی سیاسەتەکانەوە سەرهەڵبدەن. چاکخوازان دەبێ وێڵ بن بە دوای کۆنترۆڵکردنی ئەو فۆرمە نوێیانەی ژیانی ئابووری لە لایەن جیلی دووەمەوە. هەروەها دەبێ هەشیار بن لە لێکۆڵینەوەی نێو ناخی سیستەمی گەندەڵی. دامەزراندنی دەزگای ڕاستگۆ ڕەنگە هەنگاوێکی بەرایی باش بێت، بەڵام بەهای سنوورداریان دەبێت بە بێ ئەوەی چاکسازی ڕیشەیی زیاتر ئەنجام بدەن.



## گەندەڵی لە پڕۆژەکانی گەشەپێداندا

نموونەیەکی سادە کاریگەری ئەو وێرانکارییەی گەندەڵی نیشان دەدات لە سەر شایستەیی پڕۆژەکانی گشەپێداندا. با وا دابنێین، لە سەدا ٢٠ ی فەندی هاوکاری بەهۆی گەندەڵییەوە دەچێت لە ئاو! ئەو لە سەدا بیستە مانای بەرتیلی هەر تاکێک نییە، بەڵکو زیانەکانی گرێبەست و لەدەستدانی ئامێر و ئەو بەرهەمانەی کە لە سەرەنجامی چاوپۆشینی بەرتیلەوە سەرچاوەی گرتووە. لە سەر ئەم سیناریۆیەدا، گەر کارەکان لە سەر سیستەمێکی ڕاستگۆوە بەڕێوە بچن ئەوا پڕۆژەیەکی ١٠٠ ملیۆن دۆلاری تەنها ٨٠ ملیۆن دۆلاری تێدەچێت، ٢٠ ملیۆن دۆلار دەگەڕێتەوە. با زیاتر قووڵ بینەوە، پرۆسەی وەگەڕخستنەکە دەبێ لە داهاتوو ، لە بەرابەری ئەو کارەدا سەدا ١٠ قازانج بکات لە ماوەی یەک ساڵدا. دواتر، پڕۆژەیەکی ڕاستگۆیانە و بە بێ فڕوفێڵ و پارە دزین قازانجی خۆی دەکات بە بودجەی ٨٨ ملیۆن دۆلار لەبری ئەوەی ١١٠ ملیۆن دۆلار بنووسێت، واتە لێرەش ٢٢ ملیۆن دۆلار دەگەڕێتەوە. ئەو پڕۆژەیەی کە ٨٠ ملیۆن دۆلاری تێدەچێت، دەستمایەکەی ١١٠ ملیۆن دۆلارە کەواتە ٣٠ ملیۆن دۆلار لە سەرووی قازانجی ئاسایی دەبێت. ئەمەش ڕێژەیەکی ئێجگار زۆرە. تەنانەت لە وڵاتانی پێشکەوتووشدا، هەموو پڕۆژەکان ئەو دەستمایە زۆرەیان نییە. بە کورتی، گەندەڵی بە شێوەیەکی بەرچاو دەتوانێت ژمارەی ئەو پڕۆژانەی کە بە باشی کار دەکەن کەم کاتەوە بە هۆی پارە دزینەوە. بەلانی کەم پڕۆژەکە سەقەت دەکات. لەمەش خراپتر ئەوەیە، گەر دەرفەتی گەندەڵی زۆر بێت لە نێو زۆربەی پڕۆژەکاندا ئەوا بەرپرسە گەندەڵەکانی ئەو وڵاتە بەدوای دەرفەتی مەزنتر دەگەڕێن بۆ دەسکەوتی تایبەتی خۆیان، واتە بەوەندەش هەر تێر نابن و چاویان لە دەڕبی گەورەترە! ئا ئەو کاتە ئاژانسێکی هاوکاری کردن هەڵدەسێت بە هاوکاری کردنی چەند کۆمپانیایەک کە هەمووی هەڵەن، واتە هەمووی پارەخواردنی تیایە.

یەکێک لەو مەسەلانەی بەم دواییییە لە نێو بازنەی گەشەپێداندا پەیدابووە "خاوەندارێتییە". هیچ پڕۆژەیەک سەرکەوتوو نابێت گەر وەرگر هەست بەوە نەکات کە بووەتە خاوەنی پڕۆژەکە یان بەشێکی تێدا هەیە. بەداخەوە، تاکە فۆرمێکی

خاوەندارێتی کە هەبێت، ئەویش زۆر گشتیە. کەسایەتییە سیاسییەکان لە نێو وڵاتە قەرز وەرگرەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان لە نێو وڵاتانی قەرز دەر هەوڵی ئەوە دەدەن لە هەر گرێبەستێکدا سوودی تایبەتی خۆیان مسۆگەر بکەن و سوودێکیش بۆ سیاسەتمەدارانی تر و ئینجا بۆ کۆمپانیاکەش. هەمیشە ئەو جۆرە بەرپرسانە دژی ئەو جۆرە پڕۆژانە دەوەستنەوە کە سوودی هەبێت بۆ چەند لایەنێک و پێشبڕکێی تیادا هەبێت. خاوەندارێتی خەمێکی گەورەیە لەو وڵاتانەی کە سەرکردەکانیان ئاسوودەیی کۆمەڵایەتیان لە لا گرینگ نییە و هیچ ئاوڕێکیشی لێ نادەنەوە. پڕۆژە هاوکارییەکان نابێ هاوکاری بکرێن تەنها بۆ زۆرکردنی بەهای کورتخایەنی کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت.

وڵاتانی وەک زایر و پارەگوای و هایتی کە لە پێشتر باس کراون نابێ یارمەتی بدرێن بۆ ئەوەی ببن بە کەڵەگا بە سەر دانیشتوانەکانیان و هەڵیانبقۆزنەوە بۆ بەرژەوەندی و گیرفانی چەند کەسێک. بانکی جیهانی نابێ یارمەتی ئۆتۆکراتەکان بدات لە کۆکردنەوەی باج بە شێوەیەکی کاریگەرتر، هەروەک پێشتر ئەو هەوڵەی دا لە وڵاتی زایر چونکە ئەو باجەی کۆکرایەوە چووە نێو گیرفانی چەند کەسێک. ویلایەتە یەکگرتووەکان نابێ مەشقی سەربازی دابین بکات بۆ ئەو سوپایانەی کە ڕێکخراو و ڕکابەری خۆیانی تیادا بەکار دێنن بۆ دەوڵەمەندکردنی گیرفانی خۆیان، وەک ئەوەی لە هایتی ڕووی دا.

ڕێکخراوە هاوکاری و قەرز بەخشەکان دەبێ زۆر هەشیار بن لەوەی کە وەک سەرپۆشێک بەکاردەهێنرێن بۆ دابەشکردنی پارە لە ڕێگەی واستە و گەندەڵی و بەرتیلەوە. بۆ نموونە، لە فلیپین، لە ژێر سەرۆکایەتی فێردیناند مارکۆسدا، تەکنۆکراتەکانی نێو حکومەت کاریان کرد لەگەڵ IMF و بانکی جیهانی و لە پاڵ ئەواندا هاوکاری و قەرزبەخشین بە لێشاو بە فیڕۆ دەچوو. بەڵام، ئابووریناسێکی فلیپینی ڕایگەیاند " تەکنۆکراتەکان وتارێکی گشتیان بڵاو کردەوە گوایە قەرز بۆ نێو وڵات وەستاوە، بەڵام دواتر ڕژێمەکە ڕێگەی دا بە چەندین حاڵەتی شاز بۆ قەرز وەرگرتن ئیتر ئەمە بووە هۆی گاڵتە پێکردن بە ڕۆح و پەیامی پلانەکان." پاوڵ هەچکرۆفت دەڵ" ملرکۆس چاکسازی بەخۆوە بینی بەڵام تا سەر بەردەوام نەبوو. "



هەچکرۆفت کاری ئەلاقۆیسەن و نارێک و پێک و دوور لە مەنتق بە بەڵگە دەهێنێتەوە لە سەر ئەوەی کە مارکۆس سەرکەوتوو نەبوو لە بەدەستهێنانی چاکسازیەکی درێژخایەن و بەردەوام.

هەتا بەم دواییانەش، بانکی جیهانی جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە هەموو وزەکانی شرۆڤە کردنی بەکار بێنێت لە قۆناغی پەسەند کردنی پڕۆژەیەک. هەرچەندە ئەو بانکە داوای شەفافیەتی کرد لە پرۆسەی کڕینی کەرستەکان، کەچی وا بە چڕوپڕی بە تەنگ ئەو داوایەوە نەهاتن. ڕێبەرەکانی پرۆسەی کڕینی کەرستە بە نیازی دڵنیا کردنەوەی هەندێ ئاستی پێشبڕکێکاری بوو لە مەزاتەکە لە سەر زۆربەی گرێبەستە گەورەکان، بەڵام نیگەرانیش لەبارەی گەندەڵیەوە شتێکی شاراوە بوو. هەرچەندە، لە ساڵی ١٩٩٦ دا بانکی جیهانی چاوی بە مەرجەکانیدا خشاندەوە و ئەو خاڵەی تیا زیاد کرد گەر لە هەر کارێکدا گەندەڵی و ساختەیی و کارخراپی بەدی بکرێت ئەوا گرێبەستەکە بە تەواوی هەڵدەوەشێتەوە. بەشی ٦,٠٣ لە مەرجەکان باسی ئەوە دەکات کە گرێبەستی قەرز وەرگرتن هەڵدەوەشێتەوە گەر قەرز وەرگر یان سوومەند لەو قەرزە کاری گەندەڵی و ساختەیی تیادا ئەنجام بدات. بەڵام، وڵاتی قەرز وەرگر دەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات دژی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی قەرزەکە بە هێنانەوەی پاساوی قایلکەر بەوەی کە هەرچی حاڵەتێکی نالەبار هەیە چاکی بکاتەوە.

سەرەڕای ئەمانەش، بانکی جیهانی گەر دوای چەند ماوەیەک درک بەوە بکات کە قەرز وەرگر کاری گەندەڵی یان ساختەیی ئەنجامداوە ئەوا ئەو کاتەش گرێبەستی قەرزەکە هەڵدەوەشێتەوە. هەر کۆمپانیایەکی زەبەلاح کاری گەندەڵی و ساختەی لە سەر ئاشکرا بێت ئەوا هێمای پرسیاری لە سەر دادەنرێت و جارێکی تر بۆ هیچ گرێبەستێکی دیکە داوەت ناکرێت. یاسا نوێیەکان ڕێگە بە چاودێرانی بانک لە سەر بەڵێندەرەکان دەدات و داواش لە بەڵێندەران دەکات ئەوەیان لە بیر بێت کە پێش و پاش مەزاتیش پارەکە هەر دەگەڕێتەوە نێو بانک چونکە زۆر جار ئەو پارە وەرگرتنە ڕێگا خۆش دەکات بۆ بەرتیل و واستەکاری. گرینگی ئەو گۆڕانکارییانە دەوەستێتە سەر چۆنییەتی جێبەجێ کردنیان لە نێو مەیداندا، بەڵام هەنگاوێکی بەرایی باشیشن.

لە مانگی نۆی ساڵی ١٩٩٧ دا، مەرجەکانی پرۆسەی کڕین زیاتر هەموار کران بۆ ئەوەی ڕێگە بدەن بە قەرز وەرگرەکان تا داوا لە مەزاتکەرە بەهێزەکان بکەن بەڵێن بدەن کاری دوور لە گەندەڵی و ساختەیی بکەن. بانکیش ڕەزامەندی لە سەر ئەمە دەدات گەر بەشێکی فراوانتر بێت بۆ بەرنامەکانی دژە گەندەڵی و هەروەها گەر درێژ بکرێتەوە و بخرێتە نێو هەموو پرۆسەکانی کڕین لە لایەن حکومەت. ئەو بەڵێنەش دەبێ بەڵێنی جۆراوجۆر بێت لە نێو پرۆسە جۆر بەجۆرەکانی کڕین بە پێی یاساش دەبێ ڕێک بخرێت. کاتێ داوا لە مەزاتکەران دەکرێت کە دەبێ بەڵێن بدەن کاری گەندەڵی نەکەن، ئەگینا بە پێچەوانەوە سزا دەدرێن، ئەوا ئاسایی ژمارەی مەزاتکەران کەم دەبێتەوە، بەڵام نەهێشتنی کۆمپانیای گەندەڵ لە نێو مەزاتەکان دەبێ سروشتی پێشبڕکێ کاری پرۆسەکە بەهێزتر بکات نەک کەمی بکاتەوە. هەرچەندە ئەو جۆرە بەڵێنانەش بە شتی زیادەڕۆیی دەچن چونکە گەندەڵی لە هەر حاڵەتێکدا بێت کارێکی نایاساییە، ئەو بەڵێنانە سوودی ئەوەیان هەیە کە پرۆسەکە بەرز بکەنەوە لە نێو ئەو وڵاتانەی کە تا ئێستا تەنها لە نێو کتێباندا ڕێز لە یاسا دەگرن. شەفافیەتی نێودەوڵەتی (TI) ئەم جۆرە پیادەیەی پێشنیار کردووە، ئیکوادۆر و پانەما و پارێزگای مێندۆزا لە ئەرژەنتین ئەزموونی لەو پیادەیان هەیە، هەروەها چەند وڵاتێکی ئەفریقیش هەوڵی ئەوە دەدەن ئەو پیادەی بخەنە کار. (TI) نموونەیەکی دۆکیومێنتی چۆنییەتی مەزاتکردنی ئامادە کردووە بۆ کۆمپانیاکان و بە وردی باسی ئەوەی کردووە کە چۆن مەزاتکەران دەتوانن بەشدار بن لە پرۆسەکە. وەک بەشێک لە پرۆسەکە، (TI) پێشنیاری ئەوە دەکات کە وڵاتان دەبێ پابەندبوونی خۆیان دەربڕن بۆ سەپاندنی یاساکان.

گەر قەرز وەرگرەکان هیچ ئەزموونێکیان نەبێت لە سەر ئەوەی بەڵێن بدەن کاری گەندەڵی نەکەن، ئەوا پێویستییان بە ڕێگایەکە بۆ کار کردن و هەڵسەنگاندنی تۆمەتەکانی گەندەڵی لەو بەڵێندەرانەی کە مەزاتەکەیان لە دەست داوە. وڵاتانی قەرز وەرگر و هاوکارییە نێودەوڵەتییەکان و کۆمەڵگای قەرز بەخشین پێویستییان بە ڕێگایەکە بۆ بەکارهێنانی ئەو زانیارییانەی کە بەڵێندەران دابینی دەکەن بە بێ ئەوەی دەست بخەنە نێو لێکۆڵینەوەی هەموو مەزاتکەرێک. لەبەرئەوەی ئەوانەی



ڕووبەڕووی مەزات دەبنەوە خەرجی و کاتێکی زۆری دەوێت، وڵاتان دەبێ بڕیاری ئەوە بدەن چۆن هاوسەنگییەک دروست بکەن بۆ پرۆسەی فرۆشتن بە خێرایی دژی ئەو بەرنامەیەی کە دارێژراوە بۆ نەهێشتنی گەندەڵی لە مامەڵەکانی ئێستا و داهاتوودا. (TI) پێشنیاری ئەوە دەکات کە سیستەمی ناوبژیکردنی نێودەوڵەتی بەکار بهێنرێت، پرۆپۆزەلێک کە ببێتە بەشێک لە بیرکردنەوەیەکی گشتی بۆ پێویستی چاودێری نێودەوڵەتی و دامەزراوەکانی چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانەی لە خوارەوە باس دەکرێن.

بەڵێندان بۆ نەبوونی بەرتیل و گەندەڵی جێبەجێ دەکرێت لە لایەن وڵاتێک. پرۆپۆزەلێکی پەیوەست بەمەش دەبێ وا لە کارگەکان بکات قەناعەتیان بەوە بێت واز لەوە بهێنن لە ڕێگەی بەرتیلەوە گرێبەست بەدەست بێنن جا لە هەر کوێیەکی جیهان بێت. ئەو وڵاتانەی کە سەرکردە سیاسییەکانیان گەندەڵ و حەزیان لە بەرتیلە ئەوا دەردەکرێن لە نێو بازاڕ. ئەمەش پێشنیارێکی پڕ لە گیروگرفتە، بەڵام دەبێ لە سەر ئاستێکی نێودەوڵەتی کاری لە سەر بکرێت و جێبەجێ بکرێت. مەترسی هەرە گەورە لێرەدایە، ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانەی کە ڕازی دەبن بەوەی بەرتیل پەسەند نەکەن، لە هەمان کاتدا دەست دەکەن بە قۆرخکردنی بازاڕ. هەندێ جار بەرتیلی بێ شومار و بەربڵاو ئەوە نیشان دەدات کە کۆمپانیاکان بە شێوەیەکی دوژمنکارانە ململانێی یەکتر دەکەن، ئەم ململانێیشە لە ڕووی بەدەستهێنانی نرخێکی کەم یان باشترین بەرهەم نییە، بەڵکو لە سەر کڕینی ئەو شتانەیە لە ڕێگەی بەرتیلەوە. ڕێگەچاەش ئەوە نییە ئەو پێشبڕکێ و ململانێیە سنووردار بکرێت، بەڵکو بە شێوەیەک دابڕێژرێتەوە کە سوود بە هاوڵاتیانی وڵاتانی پێشکەوتوو بگەیەنێت.

نووسینگەی کۆنترۆڵی بانکی جیهانی لە دوای دابینکردنی ئەو خزمەتگوزاری و کاڵایانە هەڵدەستێت بە پشکنین و لێکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بزانێت تا چەند ئەو خزمەت و کاڵایانە پێشکەش کراون. لەبری ئەوەی زۆرتر پشت ببەستێن بە تۆمارەکانی سەر کاغەز، چاودێرانی بانک زیاتر پتش دەبەستن بە پشکنینی مەیدانی و لێکۆڵینەوە لە سەر ئەرزی واقیع. بەڵام تەنها تەرکیز بکرێت لە سەر پرۆژەکانی بانک ئەوا سوودێکی ئەوتۆی نابێت. بەشی هەڵسەنگاندنی پرۆژەکان ئاژانسی بانکی جیهانییە

لە دەرەوە و ناوەوە بۆ چاودێریکردن. لە توێژینەوەی ساڵانەی ئەو بەشەدا دەرکەوتووە کە ئەو وڵاتانەی حکومەتی بێهێزیان هەیە و بەرزترین ئاستی گەندەڵیشیان هەیە ئەوا ئەو وڵاتانە بە سەرکەوتوویی پرۆژەکانی بانکی جیهانی جێبەجێ ناکەن. ئەو ئەنجامەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە هەتا گەر بانکەکە تەنها خەمی سەرکەوتنی پرۆژەکانی خۆی بێت، ئەوا دەبێیارمەتی قەرز وەرگرەکان بدات بۆ چاپکردنی باری حکومەت لە پێش هەموو شتێکەوە.

ڕێکخراوە قەرز بەخش و هاوکارییەکان دەبێ هەشیار بن لە هەوڵە سیاسی و ڕێکخراوەییەکان کە وا دەکەن کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی کارێکی زەحمەت بێت. دەبێ هەر بەخۆیان چاوێک بە دامەزراوەکانی کۆنترۆڵ کردن بخشێننەوە و ئەو ناوچانە جیا کەنەوە کە کاری ناشایستەی تیادا ئەنجام دەدرێت. گەر بەخۆیان کاری چاودێریکردن ئەنجام نەدەن، ئەوا ڕەنگە چاودێرانی تر هەڵسن بە ئەنجامدانی ئەم کارە بەڵام پیشەکە ڕەزیل دەکەن و متمانەی ئەو ڕێکخراوەش دەشکێنن. ڕەخنە لە هەردوو لای چەپ و ڕاستی بۆچوونە سیاسییەکان واقیعێکە بۆ ژیانی ئەو ڕێکخراوانە. دەبێ ئەو ڕێکخراوانە دان بەوە دانێن کە حەتمەن کێشەیەک هەیە دەبێ هەنگاو بنرێت بۆ چارەسەر کردنی و کەم کردنەوەی ئەو زەرەر و زیانەی کە بەهۆی گەندەڵیەوە بەر پرۆژەکانی ڕێکخراوە قەرز بەخش و هاوکارییەکان دەکەوێت.

## پشتگیری کردنی چاکسازی

بانکی جیهانی و IMF و UNDP و ئاژانسە هاوکارییەکان و بانکە هەرێمییەکان بۆ گەشەپێدان وا لە سیاسەتەکانی دژە گەندەڵی دەڕوانن کە دەبێ تاکید لە سەر پرۆژەکانی خۆیان بکەنەوە بۆ پشتگیری کردنی زیاتری چاکسازییەکی سەد دەر سەد. هەرکە ئەو ڕێکخراوانە بە ئاشکرا دانیان نا بە کێشەی گەندەڵی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و چین، ئەوا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە زۆر زەحمەتە بۆ ئەوان ئەو کێشەیە پشت گوێ بخەن لە شوێنەکانی تری جیهان. هەرکە سەرمایەی تایبەتی لە هەندێ ناوچەی تەقلیدی بانکی جیهانی قەرز بەخش گرینگتر دەبێت، ڕۆڵی بانک ئا لەو کاتەدا دەبێ زیاد بکات لە نێو دامەزراوەکانی چاکسازی.



UNDP و ئاژانسەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ گەشەپێدانی نێودەوڵەتی، کە پێشتر هاوکاری تەکنیکییان دابین کردووە بۆ چاکسازی حکومەت، پرۆژەکانی خۆیان فراوان دەکەن تاوەکو خەمێکی شاراوە لە گەندەڵی بخۆن. IMF ئەوە دووپات دەکاتەوە کە پەیوەندی گەندەڵ و نهێنی لە نێوان حکومەت و بازرگانی کەرتی تایبەت و کەرتی بانک و دارایی قەیرانەکان زۆرتر و ئاڵۆزتر دەکەن. چاکسازیە پێکهاتەییەکان لەو ناوچانەدا مەرجێکن بۆ هەندێ چارەسەریەکانی IMF.

لە نێو بانکی جیهانی و IMFدا، چاکسازی لە بەڕێوەچوونی پرۆژەکان دەستی پێکرد وەک بەشێک لە هەموارکردنی قەرزبەخشین کە لە ساڵانی هەشتاکان جێبەجێ کرا، ئێستاش هەر بەردەوامە بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر. ئەمە هەنگاوێکی زەحمەت بوو بۆ چاکسازی دامەزراوەییەکان، بەڵام ئێستا بانکی جیهانی دەست پێشخەری پرۆژەی ئازاد دەکات کە لە سەر پێی خۆی دەوەستێت. دەستی بەوە کردووە کە قەرز بەخشێت بۆ چاکسازی لە دەسەڵاتەکان و ئاژانسەکانی باج و دەسەڵاتی دادوەری و دامەزراوە حکومییەکانی تر. بانکی جیهانی ئێستا ئامۆژگاری وڵاتان دەکات لە سەر پرۆسەی تایبەتمەندێتی. ئاژانسە هاوکارییەکان وەک UNDP و ڕێکخراوە بەخشەرەکان بوونەتە پێشەنگ لە پێشخستنی چاکسازی پرۆژەکان. هەموو ئەو دەستپێشخەرییانە پێویستیان بە پابەندبوونێکی درێژخایەن بە فەند و پسپۆڕ و هەروەها بە داننان بەوەی کە پێوەرەکانی بەرهەم وەها ئاسان نییە بە وردی کاری لەسەر بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێکخراوە هاوکارییە نێودەوڵەتییەکان و کۆمەڵگای قەرز بەخشین دەتوانن هاوکار بن لە دابینکردنی چوارچێوەیەک کە تیایدا گەشەپێدان بەردەوام بێت لە نێوان کەرتە تایبەتی و حکومییەکان.

بەشەکانی پێشتر باسی ئەو هەنگاوانەیان شی کردەوە کە حکومەتێکی خەمخۆری چاکسازی دەتوانێت گەندەڵی کەم بکاتەوە. ئاژانسەکانی هاوکارییە نێودەوڵەتییەکان و قەرزبەخشەکان دەبێ دەست بەم جۆرە چوارچێوەیە بکەن و کار بکەن لە سەر هەر وڵاتێک بە تەنیا بۆ دانانی بەرنامەیەکی واقیعی. ئەولەویاتەکانی چاکسازی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە، بەڵام هەموویان یەک دەگرنەوە لە خاڵە بنەڕەتییەکانی چاکسازی، یەک دەگرنەوە لە گۆڕانی یاساکان بۆ کەمکردنەوەی

پاڵنەرە گەندەڵییەکان لە کەرتە تایبەتییەکان، یەک دەگرنەوە لە سەپاندنی یاسا و چاودێریکردن. یەک دەگرنەوە لە چاکسازی کردنی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان و بەهێزکردنی لێپێچینەوە و ڕاگرتنی هاوسەنگییەکان. ئەو هەوڵانەی کە ئێستا لە ئارادایە هەندێ شت دەگرێتەوە وەک دابینکردنی سەرچاوەکان و هاوکاری تەکنیکی بۆ ئاسانکردنی قۆناغی گواستنەوە و چاککردنی سیستەمی مووچەی فەرمانبەران بۆ ئەوەی مووچەیەکی باش وەرگرن. سەرکەوتنی ئەو هەوڵ و تەقەلایانە تێکەڵ کراون و هەمیشە بەردەوامیش نین. بۆیە دەبێ ئەو هەوڵانە بەردەوام بن، بە تایبەتی، دەتوانن لەو هەوڵانەی لە ڕابردوو کراون فێربن و دووبارە نەکرێنەوە. ڕێکخراوە هاوکاریە نێودەوڵەتییەکان و قەرز بەخشەکان یارمەتی وڵاتانی پێشکەوتوو و قۆناغی گواستنەوەی ئابووریان داوە بۆ بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەکان بە وردی لەبارەی هەوڵە بنەڕەتییەکانی حکومەت و بۆ چاکسازی کردن لە پرۆسەکانی ژمێریاری بودجە.

ئامانجی هەوڵەکانی چاکسازی کەرتە تایبەتییەکانن. بە تایبەتی، ئامانجی IMF و بانکی جیهانی لە چاکسازی سیستەمی گومرگ و باجە. هەندێ بەرنامە پێدەچێت سەرکەوتوو بن، هەرچەندە ئەوانی تر ژێرکەوتوونە چونکە زۆر پشتگیری پرۆژەکانیان نەکردووە. کێشەی سەرەکی سروشتی ناهەمواری ئەزموونەکانی ڕابردووە. کۆکەرەوەی باج و کارمەندانی گومرگ وەرگرتن مووچەیان زیاد دەبێت و مەرجەکانی کارکردنیان بۆ باشتر دەکرێت و بەخشیش لە لایەکی ترەوە وەردەگرن. ئەمە بۆ ماوەیەک سەر دەگرێت بەڵام دوایی مەعنەویات لە هەموو شوێنێک لە نێو حکومەت دادەبەزێنێت، دەبێتە هۆی دروست بوونی تۆڵە و تووڕەیی لە لایەن فەرمانبەرانی ترەوە و نوێ بوونەوەی کاری خراپ و حاڵەتی حکومەت بەرەو خراپتر دەبات لەوەی کە لە پێشتر هەبوو. یان ئەوەتا دەبێ هەموو کەسێک مووچەی باش بێت یانیش ئەوەتا ئەو فەرمانبەرانەی کە مووچەیان هەر کەمە هەستی تۆڵە لە لایان دروست دەبێت و حکومەت بەرەو هەڵدێر دەبەن.

هەندێ جار کێشەکە هەر کەمکردنەوەی گەندەڵی نییە لە دامەزراوە هەنووکەییەکان، بەڵکو کێشەکە نەهێشتنی سەرهەڵدانی گەندەڵییە بە بەرگێکی نوێوە. بۆ نموونە، بەرتیل و واستەکاری و ڕێکەوتنی لامەرکەزی مەزات دەشێوێنێت و



لە باری دەبات، هەروەها گەندەڵی هەموو ئەو سیستەم و نیزامانە لەبار دەبات و ئیفلیج دەکات کە دامەزراون بۆ چاودێریکردنی کۆمپانیا تایبەتییەکان. بە هەمان شێوە، هەڵمەتی نایاسایی و کڕینی دەنگ دەتوانێت ببێتە هۆی لەبار بردنی پرۆسەی دیموکراسی. ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەبێ زۆر هەشیار بن لەو ئەگەرانە، بە لایەنی کەم ئاگاداری دەرفەتەکانی گەندەڵی بن و توند بن لە سەر بەرنامەکانی چاکسازی و چاودێری ئەو پلانانە بکەن کە سوود بە چەند کەسێکی مفتەخۆر دەگەیەنێت.

سەرکەوتنی گەورە لە چاکردنی کەش و هەوای دامەزراوەیی لە پێناو گەشەپێداندا دەکرێت گەر ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و حکومەتە قەرز وەرگرەکان ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ بگرنە بەر بۆ کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی و فۆرمەکانی تری ڕەوشی ئابووری. UNDP و بانکی جیهانی هەوڵی کار کردن دەدەن لە نێوان بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی هەژار و دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان هەروەها چارەسەر کردنی گرژییەکان لە نێوان ئامانجە خێرخوازیەکان و سیاسەتەکانی هاوکاری کردن و قەرز بەخشین. پرسەکە پرسێکی ئاڵۆزە، بەڵام ئەو شوێنەی کە لێیەوە دەست پێ بکەین دان نانە بە کێشەکە. ئەمەش کراوە لە زۆربەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ دەرچوونی بەیاننامەی ساڵی ١٩٩٧ ی بانکی جیهانی بە ناوی " یارمەتیدانی وڵاتان لە شەڕکردنی دژی گەندەڵی". ئامانجەکە نابێ برینی هاوکاری بێت لە پرۆژەکان لە وڵاتێکی گەندەڵ یان لە بەرتیلەکان کە بووەتە شتێکی ڕۆتینی لە هەندێ شوێنی بازرگانی نێودەوڵەتی. لە بری ئەوە، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پێویستە لەگەڵ ئەو وڵاتانە کار بکەن کە ویستیان هەیە بۆ دانانی بەرنامەیەکی سەرتاسەری لە دژی گەندەڵی. بە پێچەوانەشەوە، دەبێ پێیان خۆش بێت و ئامادە بن هاوکاری لەو وڵاتان ببڕن کە ئەو هاوکارییە بە باشی و کاریگەر و لە شوێنی خۆی بەکار ناهێنن.

## سنوورێک بۆ گەندەڵی لە نێو بازرگانی نێودەوڵەتیدا

گەندەڵی کڕیار و فرۆشیار دەگرێتەوە، واتە هەردووکیان دەستیان تێدا هەیە. ناکرێ تەنها بە" هاوردن" وەسف بکرێت لە لایەن کۆمپانیا زەبەلاحە گەندەڵەکان بۆ نێو وڵاتانی پێشکەوتوو و بەری لە گەندەڵی. بە پێچەوانەوە، ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت " کەلتووری دیاری بەخشین و واستەکاری وا لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەکات هەستیاری کەلتووری خۆیان بخەنە ڕوو لە ڕێگەی بەرتیلدانەوە"، ئەو بۆچوونە قەناعەتی پێ ناکرێت. هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر بڵێین کەلتووری دیاری بەخشین بە تەواوی پشتگیری بەرتیلدان دەکات لە لای کۆمپانبا بازرگانییەکان بۆ سەرکردە سیاسییەکان. کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان ئەکتەرێکی سەرەکی ڕێکەوتنە گەندەڵییەکانن. بۆیە چاکسازی هەلی زیاتری هەیە بۆ سەرکەوتن گەر ئەو کۆمپانیایانە پاڵپشتی گۆڕان بکەن.

### دەستپێشخەرییە نێودەوڵەتییەکان

کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان دووچاری حەپەسانێک دەبنەوە کاتێ مامەڵە دەکەن لەگەڵ ڕژێمە گەندەڵەکان. هەموو کۆمپانیایەک باوەڕی وایە کە پێویستە بەرتیل بدات، بەڵام کۆمپانیاکان باش دەزانن کە بارودۆخیان باشتر دەبێت گەر کەس بەرتیل وەرنەگرێت. بەڵام مەیدانی کارکردن وا ناڵێت، لە مەیدانی کارکردندا هیچ سیستەمێکی ڕاستگۆ نییە پشتی پێ ببەسترێت. ئەم واقیعەش هەوڵە نێودەوڵەتییەکانی خواردووە. پرسە سەرەکییەکان ئەمانەن: تاوانەکانی بەرتیل و ڕووبەڕوو بوونەوەی کەمکردنەوەی بەرتیل و دامەزراندنی سیستەمێکی شەفاف بۆ پێشبڕکێی پرۆسەی کڕین لە لایەن حکومەتەوە.

ئەنجوومەنی ڕێکخراو بۆ هاوکاری و گەشەپێدانی ئابووری (OECD) ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی مۆرکرد لە مانگی ١٢ ی ساڵی ١٩٩٧ کە داوا دەکات گەندەڵی بە پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لە لایەن بەرپرسە بیانییەکانەوە. ئەو دۆکیومێنتەش لە ژێر پرۆسەی پەسەند کردندایە. ئامانجی سەرەکی ئەو



ڕێکەوتننامەش فراوانکردنی بنەماکانی پیادەکردنی گەندەڵی لە دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانە بۆ کۆمەڵگای بازرگانی نێودەوڵەتی. زۆربەی وڵاتان نەک هەر تەنها پێویستە ئەو ڕێکەوتننامەیە پەسەند بکەن بەڵکو دەبێ بەرتیل بۆ کۆمپانیا بیانییەکان بنبڕ بکەن. تەنانەت داوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش کراوە کە یاساکانی خۆی بە شێوەیەکی گونجاو هەموار بکات. ڕێکەوتننامەکە بە شێوەیەکی گشتی پێناسەی بەرتیل و " بەرپرسی بیانی" دەکات و داوای هاوکاری یاسایی هاوبەش و سزای دەستبەجێ دەکات. ئەو ڕێکەوتننامەیە بانگەشەی دامەزراندنی پێوەرەکانی لێپێچینەوە و هەژماردن و دامەزراندنی پرۆسەیەکی چاودێریکردن و بەدواداچوون دەکات. خاڵی لاوازی ئەو ڕێکەوتننامەیە بە دوور گرتنی حیزبی سیاسی و بەرپرسە حیزبییەکانە لە بەرتیل.

لە هەندێ وڵاتدا، ئەو بەرتیلەی دەدرێت بۆ بەدەستهێنانی بازرگانی لە دەرەوە سەرچاوەیان گرتووە لە باج کە ئەمەش هەمیشە پاڵنەرێکە بۆ زیادبوونی گەندەڵی. بۆیە ئەنجوومەنی OECE پێشنیاری ئەوە دەکات کە وڵاتانی ئەندام " بە سەر کۆکردنەوەی باج دا بچنەوە کە لێیەوە بەرتیل سەرچاوەی گرتووە بۆ بەرپرسە حکومیەکانی دەرەوە، لەگەڵ نیازی ڕەتکردنەوەی فرۆفێڵ لەو وڵاتانەی کە ئەندامن و پێشتریش کاری وایان نەکردووە". ویلایەتە یەکگرتووەکان پێشتر فرۆفێڵی لە باج قەدەغە کردووە و ناهێڵێت بەرتیلی لێ بکەوێتەوە، هەروەها گەلێ لە وڵاتانی تر ئێستا لە پرۆسەی گۆڕانی یاسادان تاوەکو بە تەنگ ئەو پێشنیارەوە بچن.

لە ژێر چاودێری ڕێکخراوی ویلایەتەکانی ئەمریکا (OAS)، ڕێکەوتننامەی ناوەوەی ئەمریکا دژی گەندەڵی ئێستا سەرلەنوێ کراوەیە بۆ پەسەند کردن، هەروەها چواردە وڵات ئەو ڕێکەوتننامەیان مۆر کردووە لە ناوەڕاستی ,١٩٩٨ لە نێو ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە کە دەبێ هاوکارییەکی باش هەبێت لە نێو وڵاتان و دەبێ ئەو وڵاتانە نەهێڵن بە هیچ شێوەیەک بەرتیل هەبێت، گەر هەر کارێکی بەرتیلیش ئاشکرا بوو دەبێ بە پێی یاسا سزابدرێن. ئەو ڕێکەوتننامەیە پێکهاتووە لە هەندێ وڵاتی پێشکەوتوو و ژمارەیەک وڵاتی مام ناوەند و چەند وڵاتێکی هەژاریش.

دانانی کۆدێک بۆ پرۆسەی کڕین لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیدا زەحمەت بووە.

ڕێکەوتننامەی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی نوێ کراوەتەوە لە سەر پرۆسەی کڕین لە لایەن حکومەت و چووەتە نێو قۆناغی جێبەجێ کردنەوە لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٩٦، بەڵام تەنها بیست و دوو وڵات، کە زۆربەیان وڵاتی پیشەسازین، کاریان بە ناوەڕۆکی ئەو ڕێکەوتننامەیە کردووە. هەندێ لە پسپۆران ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیان ناچار کردووە کۆدێکی سنووردار تر دابنێن کە تەنها جەخت بکاتەوە لە سەر دیارکردنی گەندەڵی و بەهیوای ئەوەی وڵاتی زیاتر بەشداری بکات.

هەندێ لە ڕێکخراوە پیشەیی و بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان کارکردن و دەستپێشخەری کارکردنی دژە گەندەڵی خستۆتە نێو کارنامەی خۆیانەوە. ژووری بازرگانی نێودەوڵەتی لە ئاداری ساڵی ١٩٩٦دا بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە و تیایدا ئەندامانی ناچار کرد بۆ ئەوەی پابەند بن بە یاساکانی و سنوورێک بۆ بەرتیل لە نێو نێوەندی بازرگانی نێودەوڵەتی دابنێن. یاساکان، بەرتیل بۆ هەر مەبەستێک بێت قەدەغە دەکەن، نەک بۆ بەدەستهێنانی بازرگانی. ئەنجوومەنی کۆمەڵەکانی بازاڕی نێودەوڵەتی بڕیارێکی تەواوکەری ئەمەی سەرەوە دەرکرد لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٩٦, بەشی دەستپێشخەری بەرپرسیارێتی هاوکاری لە UNDP خەریکی کارکردنە لەگەڵ ڕێکخراوی دامەزراوەکانی چاودێری باڵای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی بۆ دانانی بەرنامەیەک بە مەبەستی بەهێزکردنی بەرپرسیارێتی لە وڵاتانی پیشکەوتوو. هەموو ئەو دەستپێشخەریانە کاری هاندەرن بە تایبەتی هەندێکیان کاری زۆر دڵخۆشکەرن. بەڵام ماناکانیان و کاریگەرییان لە ماوەی چەند ساڵێکی داهاتوودا بەدیار دەکەوێت.

## ئەرکی کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان

هەرچەندە هەوڵە نێودەوڵەتییەکانی بەم دواییە ئامادەییەکی باشیان پێوە دیار بوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەی نێودەوڵەتی بەرتیل، کەچی هەر بە پێی پێویست نین. کۆمپانیا زەبەلاحەکان وەک ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان دەبێ بە سەر پابەند بوونەکانیان دا بچنەوە کە کاریگەری لە سەر ئەو نەتەوانە هەیە کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٩٥دا، ژمارەی فرۆشتنەکان لە هەرە فراوانترین



بیست دەستەی نێودەوڵەتی لە ٦١,٥ ملیار دۆلار بەرز بۆوە بۆ ١٥٢,٥ ملیار دۆلار. بچووکترینیان لەو بیست کۆمپانیایە ڕێژەکەی تێپەڕبوو لە GDP ٩٨ لە کۆی ١٣٨ وڵات کە داتا دابین دەکەن بۆ بانکی جیهانی.

بەرزبوونەوەی ئابووری کۆمپانیایەک پەیوەست بە دەوڵەتێکی نەتەوەیی دەوەستێتە سەر سروشتی مامەڵەکانی کۆمپانیاکە لەگەڵ حکومەت و سەر قەبارەی مامەڵەکانی پەیوەست بە حکومەت. ڕەنگە کۆمپانیا زەبەلاحەکان گرێبەستیان هەبێت بۆ بەدەستهێنانی بەرد و کانزای یان نەوتی ڕەش، یان گرێبەستیان هەبێت بۆ بڕینەوەی دار، یاخود بۆ بەرهەمهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بۆ بازاڕ. ڕەنگە کۆمپانیا تایبەتییەکان بکڕنەوە یاخود کارگەی نوێ دامەزرێنن یان کۆمپانیای نوێ تایبەت بە خزمەتگوزاری دابنێن. گەر مامەڵەیەک قەبارەی پشکی داهاتی وڵاتێک بێت یان بودجەی دەوڵەتێک بێت ئەوا کۆمپانیا زەبەلاحەکان ناتوانن لە سەر بەرپرسیارێتی خۆیان ئەو مەنسەبە بەکاربێنن کە هەموو بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە. ڕەنگە بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئەوان لە ژێر هیچ مەرج و پابەندبوونێکدا نین، بەڵام ناتوانن بڵێن کارەکانیان سەر بە هیچ مەرجێک نین لە وڵاتانی پێشکەوتوو و ئینتیقالیدا.

بازرگانە نێودەوڵەتییەکان بە شێوەیەکی گشتی کاریگەری هەڵسوکەوتی خۆیان نەخستۆتە بەرچاو لە سەر ڕوانگەی درێژخایەنی ئەو وڵاتانەی کە بازرگانی دەکەن و کاری وەگەڕخستن دەکەن. ئێستاشی لەگەڵدا بێت لێرە و لەوێ گوێبیستی دەست لە کارکێشانەوە دەبین لە لایەن سەرکردەی بازرگانان و ڕاوێژکارەکانیان. بەڵام، لە کەش و هەوایەکی نێودەوڵەتیدا بە بێ هیچ ئامرازێکی کاریگەری ڕێکخستنی هەڵسوکەوت، کۆمپانیا زەبەلاحەکان پابەند بوونێکیان هەیە، هەروەها ڕەنگە بەرژەوەندیەکی درێژخایەنیان هەبێت، گەر بێت و لە سەر بەرپرسیارێتی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن. لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، لەگەڵ تۆڕی نیزمەکانیان و سیستەمی سیاسی وەڵامدەر، کۆمپانیا زەبەلاحەکان جەخت لە سەر نهێنی قازانج دەکەنەوە کە دامەزراوەکانی تر لە ئارادا هەن و نیگەرانن لەبارەی قۆرخ کردنی دەسەڵات و خراپ بەکارهێنانی بازرگانی لە پێناو بەرژەوەندی دیکە دا. بۆ نموونە، کاتێ کۆمپانیایەکی

زەبەلاح کار دەکات بە پێی یاسای ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت تان و پۆی ئەوە بکات کە ئەو پێوودانگانەی سەپێنراوە بەهۆی باج و یاساکانی تاوان و یاسا نیزامیەکان بەسن بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان. حاڵەتێکی لەم جۆرە گفتوگۆ هەڵگرە تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیش، بەڵام بەلانی کەم حاڵەتێکی ماقووڵیشە. ئەم بۆچوونە پرسیارێک قووت دەکاتەوە، کەی وەگەڕخستن و بازرگانی ڕوودەدات لەو کەش و هەوایانەی کە حوکمە یاساییەکان تایبەتن یا سنووریان بۆ دانراوە و لەو شوێنانەشی کە بەرپرسیارێتی و ئەرکی بەرپرسە گەورەکانی حکومەت لەمەڕ سەرکەوتنی درێژخایەنی ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵات جێی گومانە.

بێگومان، چەند حاڵەتێکی زۆر کەم هەیە کە کۆمپانیایەکی زەبەلاجی نێودەوڵەتی بتوانێت بە تەنها کاریگەری هەبێت لە سەر کار و چالاکییەکانی دەوڵەت. وڵاتانی وەک چین و هیندستان، یاخود ڕووسیا ئەوەندە گەورەن خۆیان دەسەڵاتی بازاڕی تایبەت بە خۆیان هەیە. هەرچەندە، لەو وڵاتانەشدا هەندێ کۆمپانیا لە سەر ئاستی نەتەوەیی ئابووریەکەی بەرزە، هەروەها کاریگەری هەرێمی زۆر گەورەیە لە سەر مامەڵەکانی دیکەدا. بۆ نموونە، کۆمپانیای کالا فرۆش بە پێگە نێودەوڵەتییە بەهێزەکەشیەوە، وەک " ماکدۆناڵد و دیزنی و لێڤی ستروس و کۆکا کۆلا" ڕەنگە جۆرێک بن لە سیمبولی نوێگەری کە دەتوانن بە شێوەیەکی سەرکەوتوو بەرەنگاری گەندەڵی ببنەوە. کۆمپانیاکانی تر بە پێگەی بەهێزی بازاڕیانەوە لە بواری بازرگانی خۆیاندا وەک " بۆوینگ یاخود IBM" دەتوانن ئەوە ڕەت بکەنەوە کە لە ڕێکەوتنێکی گەندەڵی بەشداری بکەن. تەنانەت گەر ئەو جۆرە کۆمپانیا زەبەلاحانە دەست بخەنە مامەڵەی گەندەڵی لە هەندێ وڵاتدا، ئەوا ئەوانی تر زۆر بە پاکی کار دەکەن تاوەکو زەرەر و زیانەکانی کۆمپانیا نەگاتە ڕادەیەکی زۆر گەر بێت و مامەڵە گەندەڵەکانیان ئاشکرا بێت. کۆمپانیا گەورە و فراوانەکانی تر وەک " گێنێرەڵ ئەلەکتریک" گەر دژی گەندەڵی بوەستێتەوە لە وڵاتێک، ئەوا سوود و قازانجەکەی زۆر زیاتر دەبێت لەوەی کە دەست خاتە نێو کاری گەندەڵییەوە. دواجار بۆیە خۆی لەو کاری گەندەڵە لادەدات. کۆمپانیایەکی لەم جۆرە دەسەڵاتی مامەڵە کردنی هەیە بۆ پاراستنی شەریکە ناوخۆییەکانی لە تووش بوون بە نەخۆشی گەندەڵی. ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانەی بە



شێوەیەکی سەرکەوتوو ئابووری بەرزیان بەکاردەهێنن، نەک هەر تەنها یارمەتی گەشەیەکی درێژخایەن دەدات لە لایەنی ئابووری وڵاتەوە بەڵکو بۆ ماوەیەکی کورتیش سوودی خۆی دەبێت.

ئەو کۆمپانیایانەی لە بارودۆخێکی گەندەڵدا کار دەکەن دەبێ بڕیاری ئەوە بدەن ئایا چالاکانە بەشداری دەکەن، بە هێمنی مامەڵە کردن ڕەت بکەنەوە، یان دەنگی گەندەڵی هەڵبڕن بۆ دەسەڵاتە مەحەلیەکان و ئەوانەی لە دەرەوەی جیهانی گەندەڵین. ئاشکرایە کە بێ دەنگ بوون خراپترین ئیختیارە. کۆمپانیا زەبەلاحەکە نەک هەر تەنها بازرگانی لە دەست دەدات، بەڵکو هیچیشی نەکردووە بۆ گۆڕانی بارودۆخەکە و باشتر کردنی. سوودی بەرژەوەندی هەنووکەیی لە نێو گەندەڵیدا ئەوەیە کە کۆمپانیاکە بە دەستی شەرمەزاری نێودەوڵەتییەوە دەناڵێنێت گەر بێت و حاڵەتێکی بەرتیلی لە سەر ئاشکرا بێت، بۆیە ئەم ئەگەرە وایان لێ دەکات نەک هەر تەنیا بەرەنگاری گەندەڵی ببنەوە بەڵکو کاری گەندەڵی ئاشکرا دەکەن گەر لە هەر شوێنێکی نێو کاروباری خۆیاندا بەدی بکەن. ئەو کۆمپانیایانەی کە هەوڵی نەهێشتنی گەندەڵی دەدەن و هاوکات لێرەو لەوێ پەسەندی دەکەن وەک پێویستییەکی چڵێس ئەوا هەمیشە ئاوا بەردەوام نابن. ئاشکرا کردنی داوا گەندەڵییەکان دەتوانێت کاریگەری هەبێت گەر فشاری ڕای گشتی نێودەوڵەتی کار بکاتە سەر بەرپرسە گەندەڵە حکومییەکان و کۆمپانیا زەبەلاحە بازرگانییە بەرتیلدەرەکان.

پێویستە بەرپرسە گەورە ئیدارییەکان کارێک بکەن. بەڵگەکانی ڕووپێوێک کە تیایدا قوتابیان و بەرپرسە ناوەنجیە ئیدارییەکان ئامانجەکانی کۆمپانیا لە پێشەوەی ئەخلاقی شەخسی دادەنێن، پێشنیاری ئەوە دەکات کە سەرکردایەتی بە متمانە دەبێ لە سەرەوە ڕا بێت. لە یەکێک لە تاقیکردنەوەکان. لە سەدا ٧٠ ی بەشداربووان ویستی بەرتیلدانیان هەبوو بۆ ئەوەی موشتەری بۆ کۆمپانیاکەیان پەیدا بکەن. لە نێو کۆمەڵێک بابەتی تاقیکردنەوەدا، ئەخلاق بە پلەی دووەم هات لە کاتی جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی کۆمپانیا. ئەوانەی ویستی بەرتیلدانیان زۆرە بایەخیان بە ڕاستگۆیی و یەکسانی نەدەدا لە ژیانی شەخسی خۆیان لە چاو

بەشداربووەکانی تر. واتە ئەوەی تۆوی گەندەڵی لە مێشکی ڕوابێت ئەوا ڕاستگۆیی و شەرەف و یەکسانی لای ئەو کەمالیاتە و هیچ بایەخێکی نییە. ئەو ئەنجامانەش لە هەموو ڕووێکەوە گرینگی دەستپاکی و هەڵسوکەوتێکی باش و دوور لە فڕوفێڵ دووپات دەکەنەوە. لە بەرئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان یاسای لە سەر ئەم حاڵەتانە سەپاندووە دەتوانین بڵێین یەکەم وڵاتە، بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی جیهان، توانیویەتی کار بکات لەم بوارە و سوود لە کۆمپانیاکان وەرگرێت بە بێ فڕوفێل.

ئەمڕۆ چەند ستراتیژیەتێکی جیهانی لە بەرچاو دەگیرێت کە پێشتر بێ هێز و هیچ حیسابێکیان بۆ نەکراوە. بۆیە دەتوانین پەیوەندی هاریکاری لە نێوان IMF و بانکی جیهانی بهێنینە بەرچاوی خۆمان، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە پەیوەندی هاریکاری لە نێوان کۆمپانیا بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان بۆ ئەوەی هاوکاری چاکسازی بکەن. بۆ نموونە، IMF لە ژێر چاودێری سیاسەتە نوێیەکەی داوای چاکسازی دەکات لە دامەزروەکانی کەرتی حکومی وڵاتدا و هەروەها لە شەفافیەتی ڕێنماییەکانی تاوەکو سنوورێک بۆ گەندەڵی دابنێت و هەروەها کاریگەری هاوکاری دارایی IMF بەرەو باشتر ببات. ئەم جۆرە هەوڵانەش دراوە بۆ وڵاتانی وەک فلیپین و تایلاند، لە بەرئەوەی کینیا ئامادە نەبوو پرۆسەی چاکسازی IMF پەسەند بکات، بۆیە IMF لە ساڵی ١٩٩٧ لەم وڵاتە هاتە دەرەوە. یەکێک لە ڕێگاکانی پشکنینی کاریگەرێتی سیاسەتەکانی وڵاتێک ئەوەیە کە ڕێگە بەو کۆمپانیا زەبەلاحانە بدرێت کە فشاریان دەخرێتە سەر بۆ گەندەڵی ڕاپۆرت بنووسن بۆ IMF گەر هەر لایەنێک ویستی دانەخۆرەیان بکات بە گەندەڵی. IMF هەڵناستێت بە لێپێچینەوەی یەک نارەزایی بەڵکو کار دەکات لە سەر لێکۆڵینەوەی کۆمەڵێک ڕاپۆرت. بە هەمان شێوە، بەرپرسە گەورە حکومییەکان کە فشاریان دەخرێتە سەر بۆ ئەوەی بەرتیل پەسەند بکەن لە لایەن بازرگانەکانەوە دەتوانن ڕاپۆرت بنووسن بۆ IMF. ئەو جۆرە ڕاپۆرتانەش، کە بە بانکی جیهانیدا تێپەڕ دەبێت، دەکرێت ببن بە هەنگاوی بەرایی لە جێبەجێ کردنی سیاسەتی نوێی "کڕین" لە لایەن بانکی جیهانی کە هەمیشە لە خزمەتی کۆمپانیاکاندایە لە ڕێگەی قەرز بەخشینەوە.

بوون بە هەوێنێک بۆ ئاشکرا کردنی شتەکان ڕێگایەکە بۆ ئاشکرا کردنی هەردوو



لا کە گەندەڵی لە ئاستی زۆر بەرزدا گەمەیەکە تیایدا وڵاتانی پێشکەوتوو دۆڕاون و هەروەها لەو گەمەیەدا نە کەرتی حکومی نە هی تایبەتیش دەتوانن لە بەرپرسیارێتیەکە ڕابکەن. گەر هەردوو لا پێکەوە بەپرسی گەورە و کۆمپانیا ڕاپۆرت بنووسن لە سەر ئەو فشارەی دەخرێتە سەریان بۆ گەندەڵی لە لایەن کەسانی ترەوە ئەوا قۆناغەکە ڕێگە خۆشکەر دەبێت بۆ چاکسازی و دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی پاڵنەرە گەندەڵییەکان کە هەر لە سەرەتاوە وشک دەکەن و تەشەنە ناکەن بۆ کاری گەندەڵی و سەرەخۆرە. بێ هەوڵدان بۆ نارەزایی دەربڕین، IMF و بانکی جیهانی دەتوانن بە دیالۆگێک دەست پێ بکەن لەگەڵ سەرکردەی وڵاتان و وەگەڕخەرە سەرەکییەکان لە سەر ئەو ڕێگایانەی کە بەرەو چاکتر بوونی بارودۆخەکەمان دەبات لە پێناو سوودی هاوڵاتیاندا. گەر هەر کەسە و لە شوێنی خۆی بیر بکاتەوە و هەموو کەسەکانی تر بە دز و گەندەڵ بزانێت، ئەوا ئەو کاتە دەبێ هەموومان بکەوینە سەر گیانی یەکتر و ژیانی ئابووری تێک و پێک بشکێنین. بەڵام بە پێی مەنتق، گەر تۆ زانیت یەکێک دزە و گەندەڵی دەکات بوێرانە ڕاپۆرتی لە سەر بنووسە و بەرزی بکەرەوە بۆ سەرووی خۆت. گەر پێشبینییەکان بگۆڕدرێن لە ڕێگەی لێدوانێکی ئاشکرا لە سەر ئەو دوو لایەی کە فشاریان لە سەرە بۆ گەندەڵکاری ئەوا چرۆیەکی هیوا بەدی دەکرێت لە بنبڕکردنی گەندەڵی. کەش و هەوای ڕای جیهانی شیاوە بۆ هاریکاری یەکتر لە پێناو وەستان دژی بەرتیل و بە هیچ شێوەیەک پەسەند نەکرێت و هان نەدرێت.

## کۆنترۆڵکردنی گواستنەوەی پارە و پڕۆژەی نێودەوڵەتی لەمەڕ تاوان

هەوڵەکانی دژە گەندەڵی دەبێ هەماهەنگی بکەن لەگەڵ هەڵمەتێکی تری نێودەوڵەتی ئەویش شەڕ دژی تاوانی ڕێکخراوە. بۆ ئەمەش دوو هۆ هەیە: یەکەمیان، هەردووک بەرپرسە گەندەڵەکان و پڕۆژەی نێودەڵەتی تاوان سوود وەردەگرن گەر گواستنەوەی پارە ئاسان بێت لە سنوورێکەوە بۆ سنوورێکی تر. بەرتیل زیاتر پەسەند دەکرێت گەر بە شێوەیەکی ئاسان فەندەکان دیپۆزیت بکەیت واتە بخەوێنی لە دەرەوەی وڵات. بۆیە کاری بەهێزی نێودەوڵەتی دژی گواستنەوەی پارە دەتوانێن یارمەتی کەم

کردنەوەی زیانی هەردوو کێشەکە بدات. دووەمیان، هەبوونی بازرگانی نایاسایی بە ڕێژەیەکی زۆر کاریگەریەکی گەندەڵی لە سەر حکومەت دەبێت، بە تایبەتی لە سەر دامەزراوەکانی سەپاندنی یاسا و کۆنترۆڵکردنی سنوور. بازرگانی نایاسایی لە سەر بەرتیل بەڕێوە دەچێت. وەسڵی گەندەڵ و نایاسایی هەر بە خۆیان دروستی دەکەن بە تایبەتی کاتێ سەرمایە بۆ بازرگانی نایاسایی تر دابین دەکەن لە سەرانسەری جیهان. ئەمەش نرخی سەرمایە کەم دەکاتەوە بۆ ئەم جۆرە پیشەسازیانە و پرۆسەی گەشەی سەرمایەش دەسووتێنێت بۆ بازرگانی یاسایی.

پارە گواستنەوە پرۆسەیەکە بۆ لاساییکردنەوەی داهاتی نارەوا بۆ ئەوەی وای لێ بکرێت خۆی بە رەوا نیشان بدات. خەملاندنەکانی قەبارەی فەندی گواستنەوەکان لە ١٢٠ ملیار دۆلارەوە دەبێتە ٥٠٠ ملیار دۆلار لە هەر ساڵێکدا. گەلێ میتۆد هەیە ئێستا بەکار دێن، بەڵام یەک تەکنیکی گشتی گواستنەوەی فەندە بۆ ئەو وڵاتانەی کە ڕێگە بە بانکەکان دەدەن ناسنامەی خەوێنەرەکان بشارنەوە. دواجار ئەو فەندانە دەگوازرێنەوە بۆ نێو بانکی نێودەوڵەتی و لە بازاڕی جیهانیشدا کاری پێ دەکرێت. داوا نووسین زەحمەتە چونکە پارە گوێزەرەوە پێشکەوتووەکان دەتوانن بە شێوەیەکی یاسایی بەرپەرچی بدەنەوە لە ڕێگەی گۆڕینی تاکتیکەکانیان. بۆ نموونە، گەلێ یاسا هەیە داوای ئەوە دەکات کە دامەزراوە داراییەکان دەبێ هەشیار بن لە ئەسڵی نایاسایی ئەو فەندانەی وەری دەگرن. لەوەڵامدا، پارە گوێزەرەوەکان هەنگاوی زیاتر دەهاوێژن بۆ شاردنەوەی ئەسڵی فەندەکانیان.

ڕێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڤیەننا دژی گواستنەوەی مادده سڕکەرەکان و ئەو ماددانەی کاریگەرییان هەیە لە سەر مێشک، بەکار برا لە ساڵی ١٩٨٨ و ١٩٩٠، هەروەها ڕێکەوتننامەی ئەنجوومەنی ئەوروپا لە سەر گواستنەوە و پشکنین و گرتن و دەست بەسەرا گرتنی هەوڵەکانی تاوان ڕێکەوتننامەی سەرەکی نێودەوڵەتین. ڕێکەوتننامەی ڤیەننا داوا لە وڵاتان دەکات پارە گواستنەوە لە ڕێگەی مامەڵەی تلیاکەوە بە تاوان دابنێن. یەکێتی ئەوروپاش لە ساڵی ١٩٩١ فەرمانێکی ئاڕاستەی ئەندامانی خۆی کرد بۆ ئەوەی چەند دامەزراوێکی تایبەت بە ڕەوشی دارایی دامەزرێنن بۆ قەدەغە کردنی گواستنەوەی پارە بە شێوەیەکی نایاسایی. "



هێزی کاری ئەرکەکانی دارایی" کە یەکێکە لە دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان و ،لە ساڵی ١٩٨٩ دامەزاروە، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵی خۆی داوە بۆ کۆنترۆڵکردنی گواستنەوەی پارە. نوێنەری هەیە لە چەندین شوێن وەک لە OECD و هۆنگ کۆنگ و سەنغافوڕا و وڵاتانی کەنداو و کۆمیسیۆنی ئەوروپی (ibid). لەم ساڵانەی دواییدا، نزیکەی پەنجا یاسای نوێ دەرچوو دژی پارە گواستنەوە بە شێوەیەکی نایاسایی. لە ئەمریکای باکووردا، ویلایەتە یەکگرتووەکان یاسایەکی گشتی دەرکردووە لە ساڵی ١٩٨٦ دواتر لە کەنەدا و مەکسیکیش ئەو یاسایە پەیڕەو کرا. وڵاتانی ئەوروپی تەنها جەختی کردەوە لە سەر پارە گواستنەوە چونکە زۆر کاریگەری هەیە لە سەر قاچاغی مادده سڕکەرەکان. بەڵام، گەلێ وڵاتی تر پەیوەندی کردووە بە هەوڵەکانی ئەمریکای باکوور بۆ قەدەغە کردنی پارە گواستنەوە بە شێوەیەک کە کاریگەری خراپی هەبێت لە سەر بوارەکانی ژیان بە تایبەتی بەرتیل و گەندەڵی. لە هەموو ئەو یاسایانە بە کێشەترین توخم ئەو داواکاریەیە کە دامەزراوی دارایی دەبوایە پشتگیری بنەڕەتی فەندەکانی بکردایە. هەرچەندە ئەو داوایە بەهێزتر بێت ئەوا ئەوەندە ئاسانتر دەبێت بۆ بانک بەرگری لەخۆی بکات. ئاشکرایە، لە بەرژەوەندی دیپۆزیتەرەکاندایە بۆ شاردنەوەی بنەڕەتی فەندەکان، هەروەها لە بەرژەوەندی دامەزراوە داراییەکەشدایە بۆ کردنی چەند پرسیارێکی.

سەرەڕای زیاد بوونی بەرژەوەندیە نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکان لە کۆنترۆڵدا، کێشەکە جدی تر دەبێت. پارە گواستنەوە دەبێتە بەشێکی بچووک لە " بەهەشتەکانی دارایی" و هەندێ سەرهەڵدانی ئابووری بازاڕ. کارەکە هەر تەنها ئەوە نییە وڵاتانی پێشکەوتوو دوور بخەیەوە لە کاری خراپ. هەڵمەتێکی جدی نێودەوڵەتی دژی بەدکاران، بە سویسڕاشەوە، زۆر زۆر گرینگە. لەم مەسەلەیەدا بەرپرسە گەندەڵەکان لە وڵاتێکدا دەتوانن دەسکەوتەکانیان بشارنەوە لە وڵاتێکی تردا و ئەگەری چالاکییەکانی پارە گواستنەوەش بشارنەوە، ئەمەش متمانەی پێکهاتەی دارایی کەم دەکاتەوە. بەڵام، کۆنترۆڵەکانی پارە گواستنەوە تەنها یاسای نێگەتیڤن. بە هیچ شێوەیەک وەگەڕخستن لە وڵاتانی هەژاردا زۆر ناکەن. ئەوەندە کاریگەریان نابێت تاوەکو لەگەڵ هەوڵی تری ڕاستەوخۆ تێکەڵ نەکرێن بۆ چاککردن و باشترکردنی

بەرپرسیارێتی و کاروبارەکانی حکومەت.

هەوڵە نێودەوڵەتییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی بازرگانییە نایاساییەکان دووەم ئیختیارە لە گرینگیدا. گەر گەندەڵی تێکەڵ بکرێت لەگەڵ تاوانی ڕێکخراو، کێشەکە بۆ ڕکخراوە هاوکاریە نێودەوڵەتییەکان زۆر زەحمەتە. گەر تەواوی دەوڵەتێک کاس بوو بە تاوان، ئەوا هیچ ڕێکخراوێکی دەرەوە ناتوانێت شتێک بکات جگە لە چاوەڕێ کردن و هیوا بخوازن ڕەوشەکە باشتر بێت. لە حاڵەتەکانی تردا، ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو لە جەنگ دژی تاوانی ڕێکخراو ڕەنگە زۆر بەسوود بن. لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، بە تایبەتی ئەوانەی کە ڕانەهاتوون لە شەڕکردن دژی تاوانی ڕێکخراو، یەکەم هەنگاوی بەسوود و باش دەبێت خول و یاساکانی چاکسازی تێک هەڵبکێشرێن بۆ کار کردن. بەڵام ئەو جۆرە چاکسازییەش بەس نییە تاوەکو ئابووری بەهێز و پێشبڕکێکار نەبێت. ڕەنگە لەو کاتەدا دەوڵەت پێویستی بە هەوڵی زیاتر و ڕاستەوخۆتر بێت بۆ کەمکردنەوەی دەسکەوتەکانی قازانجی نایاسایی لە لایەن بازرگانە چاوچنۆکەکان لە نێو بازرگانە ڕەواکان.

یەکێک لە ڕێگە چارەکان پێشخستنی سەرمایەی بازرگانییەکی شەرعییە کە دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕۆحی پێشبڕکێ لە نێوان کۆمپانیا زەبەلاحەکان، لە هەندێ وڵاتدا ئەم ڕێگە چارەیە یارمەتی سەپاندنی یاسا دەدات. بۆ نموونە، ئەم ستراتیژیەتە کاریگەری تاوانی ڕێکخراو کەم دەکاتەوە و نرخی فڕێدانی زبڵی دابەزاند بۆ بازرگانەکان کە لە لایەن بەشی پاککردنەوە ئەنجام نەدرا. لە ساڵی ١٩٩٥دا نرخی فڕێدانی زبڵ لە ١,٥ ملیۆن دۆلار گەیشتە ٤٠٠ ملیۆن دۆلار لە ڕێگەی گەندەڵییەوە، هەروەها لەو ساڵانەی دواییدا هەر بە هۆی گەندەڵییەوە نرخی فڕێدانی زبڵ لە سەدا ٣٠ بووە سەدا ٤٠, .

لینکی وڵاتێک بۆ جیهانی دەرەوە یان ئەوەتا ڕێژەی تاوانی ڕێکخراو زیاد دەکات یانیش سنووردار دەکا. لە لایەکەوە، ڕژێمێکی کراوە لە ڕووی بازرگانی و وەگەڕخستنەوە دەبێتە ڕێگە خۆشکەری بەرتیل و تاوانی پلان بۆ داڕێژراو. وجوودی ئەو بانکانە کە تیایاندا پارەی ڕەش بەکاردەهێنرێت لە چالاکی تاوان لە سەر ئاستی ناوخۆ، لە بەر ئەوەیە کە پارە زۆر بە ئاسانی لە دەرەوە دەشاردرێتەوە. لە لایەکی



ترەوە، سنووری کراوە دەبێتە ڕێگە خۆش کردن بۆ وەگەڕخستن لە جیهانی دەرەوەی وڵات. گەر ئەو بێگانانە بەشێک نەبن لە دەستەی تاوانی ناوخۆ، هەروەها تێکەڵ نەبن لەگەڵ ئەو جۆرە گروپانە لە هەر شوێنێک بن، ئەوا ڕەنگە بەرەنگاری گروپە ڕکابەرەکان ببنەوە. بێگومان، گەر ئەو جۆرە وەگەڕخستنانە ترسناک و گران بەها بن، ئەوا ژمارەیەکی کەمیان هەوڵ دەدەن، بەڵام کراوەیی وڵاتێک بۆ وەگەڕخستنی دەرەوە بە لایەنی کەم وایان لێ دەکات بیر بکەنەوە، بیریان فراوان دەبێت.

یەکێک لە ڕۆڵەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ئاژانسەکانی سەپاندنی یاسا لە نێو وڵاتانی پێشکەوتوو کۆکردنەوەی زانیارییە لە سەر مامەڵە گومانلێکراوەکان و ئاوێتە کردنی ئەو زانیارییانەیە لەگەڵ داواکاری بازرگان و ڕێکخراوەکانە کە لە نێو وڵاتانی پێشکەوتوو بنکەیان دامەزراندووە بۆ ئەوەی کاری بازرگانی بکەن لە نێو ئەو وڵاتانەدا. بۆ نموونە، کارێکی ئاساییە بۆ بەراورد کردنی نرخی بەرهەمی ئاسایی لە بازرگانی نێودەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ نرخە ئاساییەکانی هەمان بەرهەم کە لە نێو بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکان تۆمار کراوە لەگەڵ چەند وڵاتێکی دیاریکراو. ئەو داتایەش ئەو ڕێگایە خۆش دەکات بۆ چاودێری کردنی وەسڵەکان و هەروەها لە لایەن دەسەڵاتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەکارهێنراوە بۆ هەوڵی لێپێچینەوەی ڕاستەوخۆ. بە شێوەیەکی ئاشکرا، لادانەکانی نرخ ناتوانن هیچ شتێک بسەلمێنن، بەڵام دەتوانن خاڵێ دەست پێکردن دابین بکەن بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر و چڕتر. ئەو داتایانە دەتوانن سەرپێچی یاساکانی گومرگ و باجی ویلایەتە یەکگرتووەکان دیاری بکەن، شان بە شانی یاساکانی وڵاتەکانی دەرەوە. دەتوانن ئەوە دیاری بکەن کە لە چ شوێنێک پارە بە شێوەیەکی نایاسایی دەگوازرێتەوە لە ڕێگای کالاّ بازرگانییە نرخ بەرزەکان. ئەو داتا و هەوڵ و کۆششە دەبێ فراوان بکرێت و تۆمارەکانی بازرگانیش بگرێتەوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی تر، هەروها دەتوانن ڕێگایەک بە وڵاتانی پێشکەوتوو نیشان بدەن بۆ یارمەتیدانی وڵاتە هەژارەکان و کۆنترۆڵی گواستنەوە نایاساییەکانی فەند و کۆنترۆڵی تەزویری باج و گومرگ بکەن.

کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتی تاوانە نێودەوڵەتییەکان پرسێکی گرینگە، بەڵام پەند و

وانەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە هەوڵێکی دادپەروەری بۆ تاوان و گەندەڵی هەوڵێکە بە پێی پێویست نییە. سنووردار کردنی پارە گواستنەوە و کۆنترۆڵکردنی بازرگانییە نایاساییەکان بە ئاشکرا پێویستییان بە هاریکاری نێودەوڵەتی هەیە، بەڵام ئەو هەوڵانە خۆیان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نابێت لە سەر ئاستی گەندەڵی گەر پاڵنەرەکان زۆر بن نەک لە ڕێگەی چالاکی بازرگانی نایاسایی، بەڵکو لە ڕێگەی سوودەکانی کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت.

## دامەزراوە نوێیە نێودەوڵەتییەکان

گەر دەستپێشخەرییە نێودەوڵەتییەکان بەرهەمی هەبێت، ئەوا کێشەی جێبەجێ کردن دەبێ زۆر بە جدی وەربگیرێت. چاکسازی وڵاتێک، وەک بەڵێنی نەبوونی بەرتیل و نەبوونی فروفێڵ لە پرۆسەی کڕین، ڕەنگە پێویستی بە دەستەیەکی دەرەکی بێت بۆ چارەسەر کردنی مشتومڕەکان. بۆیە ئایدیای داداگایەکی نێودەوڵەتی زۆر پێویست و گرینگە. لە دامەزراندنی دامەزراوێکی گشتی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان، هەندێ کێشەی تر هەیە بۆ بڕیاری ستاندارد و سەلماندنی کارەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ ڕێگە هەن لە نێو چوارچێوەی نێودەوڵەتی کە ڕەنگە ئایدیایان هەبێت لە بارەی چۆنییەتی بەردەوامبوونی کارەکان.

بۆ نموونە، سەنتەری نێودەوڵەتی سەر بە گروپی بانگی جیهانی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی وەگەڕخستن ICSID لە ژێر کاریگەری ئیختیارەکانی دامەزراوێک کێشەکان چارەسەر دەکات. ICSID لیژنەکان چوون شێوە ڕەسمی دادگا نین، هەروەها بەکارهێنانیان دەوەستێتە سەر ڕازیبوونی پێشتری حیزبەکان، بەڵام جار جارە مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسانە دەکەن کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەیوەندی بە گەندەڵییەوە هەیە. ئەو پرۆسەیە چەند کۆسپێکی لە بەردەمە چونکە میکانیزمی پێداچوونەوە کەم و کوڕی هەیە و هەندێ جاریش شێوازێکی تەکنیکی و فەرمی وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کێشانە ڕەنگە تا ڕادەیەکی زۆر توند نەبن لەم ساڵانەی دواییدا. ICSID هیچ یاسایەکی بەر گوێ نەکەوتووە لە سەر ئەم کێشانە. هەروەها پرۆسەیەکە پارە و کاتێکی زۆریشی دەوێت، سەرەڕای ئەوەش ناتوانێت لە



یەک کاتدا چەند کێشەیەک چارەسەر بکات. چاکسازی جدی دەبێ پێشتر داوا بکرێت، پێش ئەوەی ببێتە بەشێک لە هەوڵە گشتییەکانی دژە گەندەڵی.

لە ساڵی ١٩٩٣دا، بانکی جیهانی لیژنەیەکی پشکنینی سەربەخۆی دامەزراند کە یاریدەدەرێکی ترە بۆ میکانیزمی چارەسەر کردنی کێشە نێودەوڵەتییەکان. بە پێچەوانەی ICSID کە تەنها بۆ ئەو لایەنانە کراوەتەوە کە مشتومڕیان هەیە لەسەر گرێبەستێک، لیژنەکە بە سەر سکاڵاکانی ئەو کەس و گروپە تایبەتییانەی وڵاتێک قەرزیان وەرگرتووە داچۆوە. گروپەکان دەبێ ئەوە ڕابگەیەنن کە ئەوان دەناڵێنن لە ژێر ئەو هەڵسوکەوتە چەوتەی بانکی جیهانی کە بە سەر سیاسەت و ڕێنماییەکانی خۆیدا ناچێتەوە. بۆیە شتێکی ئاساییە گەر لیژنەکە گوێ لەو سکاڵایانەش بگرێت کە لە سەر گەندەڵی پرۆژەکانی بانکی جیهانی خۆی. بۆ نموونە، ڕەنگە لیژنەکە ئەو سکاڵایانە لە بەرچاوبگرێت کە باسی ئەوە دەکەن بانک ڕەچاوی سیاسەت و ڕێنماییەکان ناکات گەر خۆی سەرپەرشتی بەڵگەکانی گەندەڵی بکات. بە هەقیقەت، ڕەنگە گەندەڵی لە پاڵ هەندێ لەو حاڵەتانە ئەنجام درابێت کە بەم دواییانە هاتنە نێو مەیدانەکەوە. بە داخەوە، لیژنەکە ئالیەتێکی بێهێزە. دەسەڵاتی لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەی نییە تاوەکو پرس بە دەستەی بەڕێوەبەرانی بانک نەکات، بەڵکو تەنها دەسەڵاتی ڕاوێژکاری هەیە. هەرچی پێشنیارێک بکات دەچێتەوە بەردەم دەستەی بەڕێوەبەرانی بانک ئینجا بڕیاری کۆتایی لە سەر دەدرێت، هەروەها ئەو شتانەی کە لیژنەکە خۆی دەیاندۆزێتەوە ئاشکرا ناکرێت. لە کۆی ١٠ قەزیە کە لە ساڵی ١٩٩٧ دا هاتە بەردەم لیژنەکە، لیژنەکە دوو قەزیەی ڕەت کردەوە و پێشنیاریشی کرد کە لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوە لەگەڵ سیانیان ئەنجام بدرێت. لەو پێنجەشی کە مانەوە، دەستەی بەڕێوەبەرانی بانک تەنها بۆ یەک قەزیە تەواو پشتگیری لیژنەکەی کرد، ئەگینا بۆ ئەوانی تر هیچ نەکرا. کەم و کوڕی و خەوشەکانی لیژنەکە لە قەزیەی پرۆژەی دروستکردنی سەددەی " یاسریتا" لە سەر سنووری ئەرژەنتین و پاراگوای ئاشکرا بوون. یەکێک لە جێگرەکانی سەرۆکی بانکی جیهانی باسی یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی لیژنەکە دەکات گوایە بە باشە باسی کارەکانی بانک دەکات، دواتر ئەو ڕاپۆرتە دزەی کردە نێو ڕۆژنامەوانی و دەرکەوت کە ڕاپۆرتێکی ڕەخنەییە دژی کارەکانی بانکی جیهانی. بۆیە دەبێ ئەم سیستەمە بەهێزتر بکرێت و دەسەڵاتی

زیاتری پێ بدرێت پێش ئەوەی ببێتە بەشێکی جدی لە نێو ئەگێندەی ڕژێمی داهاتوو، تەنانەت هەرچەند لە فۆرمی هەنووکەییشدا دەتوانێت کێشەکان لە سیستەمی قەرز بەخشینی بانکدا دیاری بکات.

ئەزموونی لیژنەکە لە مامەڵە کردن لەگەڵ سکاڵاکانی هاوڵاتییان و ڕێکخراوە غەیرە سوودمەندەکان هەنگاوێکی بەرایی و بەسوودە. ئەم لیژنەیە یەکەم دەستەی نێودەوڵەتییە تیایدا ئەو تاکانەی کە پەیوەندییان نییە لەگەڵ ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەتوانن هەوڵی دامەزراندنی ئەو پەیوەندییە بدەن. دوای شیکردنەوەی ئەو سکاڵایانەی کە لیژنەکە پێی گەیشت دەربارەی پرۆژەی دروستکردنی سەددەی " ئارونی سێیەم" لە نیپاڵ، پسپۆر دانیال برادلۆ گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە لیژنەکە دەتوانێت یارمەتی پاراستنی بەرژەوەندی ئەو کەسانە بدات کە کاریگەری پرۆژەکانی "بانکی جیهانی"یان لە سەرە، بەڵام برادلۆ زیاتر باسی لێڵی و جۆرە شاراوەیییەک دەکات لە پەیوەندی نێوان لیژنەکە و دەستەی بەڕێوەبردن و بەڕێوەبەرانی بانکەکە. داواکاری سەرەکی و ئەو داوایەی کە هەمیشە بۆ دامەزراوێکی نوێ زۆر پێویستە دڵنیا کردنەوەی ئەوەیە کە لیژنەکە سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و کاروبارەکانی ڕوون و شەفاف بێت بۆ چاودێرانی دەرەوە.

داداگایی نموونەیی هەن لە بواری مافەکانی مرۆڤ و پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی کرێکار و وزەی ناوکی. ڕێکخراوە ناحکومییەکان (NGOs) دەتوانن سکاڵاکان بخەنە بەردەم ئەو دادگایانە و بەشداری بکەن لە دۆزینەوەی بەڵگە لە سەر ئەو سکاڵایانە. هەریەک لەو دەستە و دامەزراوانە کێشەی تایبەتی خۆیان هەیە، هیچ یەکێکیان نموونەیەکی تەواو نییە لە ڕووی هەوڵەکانی دژە گەندەڵیدا . لەگەڵ ئەوەشدا، بە دڵنیاییەوە ئەوە دەخەنە ڕوو کە چۆن NGO کان دەتوانن ڕۆڵێکی بونیاتنەری بگێڕن لە پێداچوونەوەی پرۆسە نێودەوڵەتییەکاندا .

بەدیلی ئەمەش، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەتوانێت دەزگایەک دامەزرێنێت بۆ پێداچوونەوەی ئەو قەزیانەی کە گومانی گەندەڵییان لێ دەکرێت لە تایبەتمەندێتی و پرۆسەی گرێبەست، هەروەها لە ڕووی بەڵێنی نەبوونی بەرتیلیشەوە. ئەو قەزیانەی کە لە لایەن مەزاتکەرە بێ ئومێدەکان یاخود قەرز بەخشە ساختەچییەکانەوە



دەهێنرێت وا لە دەوڵەت دەکات کە سیستەمێکی شەفاف بۆ هەڵسوکەوتەکانی دابنێت. پارێزەرەکان پێویستییان بەوە نییە ئەو بەرتیلانەی کە دراوە بخەنە نێو دۆکیومێنتێکەوە. بەڵکو دەبێ زیاتر جەخت لە سەر چۆنییەتی ئەنجامدانی مامەڵەکە بکەنەوە. گەر بێت و بە شێوەیەکی ئەوتۆ دوور بخرێتەوە لەو پرۆسە ڕاستگۆیەی کە بەرهەم دێنێت، ئەوا دادگا داوای ئەوە دەکات کە پرۆژەکە دووبارە عەرز بکرێتەوە. یەکێک لەو ئاستەنگانەی کە دەبێتە هۆی زەحمەت بە گەڕخستنی پرۆژەکە ئەوەیە کە دووبارەکردنەوەی عەرزەکە پرۆسەیەکی شەفاف نابێت و ڕووی ڕاستەقینەی ئەوەی یەکەم ناخاتە ڕوو. هەموو بەشداران زانیاری نوێیان هەیە لە ئەنجامی خولی عەرزی یەکەم کە کاردەکاتە سەر هەڵسوکەوتیان لە خولی عەرزی دووەم. قوتابیان لەبواری پرۆسەکانی مەزات کردن پێویستە لایەنە ستراتیژییەکانی ئەم پرۆپۆزەلە بە هەشیاری شی بکەنەوە بۆ ئەوەی نەهێڵن سیستەمێکی نایەکسانتر و پڕ لە فرۆفێڵ دروست بێتەوە.

کێشەیەکی جدی تر لە دادگای نێودەوڵەتیدا دڵنیا بوونەوەی گوێگرتنە بۆ بڕیارەکانی. یەکێک لە ئیختیارەکان بەکارهێنانی ئاستی ئابووری ڕێکخراوی بازرگانی جیهانییە (WTO). سوودی یاساکانی WTO ئەوەیە کە لە لایەن خۆی ناسەپێنرێن بەڵکو لە لایەن لایەنەکانی بازرگانی هەر وڵاتێکەوە دەسەپێنرێن. WTO حوکمی پەیوەندی نێو نەتەوەکان دەکات، نەک نێوان تاک و بازرگانەکان. بۆیە، بەرتیلی نێودەوڵەتی دەکرێ کۆنترۆڵ بکرێت لە ڕێگەی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بە شێوەیەکی کردەیی نەک هەر تەنها بە ناو. بێگومان پرۆسەیەکی نێودەوڵەتی لەم جۆرە دەبێتە هۆی سست بوونی پێشڤەچوونی پرۆژەکانی وەگەڕخستن و تایبەتمەندێتی. یەکەم، ئەو پرۆسەیە کارێکی وەها خراپ نابێت. گەر بێت و مامەڵەیەکی ناوەوە ببێتە ئەمرێکی حەتمی ئەوا دەوڵەت دەبێ تایبەتمەندێتی دوا بخات چونکە چاودێری کردنی کۆمپانیایەکی حکومی زۆر ئاسانترە لە چاودێری کردنی کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەت. بە هەمان شێوە، سەرکردە گەندەڵەکان ڕەنگە بەرنامە دابرێژن بۆ پرۆژە کارێکی حکومی بە نیازی بەرتیل، نەک بە نیازی پێشخستنی ڕەوشی ئابووری وڵات. دووەم، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ڕەنگە پشتگیری

کولفەی کاریک بکەن کە ولاتە پێشەکەوتووەکان لە ڕێگەی بەرەنگار بوونەوەی ئەو کولفەیە سەرکەوتن بەدەست دێن. سێیەم، وەک پرۆسەی سوێندی WTO، بەشداریکردن بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە دەبێت بەو یاسایانەی کە سنووردارن بۆ ئەو ولاتانەی کە مەرجەکانی WTO جێبەجێ دەکەن یاخود ئەو ئارەزوومەندانەیە سیستەمێک دادەمەزرێنێت بۆ جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی نەبوونی بەرتیل لە بەرابەر ئامۆژگاریە تەکنیکیەکانی UNDP یا بانکی جیهانی و پشتگیریەکانی تر. پرۆپۆزەلەکان بۆ ئالیەتی چارەسەر کردنی کێشەیەکی نێودەوڵەتی نموونەیەکن لەو بنەما گشتییانەی کە ئالیەت و دەرگا لە بەردەم دۆڕاوەکان والا دەکات بۆ ئەوەی سکالا بنووسن دژی ئەوانەی گەندەڵی دەکەن و هۆی دۆڕانی ئەوانن، ئیتر ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ جەنگی دژی گەندەڵی.

کۆمەڵگای بازرگانی نێودەوڵەتی ئێستا دەست دەکات بە دانپیانان بە زیانەکانی گەندەڵی لە نێو کەش و هەوای پرۆسەی وەگەڕخستنی جیهانی. هەرکە ئەو دان پیانانەش ڕاست دەرچوو ئەوا هەوڵی ڕێگە چارەیەکی تر خۆی دەسەپێنێت. بازرگانە نێودەوڵەتییەکان خۆیان دەتوانن فەند و هاوکاری تەکنیکی دابین بکەن بۆ ئەو ولاتانەی کە بەرەو پیلی چاکسازییەوە دەچن. ئەم هەوڵەش پێشتر دراوە لە ڕێگەی کۆمەڵە پرۆفێشناڵەکانەوە وەک کۆمەڵەی باری ئەمریکی، بەلام ڕێکخراوە هاریکارییەکان ڕەنگە بگەڕێن بە دوای پرۆژە هاریکارییەکاندا.

## دەرەنجامەکان

## پراکتیس و چاکسازی سیاسی

خەمی ئێستای گەندەڵی هەمان هەوڵە کۆنەکان دووبارە دەکاتەوە. هەوڵی چاکخوازەکان لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا زیادی کردووە و هەندێ جار ئەو هەولانە بەرەو چاکسازییەکی ڕاستەقینە هەنگاویان ناوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پسپۆرە پلە بەرزەکان تازە هەستیان بەوە کردووە کە جەختکردنەوە لە سەر سیاسەتی پێشخستنی ئابووری و پرۆژەکانی دەوڵەمەند کردنی ژێرخانی ئابووری بەس نین



تەنانەت هەندێ جار بوونەتە بەربەستیش لە بەردەم ئەو پێشکەوتنانە. گەر دامەزراوە بیرۆکراتی و سیاسییەکانی ولاتێک بێهێز بن، هەروەها گەر بازاڕ بە شێوەیەکی زۆر خراپ کار بکات، ئەوا هاریکاری پێشڤەچوون هەرگیز سەرناکەوێت و بەرهەمی باشیشی نابێت.

ڕێکخراوە هاریکاری و قەرزبەخشە نێودەوڵەتییەکان هەنگاوە بەراییەکانیان ناوە بەرەو چاکسازی. گەندەڵی هیچی تر تابوو و بابەتێکی قەدەغەکراو نییە. هەندێ لە پرۆژەکانی بانکی جیهانی لە بەر بەڵگەی گەندەڵی پاشەکشێیان کردووە، هەرچەندە ئەمە بە شێوەیەکی گشتی و بە بێ ڕاگەیاندن بوو. IMF داوا لەو ولاتانە دەکات کە دەیانەوێ چارەسەرێک بدۆزنەوە و گەندەڵی کەم بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، گومان هەر ماوە لە بارەی قووڵی ئەو پابەندبوونانە. هەوڵێکی جدی بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو بابەتە پێویستی بە چەندین ڕووبەڕوو بوونەوە هەیە لەگەڵ قەرز وەرگر و بەخشەکان کە کۆمپانیاکانیان لە نێو ولاتانی پێشکەوتوودا بەرتیل دەدەن. ئاستەنگەکانی بانکی جیهانی زۆر ئاسانە بۆ تێگەیشتن لە دۆکیومێنتی سیاسی خۆی کە ناوی "یارمەتیدانی ولاتان لە جەنگی دژی گەندەڵی"یە. هیچ ولاتێک نییە بە تەنها ناوی هاتبێت لەو دۆکیومێنتە بەڵکو دەبێ هەموو ولاتێک پابەند بن بە پرۆسەی چاکسازی. ئێستا گۆڕان ناکرێت تاوەکو ولاتان دان بە کێشەکەدا نەنێن و بە ڕێگایەک خەمی لێ بخۆن کە نەبێتە هۆی کارێکی سیحراوی و خەیاڵی، بەڵکو بە ئاسانی چارەسەری بکەن. زۆرجار هەڵمەتەکانی دژە گەندەڵی لە سەرچاوەی حەزی ئەوانەوە ڕوو دەدات کە لە سەر دەسەلاتن و دەیانەوێت ڕکابەرەکانیان بە لا وەنێن.

وێڕای ئەمەش، بانکی جیهانی پێویستی بەوە نییە کارێک بکات لە سەر بنچینەی ئەوەی کە دەبێ لە هەموو ولاتێک بەکار بێت، هەندێ شت هەیە لە هەندێ ولات جێبەجێ نابێت. بۆ نموونە، کەلتوور و مێژوو هەروەها بارودۆخە هەنووکەییەکانی کۆمەلایەتی و ئابووری کار دەکەنە سەر سروشتی کێشەکە و جۆری چارەسەرەکانیان. ئەم کتێبە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زۆر پەند و وانە هەن تێگەیشتنی ڕیشەیی پاڵنەرە ئابووریەکانن کە دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین. ئەو وانە و پەندانەش لە هەموو شوێنێک جێبەجێ نابن، واتە بۆ هەموو ولاتێک سوودی

وەک یەک نییە، بەڵام دەبێ زۆر بە ژیرانە و هەستیارانە بەکاربهێنرێن لە هەر وڵاتێکدا. پرۆپۆزەلەکانی ئێستای بانکی جیهانی ڕەنگدانەوەی ئەو بۆچوونەن. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا بانکی جیهانی سیاسەتە چاڵاکەکەی جێبەجێ دەکات یاخود دەبێتە مایەی سەرنجی ڕەخنەگران و هەموو کەسێک لە ڕێگەی مرومۆچی دەمو چاویانەوە بە سەر ئەو سیاسەتە دەنەڕێنن!

هەمان گومان دەکرێ سەرهەڵ بدات دەربارەی ڕێکەوتنەکان لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی یان هەرێمی. ڕێکەوتننامەی OAS یاخود OECD دەستپێکێکی باشە. بەڵام دەبێ چاودێری و لێپێچینەوە هەبێت لەو دوو ڕێکەوتننامەیە و دامەزراوەکانی سەپاندنی یاسا ڕۆڵی کاریگەری خۆیان ببینن لە ڕێگە دان بەو کەسانەی کە دەیانەوێ سکاڵا بنووسن لە دژی ئەو کەسانەی کە گەندەڵن. ئەگەر وا نەبێت، ئەوا دۆکیومێنتە نێودەوڵەتییەکان دەبنە بەشێک لە قسە و هیوا.

## مەرجە ناوخۆییەکان بۆ چاکسازی

ئایدیا و پابەندبوونە ئەخلاقییەکان مایەی سەرنجن. هەندێ چاکسازی زۆر بە ئاسانی ڕوو دەدات چونکە سەرکردەیەکی بە ڕێز و حورمەت لە پاڵ ئەو چاکسازییە دەبێت. سەرکردە بەهێزەکان دەتوانن زیاتر وا لە خەڵک بکەن کە چاکسازی گەورە پەسەند بکەن لەچاو کەسایەتییەکانی تر کە هەرگیز ناتوانن ئەو کارە بکەن. بەڵام سەرکردایەتی بەهێز بە شێوەیەکی گشتی پێویستییەکە نەک هۆیەک بۆ گۆڕانی سیاسی بێت. ئەزموونەکانی پێشتر هەست بەخۆکردنی بە کەمی دروست دەکەن. کارکردن بە شێوازی جاران هەمیشە ئاسانترین کارە لە بەرئەوەی سوودمەندان و گەندەڵکاران هەمیشە دژی گۆڕانن لە کار کردن بە شێوازێکی نوێ دەوەستنەوە. ئەو بڕیارە سەقەتانەی ئێستا دەدرێن دەبنە هۆی سەقەتکردنی کارەکانی داهاتوو بە بەردەوامی. بەڵام، هەرچەندە مێژوو پێو ودانگەکان دەسەپێنێت، زۆر بە دەگمەن دەرەنجامێکی تایبەتی لێ دەکەوێتەوە. ڕووبەڕوو بوونەوەکە فاکتەرە پێکهاتەییەکانە جگە لە سەرکردەی لێهاتوو کە بارودۆخێکی گونجاو دەخولقێنێت بۆ چاکسازی.

ئێمە ئێستا ئەزموونێکی تەواومان هەیە لە سەر هەوڵەکانی چاکسازی لە



سەرانسەری جیهان بۆ ئەوەی ڕێگە بە خۆمان بدەین چی تێڕامانێک لەم بارەیەوە بکەین. گفتوگۆی ئەم بەشە باس لەوە دەکات کە وڵاتانی پێشکەوتوو و وڵاتانی ئینتیقالی لە سۆشیالیزم دەتوانن فێر بن لە ئەزموونە مێژووییەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو شان بە شانی ئەزموونی ئەو وڵاتانەی بەم دواییە هاتوونەتە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە. بێگومان، هەر وڵاتە و دەبێ بە پێی هەلومەرجی خۆی بتوانێت سوود لەو پەند و وانانە وەربگرێت، بەڵام هەندێ مەسەلەی ئابووری و سیاسی هەیە بە تەواوی فۆرمێکی جیهانیان وەرگرتووە و خاڵی هاوبەشن لە نێو هەموو وڵاتاندا.

دوو شێوازی بنەڕەتی هەیە بۆ پرۆسەی چاکسازی: یەکێکیان دەوەستێتە سەر پیادە کردنی دەسەڵاتی سیاسی و ئەوەکەی تر دەوەستێتە سەر شێوازی کۆبوونەوە و ڕای گشتی. ئەوانەی کە لە سەرەنجامی چاکسازیدا زەرەر دەکەن دەکرێ بە زۆری دەنگ پشت گوێ بخرێن یانیش ئەوەتا کەسب بکرێن و لە ڕێگەی قەرەبوو کردنەوە وایا لێ بکرێت گۆڕان پەسەند بکەن. بۆ نموونە، لە بەریتانیا لە ساڵانی ١٩٨٠ دا، حکومەتی مارگرێت تاتچەری سەرۆک وەزیران چەند چاکسازییەکی ئیداری کرد لە ڕێگەی ستراتیژیەتێکی ململانێداردا. لە ئوستوڕاڵیا ڕۆبێرت هاواکی سەرۆک وەزیران داوای کۆبوونەوەیەکی گشتی کرد. بڕیاری هەرە سەرەکی ئەو کۆبوونەوەیە بۆ چاکخوازان ئەوەبوو کە کێ لە نێو هاوپەیمانێتییەکە دابێت و "کێ" ش ناچار بکرێت زەرەرەکانی چاکسازی پەسەند بکات. ئایا یەکێک بەرپرسە گەندەڵەکان و کەسایەتییە تایبەتییەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان بکڕێتەوە، یان یەکێک هەموو ئەو کارە گەندەڵانە لە ڕێگەی سیستەمی چاکسازیەوە سەرکوت بکات؟ تا چ ڕادەیەک ئامانجەکانی چاکسازی دەستە بەر دەکرێن لە ڕێگەی پرۆسەی هێنانە کایەی هاوپەیمانێتیەک بۆ پشتگیری کردنی گۆڕان؟

بە کێشەی بەرهەمهێنانی هاوپەیمانێتییەکی سیاسی دەست پێ دەکەم. دەبێ بەرپرسە دەسەڵاتدارەکان بگەنە ئەو قەناعەتەی کە چاکسازی لە بەرژەوەندی ئەواندایە. ئەو قەناعەتەش زۆرجار دروست دەبێت لە وەڵامدانەوەی فشارەکان لە لایەن گروپە تایبەتی و دەسەڵاتدارەکان کە بڕیار دەدەن چاکسازی مەبەستی بەرپرسە سیاسییە گەورەکانە. لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا، فشاری گشتی چاکسازی

دروست دەکات، بەڵام تەنانەت ئۆتۆکراتەکانیش دەتوانن ڕووبەڕووی پاڵنەرە سیاسییەکان ببنەوە بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی. هەر کارێک تا خراپ نەبێت، چاک نابێتەوە، بۆیە هەرکاتێ قەیرانی ئابووری یان فەزاعەتێکی ئەوتۆی گەندەڵی ڕووی دا ئەوا باشترین کاتە بۆ سەپاندنی بنەماکانی چاکسازی. ئەو جۆرە ڕووداوە ئاگرخۆشکەرانە ڕەنگە زۆرجار نەبنە هۆی گۆڕانی بونیاتنەر و لە ڕووی پارەشەوە زۆر گران بوەستن، بەڵام دەتوانن هاوپەیمانێتیەک بۆ ئەنجامدانی چاکسازی ڕێک بخەن. هەردووک قەبارەی ڕەها و ڕێژەیی حکومەت هۆکاری سەرەکین کە کاریگەرییان هەیە لە سەر سوود و زیانەکانی چاکسازی بۆ گروپە جۆراوجۆرەکان.

چاکسازی هەمیشە ناچێتە چوارچێوەی بە دامەزراو بوونەوە. گەر ئەو هەل و مەرجە سیاسیانەی کە چاکسازی بەرهەم دێنن نەمێنن ئەوا چاکسازیش نامێنێت. بەڵام لە هەندێ بارودۆخدا، چاکسازی هەر بەردەوام دەبێت سەرەڕای نەبوونی گۆڕانێکی گرینگی سیاسی. بەڵام، هەندێ جار چاکسازی ئەوەندە زەحمەت دەبێت دەگاتە ڕادەی مەحاڵ! دواجار کێشەکە لێرەدا ئەوەیە دەبێ پاڵ بە سیستەمەکەوە بنرێت بەرەو گۆڕان بچێت بە بێ دەستبەردار بوونی خاڵە بەهێزەکانی سیستەمە کۆنەکە. جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە کە ئەزموونی مێژوویی هەندێ حاڵەتی پێشنیارکراومان بۆ دەستەبەر دەکات.

## پێکهاتەی سیاسی و چاکسازی

لە ڕووی واقیعەوە، چاکسازی ڕوونادات تاوەکو گروپ و تاکی دەسەڵاتدار لە ناوەوە و دەرەوەی حکومەت پشتگیری نەکەن. لە وڵاتە دیموکراسییەکاندا، هاوپەیمانێتییەکی سیاسی دەبێ ئەو پشتگیریە لە پێنا گۆڕان بەرەو پێشەوە ببات. لە وڵاتە ئۆتۆکراتیەکاندا، هەندێ جار سەرکردە لە ژێر فشاری چاکخوازان دایە لە بواری سەربازی و پشکەکانی نێو کەرتی تایبەتدا. هەر دەوڵەتێک تا سەر ئێسقان گەندەڵی تیا بێت ئەوا دوور نییە بارودۆخی بکەوێتە مەترسیەوە بەهۆی داگیرکردنی یانیش دروست بوونی شەڕی ناوخۆ تیایدا. سەیری خێرا لە ناوچوونی " مۆبۆتۆ سێس سیکۆ" ی سەرۆکی زایر بکە کە هەر زۆر بە خێرایی بەدیلێک خۆی قووت کردەوە.



بەڵام هۆیەکە هۆیەکی بازنەیی بوو. هەڕەشە و ترسی لە دەستدانی دەسەڵات وا لە بەرپرس و سەرۆک دەکات گەندەڵتر بێت تاوەکو هەموو ژیانی خۆی زۆر بە چاکی دابین بکات چونکە ڕۆژێک دادێت لە سەر کار نامێنێت. سەرکردەی گەندەڵ وا دەزانێت چاکسازی کارێکی مەترسیدارە گەر ببێتە هۆی دروستبوونی هێزی ئۆپۆزیسیۆن و ڕژێمی هەنووکەیی تێکوپێک بشکێنێت. بۆیە چاکخوازی سەرکەوتوو ئەو چاکخوازەیە کە پێش هەموو شتێ ڕکابەرە بەهێزەکان بکڕێتەوە. هەروەها چاکخوازان پێویستە خەمێک دەربارەی دەرەنجامەکانی چاکسازیەکەش بخۆن. گەر چاکسازیەکە بە هەشیاری بەڕێوە نەچێت، ئەوا ڕەنگە سوودمەندانی قۆناغی یەکەمی چاکسازیەکە ببنە ڕکابەر لە قۆناغە گشتییەکانی تر.

## دیموکراسی و چاکسازی

هەروەکو پێشتر زانیمان کە گەندەڵی دەتوانێت لەگەڵ بەرپرسە گەورە هەڵبژێراوەکاندا بژیت. بەڵام، حکومەتە دیموکراتە گەندەڵەکان هەندێ جار دەتوانن چاکسازی بکەن. لە سەدەی نۆزدەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و گەلێ حکومەتە شارستانییە ئەمریکییەکان چاکسازییان کرد لە سیستەمەکانی پرۆسەی کڕین و دامەزراندنی کارمەند. هەندێ لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین بە پێکهاتە دیموکراسییەکانیانەوە ماوەی چاکسازیشیان هەبووە. پێکهاتە دیموکراسیەکان دەتوانن بە پێی هەندێ هەل و مەرج، نەک هەموو هەل و مەرجێک، چاکسازی پێش بخەن.

دەنگدان بە سیستەمەکان و چاکسازی: ئەمریکای لاتین: کارەکەی (١٩٩١-١٩٩٤) " باربارا گێدس" لە سەر چاکسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە وڵاتە دیموکراسیەکانی ئەمریکای لاتیندا خاڵێکی زۆر بە سوود دەخاتە بەردەست بۆ دەستپێکردن. وا دانێ کە بەرپرسە سیاسی و حیزبیەکان دەیانەوێت هەر لە دەسەڵاتدا بمێننەوە. ڕەنگە دواجار دووچاری کێشەیەک ببنەوە کە " گێدس" پێی دەڵێت " سەدمەی سیاسی"، هەروەها هەموو وڵات لە سەر بنچینەی

واستەكاریەوە سوود وەردەگرێت، بەڵام هیچ بەرپرسێكی سیاسی یان حیزبی نادۆزیتەوە هەڵسێت بە دامەزراندنی سیستەمێكی سوود بەخش بۆ هەموو لایەک چونكە گیرفانی هەموو بەرپرسە سیاسی و حیزبیەكان گەرمە و كەس نییە خەمێک لە گیرفانە بەتاڵەكان بخوات! خاڵی گۆڕان لێرەدا ئەوەیە، گەر هەر یەكێک ئەمەی بینی ئەوا با دەنگی خۆی بۆ لایەنی ئۆپۆزیسیۆن بدات كە هیچ سوودێكی سیاسی نەبینیوە لە ڕێگەی گەندەڵییەوە. " گێدس"، باسەكەی قووڵ دەكاتەوە و دەڵێت " حاڵەتێک هەیە هەموو دەنگدەران دان بە سوودی چاكسازی دا دەنێن". هەر بەرپرسێكی سیاسی كە پاڵپشتی چاكسازی دەكات پشتگیری سیاسی بەدەست دێنێت كە ئەمەش هاوسەنگییەكە دژی زیانەكان كە لە كەمبوونەوەی واستەكاری و گەندەڵییەوە سەرچاوەی گرتووە. ئاشكرایە، حیزبێكی كەمینە، كە هیوایەكی كەمی هەیە ببێتە بەشێک لە حكومەتی داهاتوو، زۆر بە ئاسانی پشتگیری چاكسازی دەكات لە چاو ئەو حیزبە زۆرینەیەی كە هەمیشە بەشێكی گەورەیە لە حكومەت. زۆرینە، كە پەیوەندیەكی كەمی هەیە بە واستەكاری و گەندەڵی، كەمێک پشتگیری بۆ چاكسازی لە دەست دەدات. بە هەقیقەت، ڕەنگە زۆرینە تووشی هاودژیەک ببێتەوە. گەر پشتی چاكسازیەكە بەهێز بێت و ببێتە هۆی بردنەوەی هەڵبژاردنی داهاتوو، ئەوا ئەو هەقیقەتە ڕەنگە وا لە چاكخواز بكات زۆر بە جدی كارەكانی نەكات! هەركە حیزبێک دەسەڵاتی گرتە دەست ئەوا بەڵێنەكانی پێشێل دەكات و جێبەجێیان ناكات، ئاكامی ئەوەش دەنگدەران باوەڕ بە بەڵێنەكانی دواتر ناكەن و بە هیچ شێوەیەک گوێ لەو جۆرە بەڵێنانە ناگرن لە داهاتوودا.

هەرچەندە " گێدس" جەخت دەكاتەوە لە سەر چاكسازی ئیداری، كەچی قسەكانی دەچێتەوە سەر لایەنەكانی تری گەندەڵی و ستراتیژیەتەكانی تری چاكسازی. بۆ نموونە، چاكسازی لە سیستەمەكانی كڕین و چاككردن لە حكومەتێكی شەفاف و كراوە خاڵی هاوبەشیان هەیە لەگەڵ چاكسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەكاندا. ئەوانەی جڵەوی دەسەڵاتیان لە دەستە سوود لە پرۆسە نهێنییەكانی حكومەت و گرێبەستە لا بە لاكان وەردەگرن، بەڵام وا پیشان دەدەن كە شەرعیەتی كەرتی تایبەت بە شێوەیەكی گشتی چاكسازی تیا كراوە. گەلێ لە سیاسەتەكانی دژە گەندەڵی



كولفە دەسەپێنن بە سەر گروپی سیاسی كە ئەوانەی هەمیشە لەگەڵ گۆڕانن دەبێ باج بدەن! تا ئاژاوەگێڕان پشتیان بەهێزتر بێت ئەوا هەمیشە یەک هەیە باجی ئەو ئاژاوانە بدات. چاكسازی ئیداری لە لایەن ئەو كەسانەی كە پاڵپشتی گۆڕان دەكەن سەردەكەوێت، بەڵام ئەمەش هاوسەنگ دەكرێت واتە لە بەرابەر هەڵوێستیاندا زیانی پێ دەكەوێت لە ڕێگەی گەندەڵییەوە.

گێدس پێشنیاری ئەوە دەكات كە كەسایەتییە سیاسییەكان و بەرپرسە حیزبییەكان لە ئەمریكای لاتیندا دان بە سەدمەی چاكسازی دادەنێن. لە شیكردنەوەكانی گێدسدا ئەوە بەدی دەكەیت كە لە دوو بارودۆخدا چاكسازی ڕێگەی تێ دەچێت: یەكەمیان، تاكە حیزبێكی باڵا دەست، كە كاروباری حكومەتی بە تەواوی كۆنترۆڵ كردووە، بتوانێت هەڕەشە لە بەرپرسەكانی خۆی بكات بۆ چارەسەر كردنی گەندەڵی لە پێناو مانەوە لە سەر دەسەڵات. دواتر دەتوانێت پشتگیری تەواوی چاكسازی بكات سەرەڕای ئەوەی زیان بە چەند بەرپرسێكی حكومی دەگەیەنێت. تەنانەت گەر لە هەڵبژاردنەكانیش هەمان حیزب هەڵبژێرنەوە بۆ دەسەڵات ئەوا ئەو دەسەڵاتە كاریگەرییەكی ئەوتۆی دەبێت لە سەر حیزبی حاكم. دووەمیان، گەر چەند حیزبێک یەكتری بگرنەوە لە ڕووی چاودێری كردنی حكومەتەوە هەروەها گەر سوودێكی زۆر لە چاكسازی ببینن ئەوا ڕەنگە هاریكاری یەكتر دەكەن بۆ گۆڕانێكی شەرعی. وڵاتانی وەک كۆڵۆمبیا و ئۆرۆگوای و ڤێنزوێلا باشترین نموونەن لە سەر چاكسازی. ئەو وڵاتانە هاوسەنگیان دروست كرد لە نێوان چاكسازی و چاودێری و كۆنترۆڵكردنی حكومەت. خاڵێكی تر لە كۆڵۆمبیا زیاتر كاریگەری هەبوو لە سەر جێبەجێ كردنی چاكسازی ئەویش توندوتیژی پارتیزانی بوو كە هەڕەشەی لە چوارچێوەی دیموكراسی كرد. ئیتر وای لێ هات بەرژەوەندی هەموو بەرپرسەكانی ئەو وڵاتە لە چاكسازیدا بوو بۆ ئەوەی ئەو توندوتیژیە بوەستێت. نەک هەر گێدس بەڵكو بگرە نووسەرەكانی تریش ئەو لایەنانەی چاكسازییان بەدی كردووە لە دەرەوەی ئەمریكای لاتیندا. بۆ نموونە، لە ژێر چەند هەلومەرجێكی كەمتر كاریگەرتردا، لە نیوزلەندا توانی چاكسازی لە حكومەتی خۆیدا بكات لە هەشتاكان لە ڕووی فشارە ئابوورییەكانەوە كە ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی سنووردار كرد بۆ گۆڕان.

چاکسازی لە حکومەتێکەوە دەستی پێکرد و لە لایەن یەکێکی ترەوە کۆتایی پێهات.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، هاوسەنگی نێوان حیزبە سیاسییەکان بەس نییە. بەربەستێکی هەرە سەرەکی لە بەردەم چاکسازی سروشتی شەخسی و تاکە کەسی نێو سیاسەتە. هەرچەند ئەو سروشتەش بەهێزتر و گەورەتر بێت ئەوەندە جێبەجێ کردنی چاکسازی زەحمەتتر دەبێت. گێدس تانوپۆی ئەوە دەکات کە دەنگدانی داخراو بۆ نوێنەران لە کۆلۆمبیا و ئۆرۆگوای ململانێکان سنووردار دەکەن لە نێوان کەسایەتییە سیاسییەکان و حیزبە سیاسییەکان. لە لیستی داخراودا، حیزب جەخت لە سەر کاندیدەکان دەکاتەوە لە سەر سندوقی دەنگدان. لە لیستی کراوەدا، فەرمانی هەڵبژاردنی کاندید لە لایەن دەنگدەرانەوە یەک لایی دەکرێتەوە نەک تەنها حیزب. بۆیە دەبێ حیزبەکان ڕکابەری یەکتری بکەن. لە سیستەمێکی لیستی کراوەدا چاودێری کردن و کۆنترۆڵ زەحمەتە لابرێت چونکە سوودی تاکە کەسی بۆ دەنگدەران و کرێکارانی هەڵمەت گێڕان زۆر بە زەقی دیار دەبێت. بە هەقیقەت، ئەو دوو سیستەمەی کە چاکسازییان تیادا نەکراوە، "بەڕازیل و چیلی"ن هەردووکیشیان سیستەمی لیستی کراوەیان هەیە. حکومەتە هاوپەیمانێتییەکان لە چیلی ، کە ئەندامەکانیان چەند خاڵێکی هاوبەشیان هەیە، هەموویان پێکەوە لە سەر کۆنترۆڵکردنی کاروبارەکانی حکومەت کاریان کردووە.

کارەکەی گێدس بەرەو دوو ئەنجامی بنەڕەتیمان دەبات. یەکەم، " دیموکراسی" یە کە ئەمەش زۆر گشتییە کاتێ بەکاری دەهێنین بۆ شیکردنەوەی چاکسازی. وردەکاری سیستەمی هەڵبژاردن و بە تایبەتیش پاڵنەرە سیاسییەکان بۆ لە بەرچاو گرتنی بەها گشتییەکان زۆر گرینگە. هەروەک گێدس ئاماژەی بۆ دەکات کە کارێکی هاودژی یەک دەکەین گەر چاکسازی بکەین لە سەر یەکسانی و باشتر کردنی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە هەمان کاتدا ئەو کارە لە لایەن نوێنەرانی دامەزراوەکانەوە لە بار ببرێت لە پێناو ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندیەکانی لایەنگران. هەردوو فاکتەرەکە بەندن بە یەکەوە. سروشتی سیستەمی دەنگدان کاریگەری هەیە لە سەر جۆری ئەو حیزبە سیاسیانەی کە دەتوانن بمێننەوە.

دووەم، هەر چاکسازیەک بەرهەمی هەلومەرجێکی سیاسی کاتی شلۆق بێت ئەوا



ئەو جۆرە چاکسازییەکی زۆر ناسک و بوودەڵە دەبێت. حیزب لە پێناو بەرژەوەندی سیاسی دەتوانێت چاکسازی بەرهەم بهێنێت، بەڵام تەنها بە یەک ڕێگە دەتوانن بەردەوام بن گەر بەرابەر بوونی حیزب خاسیەتێکی بەردەوامی سیستەمەکە بێت. جارێکی دیکە سیستەمی دەنگدان خۆی یارمەتی ماوەی پەراوێزی سیاسی دەدات. پارچە پارچە بوونی کۆمەڵگا و ڕەنگدانەوەیان لە سەر پێکهاتەی حکومەت کار لە ماوەی چاکسازی دەکات. بۆ ئەوەی بەردەوام بێت، یەکەم هەنگاوی چاکسازی دەبێ جێبەجێ بکرێت بۆ سەرنج ڕاکێشانی لایەنگران کە دەتوانن بەردەوامی بە سەرکەوتن ببەخشن. گەر سەیرێکی مێژووی چاکسازی بکەین لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا، ئەوا دەتوانین تیشکی زیاتر بخەینە سەر ئەو مەسەلەیە.

## چاکسازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەدا

توێژینەوەکان لە سەر چاکسازی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەدا کارەکەی گێدس لە ئەمریکای لاتین تەواو دەکەن. دوو مەسەلە لە ئارادا هەن: یەکەم، بۆچی چاکسازی ڕووی دا، دووەم، چۆن بەردەوام بوو؟

جەخت کردنەوەکەی گێدس لە سەر هاوسەنگی هێزە سیاسییەکان ئاشنایە بە هەردوو وڵات. لە کاتێکدا چاکسازی ڕووی دا، هەردوو حیزب هاوسەنگ بوون لە سەر دەسەڵات لە هەموو ڕووێکەوە. هیچ گروپێکی سیاسی سوودمەند نەبوو لە کۆنترۆڵکردنی کارەکانی حکومەت، هەر هەموو گروپەکانیش سوودیان وەرگرت لە چاکسازی. سیستەمی پەرلەمانی بەریتانی بە بنەما حیزبیە بەهێزەکەیەوە بواری سوودی تاکە کەسی سنووردار کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەسەی نوێنەرایەتی قەزایەکی بکردایە دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو تا بازرگانی لە ڕێگەی پۆستەکەیەوە بکات. زۆربوونی ژمارەی دەنگدەران لە سەدەی نۆزدەدا و نەهێشتنی گەلێ لایەنگیری بچووک سوودەکانی گەندەڵی و دەسەڵاتی باڵای کەم کردەوە.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا پرەنسیپی حیزب سەرنەکەوت، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ سست بوونی چاکسازی، بە هەقیقەت، چاکسازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان

درەنگتر دەستی پێکرد لەوەی لە بەریتانیا. سەرۆک ئەندرو جاکسن سیستەمێکی چاودێری دانا بۆ بەخشینی پاداشت بە لایەنگران. ئەو پێی وابوو کە سیستەمێکی لەم جۆرە دەتوانێت بەرەنگاری گەندەڵی بێتەوە لە نێو خزمەتگوزاری حکومەتە دیموکراسیەکان و بەرپرسە پارە خۆرەکان لە ناو دەبات. بە پێچەوانەوە گەندەڵی جدی تر گەشەی کرد. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، حیزبێکی سیاسی هاوپەیمانی کە سەرۆک " چێستەر ئارسەر" ی تیا بوو هاوکاری حکومەتی فیدراڵی کرد لە سەر ڕێڕەوەی دامەزراندنی سیستەمی پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری مەدەنی.

هەردوو وڵات ئەو گرژوگۆڵیانە دەخەنە ڕوو کە سەرهەڵدەدەن کاتێ هەندێ لە دەنگدەران گرینگی بە لێهاتوویی و یەکسانی لە دابینکردنی خزمەتگوزارییەکان دەدەن لە لایەن دەوڵەتەوە، هەروەها کاتێ هەندێ لە دەنگدەرانی تر تەنها خەمی " کار" یانە و کاریان دەوێ. دوو جۆرە گرژوگۆڵ هەن: بەخشینی " کار" بە حکومەت دەکرێ ببێتە زیانێکی سیاسی لە بری ئەوەی ببێتە سوودێک، هەروەها مامەڵە کردن لەگەڵ ململانێ لە نێوان ئەو دەنگدەرانەی کە " کار" یان دەوێ و ئەوانەشی کە خزمەتگوزارییەکی باشیان دەوێت، ئەمەش کارێکی زەحمەتە. گەر جۆری خزمەتگوزاری حکومەت بەرچاو بێت لە نێو مێشکی دەنگدەر و کەسایەتی سیاسی ، ئەوا یاسادانەر و وەزارەتەکانی کابینە گومانیان لە سوودە سیاسییەکان لە لا دروست دەبێت کە لە چاودێری و کۆنترۆڵەوە سەرچاوەیان گرتووە.

لە ویلایەتە یەککگرتووەکان و بەریتانیادا، کەسایەتییە سیاسییەکان ناڕەزاییان دەربڕی دەربارەی ئەوەی چەند " کات وزە" سەرف دەکەن لەگەڵ ئەوانەی بە دوای کاردا دەگەڕێن. گەر ژمارەی کارەکان بە خێرایی زیاد نەکەن، ئەوا گەلێ لەوانەی بە دوای کارێکدا دەگەڕێن بێ ئومێد دەبن. ژمارەی بێ ئومێدان و بێکاران و خێزانەکانیان بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیاتر دەبێت لە ژمارەی ئەوانەی لە ژێر چاودێری حکومەتدا کار دەکەن. تەنانەت ئەوانەی بەدوای کارێکدا دەگەڕێن سەرکەوتوو بن و کارێکیان دەست کەوێت ئەوا بیر لەوە دەکەنەوە کە دەبوایە کارێکی باشتریان بە دەست کەوتبوایە. بەخشینی پرۆسەی چاودێری بە یەکێک دەبێتە هۆی سەرچاوەی جاڕس بوون نەوەک سەرچاوەی سوود. بۆ نموونە، سەرۆکی حیزبی کۆماری لە



پێنسلڤانیا ناڕەزایی لە سەر ئەوە دەربڕی کە لە بەر زۆری ژمارەی هاوڕێیانی تووشی گرفتێکی جدی بووە ئەویش نەیدەزانی کامەیان ڕاسپێرێت. نە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و نە بەریتانیاش ئەزموونیان هەبووە لە سەر قازانجێکی لە ناکاوی داهات لە ماوەی چاکسازیدا، تاوەکو پێو و دانگە دارایییەکان و دابەشکردنی کارەکان لە ڕووی سیاسییەوە پارەیەکی زۆری بوێت. بارودۆخێکی وەک ئەوەی ڤێنزوێلا هاودژیەکی بەسوودمان دەخاتە بەردەست. لە ڤێنزوێلا سوودەکانی قازانجی نەوت هەوڵەکانی چاکسازییان خستە پەراوێزەوە کاتێ دەوڵەت بەردەوام دەبێت لە سەر بە کرێگرتنی کارمەندان. لە وڵاتانی تردا ئەو جۆرە سیاسەتانە پێویستییان بە ژمارەیەکی زۆری کارمەندان هەیە لە نێو کەرتی تایبەتدا بۆ ستافی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دەوڵەت. قەبارەی کەرتی حکومی کولفەی سیاسی چاودێری دەهێنێتە خوارەوە، کاتێ کولفە ئابووریەکانی زیاد دەکات.

چاکخوازە سیاسییەکان لە ئەمریکا و ئینگلتەڕا پاڵپشتییەکی بەهێزی بازرگانییان وەگەڕ خست لە پێناو خزمەتگوزاری مەدەنی بە شێوەیەکی باشتر. بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی سەدەی نۆزدەهەم پۆست ئۆفیسێکی دەویست بۆ گواستنەوەی پۆستەکان بە باشی، هەروەها دەیانویست کاڵای خۆیان بە خێرایی بە گومرگدا تێپەڕێت. ڕەنگە ئامادە بن پارە بدەن بە وەکیلەکانی گومرگ بۆ ئەوەی بە خێرایی کارەکانی ڕایی بکرێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوان سیستەمێکیان پێ باشە کە ئەم جۆرە بەرتیلانەی تیا نەبێت. لە ویلایەتە یەککگرتووەکاندا، بە شێوەیەکی گشتی بازرگانی پشتگیری چاکسازی کرد. بازرگانان ڕەنگە بەرگەی ئاستێکی ئاسایی بەرتیل بگرن، بەڵام دەست دەکەن بە ناڕەزایی گەر لەو ئاستە تێپەڕی، هەروەکو ڕووی دا لە سەدەی نۆزدەدا. یەکێک لە نووسەرەکان باسی ئەوە دەکات کە چاکسازی شارستانی لە ویلایەتە یەککگرتووەکان پاڵێکی پێوەنرا کاتێ ئاستەکان لە سەدا ١٠ وە زیادی کرد بۆ لە سەدا ٣٠ لە ڕووی بەهای گرێبەست و سوودەکانەوە. لە وڵاتانی پێشکەوتوو و ئینتیقالیدا بازرگانانەکان هەمان ناڕەزایی ئەم سەردەمەیان دەربڕیوە. بۆ نموونە، لە بەڕازیل، هۆی خێرایی ڕووخانی سەرۆک " کۆلەر" بڕیارەکەی خۆی بوو لە سەر زیاد کردنی " کۆمیسیۆنەکان" لە ڕێژەیی ئاسایی خۆی

سەدا ١٥ لە ژێر ڕژێمەکەی پێشتر بۆ لە سەدا ٤٠

لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، هۆیەکی تر بۆ چاکسازی سەرچاوەی گرتبوو لە پێکهاتەی فیدراڵی حکومەت. کەسایەتییە فیدراڵیەکان پشتگیری چاکسازییان کرد چونکە چاودێری و کۆنترۆڵکردن لە لایەن دەوڵەت و سەرۆکی حیزبە مەحەلیەکان زۆر بە هێز بوو کە بەرژەوەندیەکانیان بە شێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ کەسایەتییە فیدراڵیەکاندا نەبوو. بۆیە، لە لایەکەوە، ئەو کارانەی کە لە لایەن ئەندامانی کۆنگرێسەوە کۆنترۆڵ کرا بوو لە ڕووی بڵاوبوونەوەدا زۆر بە کولفە بوون، هەروەها، لە لایەکی ترەوە، کارە کۆنترۆڵکراوەکان لە نێو قەزاکانی وڵاتی خۆیان لە ژێر کۆنترۆڵی مەحەلیدا بوو و هەندێ سوودیشی هەبوو. فیدراڵیزم ئەنجامی باشی لێ کەوتەوە بۆ چاکسازی نەتەوەیی چونکە ڕێگایەک بوو بۆ کەسایەتییە سیاسییە نەتەوەییەکان بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ڕکابەرەکان لە ئاستە نزمەکانی حکومەتدا.

بە کورتی، کولفەی تەرخانکردنی کار و گرێبەستەکان لە ڕێگای چاودێری و پارەدانەوە ڕەنگە سوودەکان بە لاوە نێ بۆ سەرکردە سیاسییەکان. لە وڵاتێکی دیموکراسیدا، پێویست ناکات هەموو کەس پشتگیری چاکسازی بکات، چاکسازی جێبەجێ دەکرێت گەر ژمارەیەکی زۆری دەنگدەران درک بە سوودی چاکسازی بکەن. چاکسازی لە نێو حکومەتدا دەبێ بە یاساکانی دەنگدانەوە بێت کە دەسەڵاتی بەرپرس سنووردار دەکات لە سوود وەرگرتن لە چاودێری کردن و هەروەها لەو سیستەمانەی کە دەسەڵات هاوسەنگ دەکرێت لە نێو گروپە سیاسییەکاندا. بە تایبەتی، لە سیستەمی ڕێژەیی نوێنەرایەتی، لیستی داخراو باشترە لە لیستی کراوە، هەموو شتێکی تر یەکسانن. پێکهاتەی حوکمێکی فرەیی کە دوو حیزبی بەهێز بەرهەم دێنێت دەتوانێت چاکسازی سانا بکات گەر حکومەتێکی سەقامگیر و جێگیر پێک بێنێت. کۆمەڵێک کێشەی سیاسی کارێکی باشە بۆ چاکسازی چونکە هاوڵاتیان زۆر بە ئاسانی دەتوانن بەرپرسیارێتییەکە بخەنە ئەستۆی حکومەت. بەڵام، سەرەڕای نەبوونی حیزبی بەهێز چاکسازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا کرا لە سەدەی نۆزدەدا. وجوودی تایبەتمەندێتی سەرۆکێکی هەڵبژێردراو کە موعەرەزو بۆ



فشاری هێزی دەنگدەر یارمەتی دەر بوو، بەڵام بەشێک لە ڕوونکردنەوەکە پێ دەچێت زۆر گرینگ بوو بۆ دەنگدەران و کۆمپانیا بازرگانییەکان کە لە سەر دابینکردنی خزمەتگوزاری پێشبڕکێ دەکەن.

## چاکخوازە ئۆتۆکراتەکان

ئەو وڵاتانەی کە حوکمی ئۆتۆکراتیان تیادا هەیە یان حیزبێکی باڵا دەست دەتوانێت بە حەسانەی خۆیشیەوە گەندەڵ بێت، بەڵام هەندێ جار چاکخوازان بەرهەم دێن وەکو سەرۆکی وڵاتێک. هەرچەندە سەرنجدەرانی دەرەوە ڕەنگە سیاسەتێکی دیموکراسییان پێ باشتر بێت، شتێکی عەبەسییانە نییە گەر وا دانێی کە ئەو جۆرە حاکمانە زۆر لە خەمی ئەوە دان گەندەڵی کەم بکەنەوە و گەشە پێش بخەن. بە هەقیقەت، سەرکردەیەکی دز لە نێو حکومەت حەز بەوە دەکات کۆنترۆڵی هەموو دام و دەزگاکان بکات. بۆیە ستراتیژیەکانی ئەم چاکسازییە لە لایەن حوکمی ئۆتۆکراتییەوە پشتگیری دەکرێن.

بۆ نموونە، ئەو چاکسازییانەی کە دەبنە هۆی باشتر بوونی توانای دەوڵەت بۆ کۆکردنەوەی داهات بەهۆی سنووردار کردنی مامەڵە گەندەڵەکانی بەرپرسە فەرعییەکان دەبێ بە شێوەیەکی کاریگەر ئاشنا بکرێن بە بەرپرسە بەرزەکان. چاکسازی گومرگ و باج پشتگیری دەکرا لە لایەن ئەم جۆرە حاکمە ئۆتۆکراتییانە وەک فێردیناند مارکۆس لە فلیپین، هەروەها سوهارتۆ لە ئەندەنووسیا. سوهارتۆ گرێبەستێکی کرد لەگەڵ کۆمپانیایەکی سویسری بۆ ئەوەی زاڵ بن بەسەر خزمەتگوزاری ئەندەنوسیا، ئەمە بووە هۆی بڕینی نانی بەرپرسە گەندەڵە مەحەلیەکان، بە لایەنی کەم بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. لە زایر، جارێک بانکی جیهانی قەرزی فەندێکی بەخشی لە پێناو هەوڵی چاکسازی گومرگ و کۆکردنەوەی باج. لە مەکسیک، ئیدارەی "سالیناس" چاکسازییەکی چڕ وپڕی کرد لە سیستەمی باج بە پاڵپشتییەکی بەهێزی سەرۆک.

بەڵام ئایا گەشەی ئابووری زۆر دەبێت کاتێ ئەو حاکمەی کە بەرپرسیارێتیەکی کەمی لە ئەستۆیە و سیستەمی کۆکردنەوەی داهات پێش دەخات؟ ڕژێمێکی

سەربازی هەمیشە ئامێری زیاتر دەکرێت بۆ بەهێز کردنی هێزی سەربازی. ڕەنگە ئۆتۆکراتێکیش وێڵ بێت بە دوای پرۆژە سەرمایەداریە گرانەکان کە بکرێت ببێتە سەرچاوەیەک بۆ دەستمایە. قەزیەکەی وڵاتی زایر ئەو کێشەیە ڕوون دەکاتەوە. ئەو هەوڵانەی بۆ کۆکردنەوەی باج لە ئارادابوو کەم و کوڕی هەبوو لە ڕووی شەرعیەتەوە چونکە حکومەت زۆری سەرف کرد لە سەر پرۆژەکان کە بەڵێنی سوودێکی کەمی گەشەپێدانی دابوو. لە ساڵانی ١٩٩٠ و ١٩٩١ دا وڵات پلانی دانا بۆ دەسەڵاتێکی فراوانی ئائابووری و بودجەیەکی زۆری دانا بۆ کۆنفرانسی لووتکەی " فرانک فۆن" و هەروەها بۆنەیەکی نەتەوەیی. هەروەها بانکی جیهانیش زۆر لە خەمی ئەوەدا بوو کە بودجەیەکی زۆر سەرف بکرێت لە پای هیچ واتە لە خەمی گەندەڵیدا بوو. پرۆژەی بانکی جیهانی نەیتوانی شێوازەکانی ئەرک و باج کۆکردنەوە بگۆڕێت. هەوڵێکی بەرایی سەرکەوتوو بۆ لابردنی ئەو حاڵەتانە زوو باوی نەما، هەروەها هەموو کۆمپیوتەر و فایلەکانیش لەناوبران. پرۆژەکە سەرکەوتوو نەبوو لە دانان و پێشخستنی کادرێکی پرۆفێشناڵی باج کۆکردنەوە. لە بری ئەوە، دەرفەتی خۆی دروست کرد بۆ گەڕان بە دوای دەسکەوتی شەخسیدا.

چاکسازییەکی هاوشێوەی ئەمە لە پرۆسەی کڕیندا ڕوودەدات. بەرپرسی پلە نزم ڕەنگە زانیاری ناوەوەی پرۆسەی مەزاتکردن بفرۆشێت، هەروەها هەموو شتێک ڕێک دەخات بۆ ئەو مەزاتکەرەی کە دەباتەوە لە پێناو بەرتیلدا. هەموو جۆرە سەرکردەیەک دەیەوێ ئەو جۆرە بەرتیلانە کەم بکاتەوە جگە لەو حاڵەتەی کە نیازی خراپی ئەو بەرپرسانە بکرێنەوە. بەڵام لە حکومەتی دزاندا (Kleptocracy)، کەم کردنەوەی گەندەڵی لە نێو بەرپرسە پلە نزمەکاندا زۆر بە ئاسانی دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەو گەندەڵییەی کە لە بچووکەکانەوە بەرەو گەورەکان دەکشێت. سوودەکانی چاکسازی بۆ وڵات ئێجگار زۆر دەبێت گەر کەس سەیری هیچی تر نەکات جگە لە کەمکردنەوەی گەندەڵی لە نێو بەرپرسە پلە نزمەکاندا. سەرەنجامی کەمبوونەوەی بەرپرسە بچووکە گەندەڵەکان یەکسانە بە کەمبوونەوەی شەهیەی بەرپرسە حکومیە دزەکان لە فراوانکردنی قەبارەی حکومەت. گەر چاکسازی بە شێوەیەکی سەرکەوتوو کرا لە نێو بەرپرسە بچووکەکان ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت دەست بخرێتە نێو ئاستە بەرزەکانیش.



بە کورتی. ئەو چاکسازیانەی کە کاروبارەکانی دەوڵەتێکی پڕ لە دز باشتردەکات دەبێتە کارێکی دژە بەرهەم بۆ هاوڵاتیانی ئاسایی گەر تەنها ڕێگە بە سەرکردەکان بدەن سوودەکان کەم بکەنەوە بەهۆی گوشینی بەرپرسە بچووکە گەندەڵەکان. هەر بەرپرسێکی گەندەڵ لە نێو دەوڵەتدا کاروباری بازرگانی بەڕێوە ببات هەوڵ دەدات زۆرترین سوود بە دەست بێنێت لە ڕێگەی گەندەڵیەوە و هەموو بەرهەمێکیش بۆ خۆی قۆرخ بکات، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی تردا بەرپرسی گەندەڵ بۆی ناچێتە سەر، ئیتر دەست دەکات بە دروست کردنی بەربەست لە بەردەم پرۆژەکان لە پێناو دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ سوودی تایبەتی خۆی.

بەڵام هەندێ جار ئۆتۆکراتەکان هەوڵی ڕاستەقینە دەدەن بۆ بەدەستهێنانی چاکسازی وەک ئالیەتێک بۆ بەهێز کردن و پێدانی شەرعیەت بە دەسەڵاتی خۆیان. نموونەش لە سەر ئەمە، " پروسیا لە سەدەی نۆزدەدا، هەروەها " ڤارگاس" لە بەرازیل و " فوجیمۆری" لە پیرۆ و " لی" لە سەنغافورا و " مەسڤێنی" لە ئۆگەندا و هەروەها ژمارەیەک لە حکومەتەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات. گەلێ لەو چاکخوازانە بە شێوەیەکی ڕەسمی هەڵبژێردران، بەڵام دەسەڵاتیان لە سەرکردەیەکی هەڵبژێردراو زیاتر بەکارهێنا لە دژی چەند مەرجێکی پێشبڕکێ کاریدا، هەروەها زۆرجار هیچ ئاوڕێکیان لە مافی هاوڵاتیان نەدەدایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پابەند بوونیان بە پاککردنەوەی حکومەت زۆر بە کارێکی ڕاستەقینە دەچوو نەک هەر تەنها داپۆشین و کۆکردنەوەی سامانیان بێت. خەمی ئەوان هەر گوشینی دەسکەوت نییە لە سەر ئاستی بەرپرسە پلە نزمەکاندا بەڵکو خەمی گەورەی ئەوان دابین کردنی باشترین جۆری خزمەتگوزارییە بە هاوڵاتیان.

دەکرێ چەند مەبەستێکی سیاسی لە پاڵ هەڵمەتەکانی دژە گەندەڵیدا هەبن کە ئەو مەبەستانەش دەبنە هۆی ئیفلیج بوونی هەوڵەکان بۆ گەشەپێدانی ڕژێمێکی سیاسی پێشبڕکێ کار لەو وڵاتانەی کە پێکهاتەی دیموکراسی تەنها بە ناویان هەیە. بۆ نموونە، یەکێک لە دیراسەکانی سیاسەتی مەکسیکیدا تان وپۆی ئەوە دەکات کە هەڕەشەی کوشتن و بڕین و لە سێدارەدان بەکار هێنراوە بۆ قەدەغەکردنی ئەوانەی کە لە ژێر دەستی حیزبی باڵا دەست ڕا دەکەن. تەنانەت ئەوانەشی کە حکومەت جێ دەهێڵن و دەچنە نێو کەرتی تایبەتەوە هەر لە ژێر چاودێریدان نەوەک لە ڕێگەی ئەو

مەنسەبەی کە لە نێو حکومەتدا هەیان بووە چەند کارێکی تری پێوە بکەن. لە ئیتاڵیا، ئەوەی زانیاری هەبێت لە سەر ئەو کەسەی کە لەگەڵی کار دەکات ئەوا ئەو زانیاریە سەرچاوەی دەسەڵاتە. یەکێک لە دیراسەکان گەیشتووە بەم ئەنجامە " هەڕەشە و گاڵتەجاڕی بووەتە فۆرمێکی نادیاری چیمەنتۆ بۆ ئەو چینە سیاسییەی کە لە بەرابەر پێکەوە ژیانی بە زۆری سەرکۆنە دەکرێن" یاساکانی دژە گەندەڵی نەک هەر بەربەستن بۆ خودی گەندەڵی بەڵکو بەربەستن لە بەردەم بە واقیعی بوونی حوکمی گروپ و گەشەی گروپی موعارەزەی بەهێز.

بەکارهێنانی دروشمی دژە گەندەڵی وەک ئالیەتێک بۆ پاککردنەوە یەکێکە لەو نیگەرانییانەی کە دووچاری ئەو ئۆتۆکراتانە دەبێتەوە کە کەس لە دەرەوە لێی ناپێچێتەوە. لەو کۆمەڵگایانەی کە گەندەڵی و پاراستنی بەرژەوەندی خود تیایدا زاڵە، ڕەنگە یاسا دژی ئەو کەسانە بوەستێتەوە کە ڕایەکی جیایان هەیە و هاوکات بەرپرسە گەورەکانیش بەدەرن لە ڕەخنە. گەر حاکمە ئۆتۆکراتەکان کۆمەڵگاکانی خۆیان والا نەکەن بۆ ڕەخنە و ڕای جیاواز ئەوا ڕەنگە حکومەتەکانیان لە داهاتوودا بەرگەی هیچ شتێک نەگرن وبووخێن. پشت بەستن بە تەنها یەک سەرکردەی لێهاتوو و بلیمەت هەمیشە ستراتیژیەتێکی درێژخایەن و مەترسیدارە.

## کارەسات و قەیران

خۆشتر کردنی ئاگری کارەساتەکانی گەندەڵی لە نێو میدیای ئازاددا چاکسازی خێرا کرد لە نێو ژمارەیەک سیستەمی سیاسیدا. ئەو قەیرانە ئابوورییانەی کە لە سەرەنجامی سیاسەتی دەستی خراپەوە دروست دەبێت زەمینە بۆ گۆڕان خۆش دەکەن. تەنانەت لە هەر بارودۆخێکی ناهەمواردا قەیرانێکی سەرەکی دەتوانێت داوای چاکسازی بکات. بۆ نموونە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، کوشتنی سەرۆک جەیمس گارفیلد لە لایەن سەرۆک نووسینگەیەکی بێ ئومێد بێهێزی سیستەمی چاودێری دووپات کردەوە و زەمینەی خۆش کرد بۆ باشتر دابینکردنی خزمەتگوزاری. ترس و تۆقینە داراییەکان هەوڵەکانی چاکسازی ئابووری لە گەلێ وڵاتدا بەگەڕ دەخەن.



کارەسات و قەیران دەتوانن گەندەڵی لە پێش هەموو شتێک دابنێن لە نێو ئەگێندەی کاری حکومەتدا، بەڵام هەمیشە ناتوانن هەوڵەکانی چاکسازی بەرەو ئاڕاستەیەکی بەسوود ببەن. ئەمەش سەدمەیەکی چاکسازی دووپات دەکاتەوە. کاتێ قەیران پشتگیرییەکی بەهێز دروست دەکات بۆ گۆڕان، بەرپرسە سیاسییەکان دەبێ بەخێرایی کار بکەن و ماوەکان هێور بکەنەوە کاتێ چاکسازی بە قوڵی جێبەجێ دەکرێت، پشتگیری سیاسی وجوودی نییە. قەیرانەکان یان ئەوەتا چاکسازییەکی ڕاستەقینە بەرهەم دێنێت یانیش ئەوەتا وەڵامی نەشیاو دروست دەکات. گەر کارەسات دەست پێ بکات، زۆرجار میدیا ڕەخنەی لێ دەگیرێت لە سەر ئەوەی لە هەواڵەکاندا تەنها جەخت دەکەنەوە لە سەر چەند کەسێک و دەیکەنە پاڵەوانی کارساتەکە و پشتگوێ خستنی ئەو مەرجانەی کە پاڵنەر بۆ گەندەڵی لە یەکەم شوێنەوە دروست دەکات. ئەمەش ڕەخنەیەکی عادیلانەیە، بەڵام زۆر بە زەحمەتی حکومەت لە داوەکە دەکاتەوە. چاکخوازان دەبێ وەڵامی کارەساتەکان بدەنەوە بە ئەنجامدانی کارێکی زۆر زیاتر لە سزادانی تاوانبارەکە. ڕووبەڕوو بوونەوەکە کەم کردنەوەی پاڵنەرەکانی گەندەڵیە. ئەگینا هەڵمەتەکانی دژە گەندەڵی کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نابێت و بەڵکو هەندێ جار خزمەتی ڕکابەرە سیاسییەکان دەکەن. کارەساتەکان دەرفەتێکن بۆ دەستخستنی پشتگیری بۆ گۆڕانە دامەزراوەییەکان کە خۆیان کێشەی کەمتریان هەیە.

سەرنجی میدیاکان زۆر پێویستە بۆ دەرخستنی کارەساتەکان، بەڵام ئەوەندەش بەس نییە. ئەو شتانەی کە ئاشکرا دەکرێن دەبێ ڕاست بن و جێگای متمانەی خەڵکی بن، هەروەها خەڵکیش دەبێ بە تەواوی ئەوەی لە ناخیاندا هەیە دەری ببڕن و لە نێو میدیاکان بڵاو بکرێنەوە. هەموو ئەو فشارانەش کار دەکەنە سەر حکومەت هەڵسێت بە لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو بانگەشانە و ڕاستکردنەوەی کارە خراپەکان. بە داخەوە، وەڵامەکان هەمووی جەخت تەنها لە سەر کەسایەتییەکان دەکەنەوە ، لە لایەک، هەروەها گەڕانە بە دوای قوربانی لە لایەکی ترەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، گەر سەرکردە سیاسییەکان پابەند بن بەو جۆرە چاکسازیانەوە، بەکارهێنانی کارەسات بە ژیری دەتوانێت پشتگیری گشتی بەرهەم بێنێت بۆ گۆڕانی بە کولفە لە کاروبارەکانی حکومەت کە بە هەر شێوەیەک بێت گشتی نەبێت.

رۆژنامەوانی ئازاد دەتوانێت نارەزاییەکی گشتی دروست بکات کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد کردنی فشار بۆ چاکسازی. ئەمە شێوازێکی گشتیە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها، بێگومان هەر ئەم شێوازە وا لە حکومەت دەکات بەرپرسیارێتی هاولاتیانی بگرێتە ئەستۆ. بۆ نموونە، کارەساتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دەزگای گومرگی نیۆرک و نووسینگەی پۆستە، کە بووە هۆی کوشتنی " گارفیلد" بە شێوەیەکی بەرفراوان لە نێو رۆژنامەکاندا بلاو کرایەوە، ئەمەش کەش و هەوایەکی گونجاوی دروست کرد بۆ چاکسازی. زیانی نەبوو کاتێ سەرۆک " چێستەر ئارسەر" کۆکەرەوەی گومرگ بوو لە شاری نیۆرک و هەروەها نەیتوانی بە ئاسانی بەرگری لە سیستەمەکە بکات. راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان لە ژمارەیەک ولاتی ئەمریکای لاتین یارمەتیدەر بوون لە دروستکردنی کارەسات کە بووە هۆی شکاندنی حکومەتە گەندەڵەکان.

پشتی چاکسازی دەستووری " بۆستن" لە ساڵی ١٩٤٩دا بەهێز بەهۆی ئەو کارەسات و قەیرانانەی لە دەوروبەری ئەنجوومەنی شاردا لە ساڵی ١٩٤٧دا دروست بوو. کۆمیسیۆنی گوێگرتنی ئەنجوومەن مۆڵەتی تانکەرێکی ئاوی دواخست لە فرۆکەخانەوە بۆ وێستگەی شەمەندەفەر. یەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی شار بە زووترین کات مۆڵەتی بەخشی چونکە دیعایە بلاوبیۆوە کە گوایە بە هۆی بەرتیلەوە ئەو مۆڵەتە دواخراوە، ئەمەش نموونەییکی باشە لە سەر ئەوەی چۆن هیواکانی دەسکەوتە گەندەڵەکان دەتوانێت نەشیاوی لە کەرتی حکومیدا دروست بکات. ئەندامێکی تری ئەنجوومەنی شار بەرگری لە دواخستنەکە کرد و کەسی یەکەمی تۆمەتبار کرد کە نوێنەری بەرژەوەندییەکانی بازرگانی بوو لە پاڵ سەرکەشییەکانی تانکەری ئاو. بەردەوام بوو و ئەمەی خوارەوەی راگەیاند:

من دۆلارێک وەردەگرم، ئیتر کێ نازانێ من وەرمگرتووە، هەروەها ئاشکرایە تەنها من زۆربەی بەشەکانم لە لایە و دەتوانم بلێم دۆلارێک وەردەگرم. حەز دەکەم ئەو کەسە ببینم کە دۆلارێک وەرنەگرێت، لێگەرێن با ئەو کەسە بناسم کە دۆلارێک وەرناگرێت. ئەو خۆی بە چ دەزانێت و گاڵتە بکات؟ پارێزەرێک دەتوانێت بچێتە دەرەوە و کرێ وەرگرێت.



ئەم رووداوە بە فراوانی لە نێو رۆژنامەکانی بۆستندا بلاوکرایەوە و بووە هۆی دروستبوونی لێکۆڵینەوە لە سەر ئەنجوومەن لە لایەن پارێزەری قەزای " سەفۆڵک". ئالێرەدا سەرنجی پێکهاتەی فیدراڵ بدە کە چۆن پڕە لە کاری سەپاندنی یاسا. دعایات لە سەر هێلی ترانزێت بلاو بۆوە، بەرتیل درا لە سەر مۆڵەتی کەرنەڤاڵەکان و شوێنی راگرتن، هەروەها بۆ فراوانکردنی رەسیف و رێکخستنی جادەکان. هەرچەندە ئەوانەی کە تۆمەتبار کران لە کۆتاییدا لێیان خۆش بوون، چالاکییەکانی پارێزەری قەزا کە بەهۆی کارەساتەکەوە جدی تر بوو بووە هۆی دروستبوونی پشتگیری بۆ چاکاسازی لە پێناو کەم کردنەوەی قەبارەی ئەنجوومەن و گۆڕان بەرەو سیستەمێکی فراوانتری هەڵبژاردن کە لە ژێر سایەی ئەو سیستەمەدا ئەندامانی ئەنجوومەن بۆچوونێکی فراوانتریان لە سەر ئاستی تەواوی شارەکەدا دەبێت لەوەی کە تەنها لە سەر ئاستی گەرەکێکدا هەبێت. بۆیە دەبێ کەسایەتییە سیاسییەکان لە سەر ئاستێکی فراوانتر رای خۆیان دەربرن نەک تەنها لە سەر ئاستێکی تەسک و بۆ بەرژەوەندیەکی تەسک.

تەنانەت ئەو نەتەوانەی کە دەوڵەتەکە کۆنترۆڵی میدیایان کردووە دەتوانن جار جار باسی گەندەڵی بکەن لە نێو میدیاکان تاوەکو وەک ئاگاداریەک پێشەکی چەند پەند و وانەیەک فێری بەرپرسان بکەن. بۆ نموونە، لە یەکێتی سۆڤیەتدا، ئەو باس و خواسانەی پەیوەندی بە گەندەڵییەوە هەبوو هەمیشە لە کەرستە گرینگەکانی هەواڵ بوون. بە پێی ئابووریناسێکی رۆژاوایی، ئەو باس و خواسانە بوون بوونە هۆی دیاری کردنی نەشیاوی و توندی رەوشی ئابووری. بە رای بەرپرسە سۆڤیەتەکان خۆیان، ئەو باس و خواسانە بەشێک بوون لە هەڵمەتێکی وەرزییانە کە رووبەرووی ئەو رێکخراوی سیستەمی ئابوورییە نەبۆوە کە کارەکانی لە ئەستۆدا بوو.

قەیرانە ئابوورییەکان، وەک کارەساتە سیاسییەکان، دەتوانن وا لە چاکسازی بکەن ببێتە پێویستییەک بۆ زۆربەی دەنگدەران هەتا گەر هەندێ ناخۆشیشی لێ بکەوێتەوە بۆ ماوەیەکی کورت. بۆ نموونە، فشاری بەرز وا لە گرووپی بەرژەوەندییەکان دەکات کە کۆک بن لە سەر سیاسەتی چاکسازی خێراتر لە ژێر مەرجەکانی سەقامگیری نرخ. کاری تەجریبی لە سەر بنچینەی نموونەیەکی ولاتان

به قەیرانەکانی قەرزی دەرەکیشەوە پشتگیری ئەم بانگەشەیە دەکەن. هەندێ لەو وڵاتانە، بە تایبەتی لە وڵاتانی ئەمریکای لاتینەوە، فشاری بەرزیان هەبووە، لە وڵاتانی تر بە تایبەتی لە ناوچەی " فرانک" لە ئەفریقیا فشاری نزمیان هەبوو. دیراسەکە ئەوە نیشان دەدات ئەو وڵاتانەی کە ڕێژەی فشاریان زۆرە هەڵدەستن بە کەم کردجوەی عیجزی کەرتی گشتی. سەرەڕای ئەمەش، فشاری بەرز لە حاڵی حازردا وا لە وڵاتان دەکات فشار کەم بکەنەوە لە داهاتوودا.

هەندێ جار وڵاتانی دیموکراسی ڕەخنەیان لێ دەگیرێت لە لایەن ئەو چاکخوازە ئابوورییانەی کە نیگەرانن لەو فشارانەی کە چاکسازی زەحمەت دەکەن. کاریگەری قەیرانێکی ئابووری وەک کاریگەری کارەساتێکی گەورە دەتوانن چاکسازی بخەنە پێشەوەی ئەگێندە. بۆیە " ئەریندام داس گوپتا و دیلیپ موخەرجی" تانوپۆی ئەوە دەکەن کە قەیرانی توندی ئابووری دەتوانێت چاکسازی بۆ حکومەتێکی نوێ بکات کە هەڵبژێردراوە لەگەڵ مەندوبێک لە پێناو گۆڕان. ئەو دووانە چەند نموونەیەک دەهێننەوە وەک ئەرژەنتین و بۆلیڤیا و کۆلۆمبیا و پیرۆ لە ساڵانی هەشتاکان. مشتومڕی ئەوە دەکەن کە هیندستان هەلی چاکسازی لە دەستدا لە ساڵی ١٩٩١ لە بەر قەیرانێکی دراوی بێگانە و هەڵبژاردنی حکومەتی نوێ. لە بەریتانیا و ئوستورالیا و نیوزلەندا لە ساڵانی هەشتاکان چاکسازی ئیداری لە لایەن حکومەتە نوێیە هەڵبژێردراوەکە خێرا کرا بەهۆی بێکاری لە حەوتاکان. هەروەها قەیرانە ئابوورییەکان بووە هۆی چاکسازی لە ویلایەتە یەککگرتووەکان. بۆ نموونە، دیراسەی قەزیەکی چاکسازی لە " ویسینسن" لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ئاماژە بە کاریگەری گەورەی خەمناکیی ئابووری و تۆقینی دارایی دەکات لە کۆکردنەوەی خەڵک لە نێو هەموو چین و توێژێکدا بۆ چاکسازی.

بێگومان، گەلێ قەیرانی ئابووری هیچ پەیوەندییەکی روونیان نییە بە ئاستی گەندەڵی، بەڵام لەو وڵاتانەی کە سیستەمی گشتی ئابووری و قازانج کردنی بازرگانی ئیفلیج و بوودەڵە بوون بەهۆی گەندەڵی لە کۆکردنەوەی باج و پرۆسەی گشتی کڕین، قەیرانە ئابوورییەکان دەتوانن کارێک بکەن بۆ سیاسەتەکانی دژە گەندەڵی و هەروەها باشتر کردنی ڕەوشی ئابووری. بە هەقیقەت، گەر پەیوەندییەکان لە سەر



بنچینەی گەندەڵی بن، ئەوا پەیوەندییەکانی خێزان و چاودێری کردن ناگۆڕێن، هەروەها پێوەرەکانی ژیانی ئابووری سەرکەوتوو نابن. بۆ نموونە، دیراسەیەکی هەوڵەکان لە پێناو چاکسازی ئیدارەی باج لە مەکسیک و ئەرژەنتین ئاماژە بە زیانەکانی گەندەڵی و نەشیاوی لە سیستەمەکانی کۆکردنەوەی داهات دەکات وەک هۆیەکی بنەڕەتی قەیرانە ئابوورییەکانی هەشتاکان. خاسیەتە بێهێز و عەشواییەکانی سیستەمی باج لە هەردوو وڵاتدا بەشداری کرد لە کارکردنی کەرتی گشتی و نەشیاوییەکانی کەرتی تایبەتیش. ئەنجامی ئەو قەیرانەش وای لە نوخبەی سیاسی کرد کە هەموو هەوڵێک بخەنە گەڕ بۆ چاکسازی.

قەیرانە سیاسی و ئابوورییەکان هەلومەرجی ترسناک و بە کولفەن بۆ چاکسازی. هەمیشە هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت سست دەکەنەوە و دوا دەخەن. ڕەنگە قەیران ببێتە هۆی توندوتیژی و ئاژاوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی شەرعیەتی دەوڵەت. ڕەنگە چاکسازی ڕووبدات بەڵام زۆری تێدەچێت، یانیش ئەوەتا ئاژاوە تەواوی وڵات دەتەنێت. کەس ڕێگە بەخۆی نادات بڵێت قەیرانەکان دەبنە هۆی چاکبوونەوەی گەندەڵی لە نێو دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا. لەمەش باشتر سیستەمێکی سیاسییە بۆ دروستکردنی فشاری بەردەوام بۆ باش بەرێوەچوونی کارەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، چاکخوازان دەبێ دان بەوە دابنێن کە دەکرێ هەندێ جار قەیران و کارەساتەکان بەکاربهێنرێن وەک پاڵنەرێک بۆ ئەکتەرەکانی کەرتی تایبەتی و گشتی هەنگاو بنێن بەرەو گۆڕان.

## سامانی سەرچاوە سروشتییەکان و هاوکاری دەرەکی

قەیرانە ئابوورییەکان پرۆسەی چاکسازی خێرا دەکەن، لە کاتێکدا "سامان" پرۆسەی چاکسازی بە گرینگ نازانێت. بەڵگە بەرجەستەکان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە سەرچاوە سروشتییە بەهێزەکان بە شێوەیەکی ئەوتۆ گەشەی ئابووری پێش ناخەن. وڵاتانی پێشکەوتوو وەک نێجیریا و ڤێنزوێلا و ئەندەنووسیا ، کە ئەزموونیان هەیە لە قازانجی نەوت، توانییان بەرگەی چاکسازی بۆ ماوەی چەند ساڵێک بگرن، هەروەها سامانی کانزای "زایر" هۆکارێکی یارمەتیدەر بوو کاتێ گەندەڵی لە ڕژێمی

مۆبۆتۆ درێژەی کێشا. ئەو وڵاتانەی کە بە کانزا دەوڵەمەندن لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تری ئاڵوگۆڕی دەرەوە زۆر بە دەگمەن چاکسازییان تێدا دەکرێت لە بەر دوو هۆ: یەکەم، چونکە دەوڵەت دارایی خۆی لە ڕێگەی مافەکانییەوە دابین دەکات، دووەمیش لەوانەیە چەند سەرچاوەیەکی کەم وەک بەدیل هەبن بۆ دەرکردنی فەرمانبەرەکانی خزمەت گوزاری لە نێو کەرتی تایبەتدا. وڵاتەکە دەوڵەمەندە بە سەرچاوە سروشتیەکانەوە بەڵام هەلی کار نارەخسێنێت بۆ هاوڵاتیانی خۆی لە نێو کەرتی تایبەتدا. لە بری پێشخستنی گەشە، سەرچاوەی گرانبەها زۆر بە ئاسانی دەست بە سەر سوودەکانی دەوڵەتدا دەگرێت. خەڵکی کێبڕکێ دەکەن لە سەر حوکمی دەوڵەت تاوەکو ئەو حوکمە بەکاربێنن لە بەرژەوەندی خۆیان و خێزانیان و خزم و کەسە نزیکەکانیانەوە. خەڵکی بەهرەدار جەخت دەکەنەوە لە سەر هەوڵەکانی بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی زیاتر نەوەک چالاکییە بەرهەمهێنەرەکان. سوودی تایبەتی چالاکییەکانی گەڕان بەدوای دەسکەوتدا لە سەرووی بەها کۆمەلایەتییەکانیانەوەیە، لەوانەشە پرۆسەی بەرهەمهێنەری وەگەڕخستن وەدەرنێن. بۆ نموونە یەکێک لە سەرنجدەرانی قەزیەی چین، لەوە نیگەرانە کە گەنجان سەرکەوتوو نابن لە بونیاتنانی سەرمایەی مرۆیی ئاسایی خۆیان " بەو جۆرە بەهرانەشەوە وەک" بەهرەکان لە شەڕی دەسەلاتدا، تێگەیشتن لە نیازەکانی سەرووی خۆیان و ڕێگاکان بۆ پان کردنەوە، زانیاری سەبارەت بە پەیوەندییە ئاڵۆزەکان لە نێو بەرپرسە بەهێزەکان ... تاد. لە وڵاتی کینیا، حکومەت ئەو ڕۆشنبیرانەی کەسب دەکرد کە دەکرێ هەڕەشەیەک بن لە دەرەوەی حکومەتدا. دیراسەیەک لە زامبیا پێشنیاری ئەوە دەکات کە پاداشتە تایبەتییەکان بۆ پیشەگەری گشتی دەکرێ زۆر بێت و هەروەها هەموو بەهرەکانیش بەکاربهێنرێن بۆ گەڕان بەدوای دەسکەوتدا.

بازرگانی سەرچاوە سروشتییەکان دەبێ بە تەنها جێبهێڵرێن و زۆر کاریگەریش نابن لە نێو کەرتی گشتیدا. ئەو وڵاتەی کە بەرەو چاکسازی ناچێت ئەو وڵاتەیە کە پشتی بەستووە بە سەرچاوە سروشتییەکان لە چاو هەرێمەکانی تردا. دواجار گەندەڵی و چاودێری کولفەیەکی ئابووری ئێجگار زۆر دەکەوێت و هاوڵاتیانیش هەست بە زەرەرەکانی ناکەن بە بەراورد لەگەڵ هاوڵاتیانی وڵاتێکی هەژاری دراوسێیان.



سەرچاوەیەکی زامن بۆ هاوکارییە دەرەکییەکان نزیکەی وەک کانێکی ئەڵماس یان چاڵێکی نەوت وایە. ئەو وڵاتانەی کە بەم سەرچاوانە دەوڵەمەندن هەمیشە وڵاتانی تر بە هەژار و نەدار دەزانن. لەو وڵاتانەی کە ئەو سامانەیان کەمترە گەر چاودێران هاوکاریان کەم بێت ئەوا زۆر بە ئاسانی لەو وڵاتەدا بڕیارە بە ئازارەکان دوادەخرێن و کێشەی زەق زەق قووت دەبنەوە و قەیران دروست دەبێت. " مایکڵ بڕۆنۆ و ویلیەم ئیستەرلی" ورد بوونەتەوە لەوەی کە ئەو وڵاتانەی فشاریان کەم لەسەرە تەعدیلی عجزەکانیان نەدەکرد و عجزی بودجەکان دەیانتوانی چاکسازی بەلاوە نێن لە بەر لێشاوێکی زۆری گەشەپێدانی هاوکاری قەرز بەخشین.

دەوڵەتە بێهێزەکان ڕەنگە تووشی حاڵەتێکی هاودژ بن کە تیایدا زۆربوونی سەرچاوەکان ببێتە هۆی ئیفلیج کردنی سەقامگیری سیاسی و گەشە. تا ئەو ڕادەیەی کە دەوڵەت هەژار بێت، چەند کەسێکی کەم هەیە بایەخ بە کۆنترۆڵکردنی خەوشەکانی دەسەلات بدەن. گەر دەوڵەت هاوکارییەکی زۆر لە دەرەوە دەستەبەر بکات یاخود کۆنترۆڵ بگرێتە دەست بە سەر کانێکی کانزایی نوێ، ئەوا ڕەنگە کەسایەتییە سیاسییە نوێیەکان دەنگی خۆیان لە پاڵ ئەمە هەڵبڕن. مشتو مڕی سیاسی دەبێتە شەڕێک بۆ کۆنترۆڵکردنی سامانی دەوڵەت. ئەوانەی ناوەوەی دەوڵەت هەوڵ دەدەن ئەوانەی دەرەوە قەدەغە بکەن لە سوود وەرگرتن، جگە لەوانەی کە بەرتیل دەدەن و بەرژەوەندی دوو سەرەیان لەگەڵ یەکتر هەیە. لەم جۆرە سیناریۆیانەش، زۆربوونی سەرچاوەکان هانی گەشەی داهات نادەن و بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبنە هۆی زەرەر بۆ سامانی هاوڵاتیانی ئاسایی. بۆ نموونە، دیراسەیەک لە سەر فلیپین، تانوپۆی ئەوە دەکات کە گەڕان بە دوای دەسکەوتدا لە لایەن بازرگان و سەرکردە سیاسییەکان پشتگیری کرا لە لایەن هاوکاری دەرەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و وجوودی بنکەی سەربازی ئەمریکی. هەروەک سەرۆک " فیدڵ ڕامۆس" لە ساڵی ١٩٩٢ لە وتەیەکی ڕەسمیدا وتی سیستەمی ئابووری پاداشت بەو کەسانە دەدات کە بەرهەمیان نییە لە سەر حیسابی ئەوانەی بەرهەمیان هەیە... هەروەها لە ڕێگەی کاریگەری سیاسییەوە خەڵکی بە توانا دەکات سامان بەدەست بێنێت بە بێ هەوڵێک لە ڕووی ئابوورییەوە.

نێجێریا باشترین نموونەیە کە وەسف کراوە بە " کێکێکی نەتەوەیی" ئیتر ئەو

کێکه دابەش دەکرێت لە نێو بەرپرسە گەورەکانەوە. حاڵەتەکە لە ڕووی سوودی
پێترۆڵەوە ڕوونتر دەبێتەوە. نەوت لە سەدا ٩٠ی هەناردەکان و داهاتی نێجێریا پێک
دەهێنێت. داهاتی نەوت هەمووی لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتە و سوودێکی ئێجگار
زۆریشی هەیە بۆ ئەوانەی کە کۆنترۆڵی ئەو داهاتەیان لە دەستە و بۆ هاوپەیمانێتییە
سیاسییەکانیش. بە تایبەتی لە ساڵەکانی قەیرانی پێترۆڵدا، نێجێریا سوودێکی
ئێجگار زۆری کرد. کۆنترۆڵی دەوڵەت نرخێکی ئێجگار گرانبەهایە بۆیە هەمیشە
شەڕی لە سەر دەکرێت.

ولاتە دیموکراسییە گەندەڵەکان بە سەرچاوە بەهێزەکانیشیانەوە ڕەنگە لە ڕووی
گەشەوە هەژارتر بن لەو وڵاتە ئۆتۆکراسییە گەندەڵانەی کە فەندیان بۆ دابین کراوە.
ئۆتۆکراتەکان کاتێکی باش و توانایەکی باشتریان دەوێت بۆ کێبڕکێی کۆنترۆڵ لە
سەر گەڕان بۆ دەسکەوت لە لایەن بەرپرسەکانی ژێر دەستی خۆیان. بێگومان
مەترسییەکە ئەوەیە کە ئۆتۆکراتەکان ڕەنگە بچن بەرەو مەنسەبێکی کلێپتۆکراتی
کاتێ چاویان بە بەرهەمی گەشەسەندن دەکەوێت. چارەسەرێکی جێگیر و درێژخایەن
بۆ دیموکراسیە گەندەڵەکان ئەوە نییە ئۆتۆکراتەکان شوێنی دیموکراسییەکان
بگرنەوە، بەلام هەردووکیان پابەندن بە کێبڕکێی بازاڕەکان بۆ نێو دامەزراوە
دیموکراسییەکان کە دەتوانن کۆنترۆڵی دەسەلاتی قۆرخکاری و بەرپرسی هەڵبژێراو
بکەن.

## داواکارییەکان بۆ چاکسازی

گەر پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکی باش هەمیشە بەهای لای هەندێ لە
ئەندامانی حکومی هەبێت، ئەی باشە چ شتێک هەیە کات و نەخشەی چاکسازی
دیاری بکات و ڕوون بکاتەوە؟ کارەساتێکی سەرەکی یان قەیرانێکی ئابووری
دەتوانێت یارمەتی ئەم مەسەلەیە بدات، بەلام هەندێ جار پاڵنەر بۆ چاکسازی
کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە کە چاوەڕێی لێ دەکرێت. ئەو کارانەی کە لە لایەن
ڕێکخراوەکانەوە بە سەرکەوتوویی ئەنجام دەدران لە ڕابردوو هیچی تر قەناعەتیان
پێ ناکرێت. لە ئەزموونی بەریتانیا و ئەمریکادا، دوو هۆکاری جیای



ڕێکخراوەییەکان برەویان بە چاکسازییەکی خێرا دا. یەکەمیان، تەشەنە کردنی
گرێبەستی ساختە لە دەرەوەی خزمەتگوزارییە حکومییەکان لە سەرەتای سەدەی
نۆزدەدا. دووەمیان، دامەزراندنی بە لێشاوی خەڵکی ناشایستە و لێنەهاتوو لە نێو
دام و دەزگا حکومیەکاندا کاتێ قەبارەی حکومەت گەشەی کرد لە دوا بەشی هەمان
سەدەدا.

لە بەریتانیادا، شێوازی نووسینگەی گشتی وەک بەلێندەرێک بۆ سوودی گشتی
ڕوو لە کالبوونەوە بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا هەرکە حکومەت درێژەی بە
چالاکییەکانی خۆی دا. چەند دەستەیەکی زەبەلاحی تایبەتی هاتنەکایەوە کە
توانییان هەڵسن بە دابینکردنی خزمەتگوزارییەکی ئێجگار زۆر. لە بری گرێبەست لە
دەرەوە بۆ خزمەتگوزاری گومرگ و پۆستە، دەوڵەت دەستی کرد بە دامەزراندنی
ژمارەیەکی زۆری فەرمانبەر کە هەمیشە لە سەر بنچینەی متمانەوە وەردەگیران
مووچەیەکی باشیشیان پێ دەدرا. کۆمپانیای " ئیست هیندستان" بێ وێنە بوو،
کۆمپانیایەکی زەبەلاحی تایبەت بوو وەک بەدیلێک کاری دەکرد بۆ حکومەتی
بەریتانی کە هەر لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا هەندێ پێوەری بۆ مەشق و
چۆنییەتی دامەزرانی خەڵک خستە بەردەست، بەلام سیستەمی کارمەندانی بەشدار
بوون لە گەلێ خاڵە لاوازەکانی تری حکومەتدا بوون. هەمان سیستەمی دامەزراندنی
خەڵک لە سەر حیسابی متمانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش سەری هەڵدا. ئەو
سیستەمانە زۆر بە خراپی کاریان کرد، هەروەها نەبوونی کەرتی تایبەت وەک بەدیل
بۆ دەوڵەت وای لە چاکسازی کرد ببێتە تەنها ئیختیار لە لایەن دەوڵەتەوە. فشاری
چاکسازی لە خزمەتگوزاری مەدەنی سەرچاوەی گرت لە نەبوونی بەدیلێک بۆ
دابینکردنی شتە سەرەکییەکان.

" ڕۆناڵد جۆنسن و گاری لیبێپ" تانوپۆی ئەوە دەکەن کە لە ویلایەتە
یەکگرتووەکاندا پاڵنەری چاکسازی لە خزمەتگوزارییە مەدەنییەکاندا تەشەنەی
تەواوی قەبارەی سیستەمی بیرۆکراسیەتی فیدراڵ بوو. تیۆرێکی ئاشکرایە کە
لەدەستدانی کۆنترۆڵ بە لە دەستدانی قەبارەی ڕێکخراوەیی زیاد دەکات. ئەمە لە
ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ڕووی دا لە سەر ئاستی فیدراڵدا دوای شەڕی ناوخۆ.

چاودێریکردنی ڕاستەوخۆ زۆر گران بوو لە ڕووی ماددییەوە، هەروەها بووە یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ واز هێنان لە دەسەڵات لە بەرابەر دامەزراندنی حوکمە فەرمییەکان. جۆنسن و لیبێپ باسی ئەوە دەکەن کە تێکەڵەی قەبارەی قەبەی حکومەت و گەشەی سەربەخۆی سەرکردەی حیزبە مەحەلییەکان بووە هۆی پاڵپشتێک بۆ چاکسازی لە خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە نێو کۆنگرێسدا. یاسای " پێندڵتن" کە لە ساڵی ١٨٨٣ دا دەرچوو، تەنها شوێنە فیدراڵییە گەورەکانی گرتەوە، هەروەها پشتگیری یاساکەش لە نێو ئەندامانی کۆنگرێس لە قەزاکان لەگەڵ نووسینگەی پۆستەی گرینگ و خانەکانی گومرگ زۆر بەهێز بوو. بەڵام، ئەو چاکسازیە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر ڕەفاهیەتی نەتەوەیی نەبوو. هیچ پێوەرێکی داهاتی تاک لە نێو بەرهەمی نەتەوەیی نەگۆڕا بە پێی فراوانکردنی سیستەمە بەسوودەکە لە سەر ئاستی فیدراڵدا. وا دەردەکەوێت ئەمە لە سەر ئاستێکی هەڵەی شرۆڤەکردندا بێت چونکە دەوڵەتێکی نێودەوڵەتی چالاک کاریگەری جیاوازی دەبێت لە سەر بازرگانییەکان بە پشت بەستن بەو هەقیقەتەی تا چ ڕادەیەک پشت دەبەستن بە نووسینگەی پۆستە و خزمەتگوزاری گومرگ. بە پێچەوانەوە، گەلێ وڵات هەیە لەو ڕۆژگارەی ئێستاماندا، حکومەتە فیدراڵیەکەی بەرپرسیارێتییەکی کەم و نارێکی هەبووە لە ڕابردوودا.

ئەزموونی هەندێ وڵاتانی پێشکەوتوو تەواو دژی گفتوگۆکەی جۆنسن و لیبێپ دەوەستنەوە گوایا گەشە لە قەبارەی حکومەت دەبێتە هۆی خێرا کردنی چاکسازی. حکومەتە زەبەلاحەکان زۆر تایبەتتر لە چاو ئەوانی تر زۆر بە زەحمەتی دەتوانن پابەندی چاکسازی بن و ئەنجامی بدەن. گەر حکومەت زۆر گەورە بێت، ئەوا ڕێژەیەکی ئێجگار زۆر لە هێزی کار دادەمەزرێنێت. لە هەندێ وڵاتی هەژار و کەم دەرامەتدا، کەرتی حکومەت دەژمێرێت بۆ پشکی زۆری کارەکان لە نێو کەرتی مۆدێرندا. گەر ئەمە ڕاست بێت، ئەو چاکسازیەی کە داوای تایبەتمەندێتییەکی بەرجەستە و بێکارییەکی زۆر دەکات ڕەنگە لە ڕووی سیاسییەوە زۆر زەحمەت بێت ئەنجام بدرێت. هەتا گەر چاکسازی هەلی کار باشتر بکات و گەشەی ئابووری ئاسان بکات، ئەوا فەرمانبەری حکومی دژی چاکسازی دەوەستنەوە چونکە دڵنیا



نابن لەوەی چەند وەردەگرن. وێڕای ئەمەش، ئەگەری ئەوەی کە فەرمانبەران دەتوانن یەک بگرن و فشاری بە گرووپیش ئازادی چاکسازەکان سنووردار دەکات لە کارکردن. هەتا گەر جۆنسن و لیبێپ ڕاست بن لەوەی کە دەڵێن ناشایستەیی و لێنەهاتوویی زیاد دەکات کاتێ حکومەت گەشە دەکات، ڕەنگە ئەو هەقیقەتە پڕ بە پێستی خۆی نەبێت بۆ سەرکەوتن بە سەر گورزی سیاسی فەرمانبەری حکومیدا. جۆنسن و لیبێپ جەخت دەکەنەوە لە سەر قەبارەی ڕەهای حکومەت یاخود بە لانی کەم لە سەر هەندێ ئاژانسی سەرەکی وەک نووسینگەی پۆستە. بە پێچەوانەوە، پشکی حکومەتیش لە کۆی گشتی فەرمانبەراندا پەیوەستە بەم پرسەوە.

باشترین حاڵەت بۆ ڕوودانی چاکسازی ئەو کاتەیە کە ژمارەی فەرمانبەری حکومی ئێجگار زۆر دەبێت بەڵام هێزی کرێکارانیش ڕوو لە کەمبوونەوە دەبێت. گەر هەندێ کار لە نێو کەرتی تایبەتدا بن ئەوا هاوڵاتیان بە گشتی بایەخ زیاتر بەوە دەدەن ئایا پۆستەکانیان بە خێرایی دەگات، ئایا ڕێگاکان بە باشی بونیاتنراون و ڕێکوپێکن، هەروەها ئایا قوتابخانە و نەخۆشخانەکان کاری خۆیان بە تەواوی دەکەن لە چاو ئەوەی ئایا کار لە نێو حکومەتدا دەست دەکەوێت یان نا. چاکسازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئاسانکاری بۆ کراوە لە لایەن قەبارەی بچووکی ئەو کەرتە حکومییانەی کار لەگەڵ کەرتی تایبەتدا دەکەن.

فەرمانبەری حکومی گرووپێکی فشاری بەهێز نەبوون، لە کاتێکدا خەڵکی گشتی پشتگیری چاکسازییان دەکرد. " دەیڤید ڕۆسنبلووم" باسی ئەوە دەکات کە کاتێ خزمەتگوزاری مەدەنی فیدراڵ چاکسازی تیادا کرا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوا زۆربەی نەتەوەکە لە پشتی گۆڕاندا وەستان. هەمان شت بە شێوەیەکی گشتی ڕاست بوو لە سەر ئاستی دەوڵەتدا. پێش سەرهەڵدانی سیستەمەکانی خزمەتگوزاری مەدەنی، کار سوودێک بوو بەکاردەهێنرا بۆ هاندانی هەڵمەتی کرێکاران، بەڵام بەهای ڕێژەییان دابەزی کاتێ کولفەی چاودێریکردنیان بۆ دەنگدەران ئاشکراتر بوو. سەرەڕای ئەمەش، گەر خزمەتگوزاری ئەوەندە کەم بێت تا چاکسازی نەبێتە هۆی بێکاری، ئەوا هەبوونی کرێکارانی حکومەت ڕەنگە پشتگیری چاکسازی بکەن. هەرچەند لە ژێر پێوەرێکی سیاسیش بێت، ڕەنگە هەر لە

نووسینگەدا بمێننەوە بە گۆڕانێکی حکومەت. هەتا بۆ ماوەیەکی ٤ تا ٦ ساڵاندا، ڕەنگە کرێکاران پشتگیری دروستبوونی سیستەمی خزمەتگوزرای مەدەنی بکەن بە تایبەتی گەر نەک هەر تەنها ئەمنییەتی کار بگرێتەوە بەڵکو ببێتە هۆی زیاد بوونی مووچە و باشتر کردنی هەلومەرجەکانی کارکردن. بۆیە کرێکارانی کەرتی حکومی ئەمریکا پشتگیری خزمەتگوزاری مەدەنییان کرد و لە شوێنی خۆیشی بوو چونکە ئەوان نەوەی داهاتووی مەنسەبی هەنووکەیی خۆیان بوون.

هەروەها سنوورێکی تریش هەیە بۆ شرۆڤەکەی جۆنسن و لیبێپ. ئەوان بەم جۆرە باسی قەبارەی دام و دەزگا حکومیەکان دەکەن: زیاد بوونی قەبارەی دام و دەزگا حکومییەکان دەبێتە هۆی زەحمەت کۆنترۆڵکردنی بیرۆکراسی و هەروەها لە بەرابەر ئەوەشدا دەبێتە هۆی دروستبوونی فشارێک بۆ چاکسازی. بەڵام، گەر بەرپرسە حکومییەکان گەندەڵ بن، ئەوا مەسەلەکە دەچێتەوە سەر ڕێیەکی تر. بەرپرسە گەندەڵەکان هەمیشە حەز دەکەن حکومەت فراوانتر و گەورەتر بێت بۆ ئەوی سوود و قازانجی ئەوان زۆرتر بێت و کەس نەیانناسێتەوە. وێڕای ئەمەش، بەرپرسە بەهێزە هەڵبژێردراوەکانیش حەز بە حکومەتی گەورە و فراوان دەکەن چونکە پێیان وایە چەند حکومەت فراوان بێت ئەوەندە هەلی پشتگیری کردن و پاڵپشتییان فراوان دەبێت. لە هەندێ حاڵەتدا، بەرپرسەکان ئەو حکومەتەی کە وەستاوە لە سەر ئامێر و مەکینەی زەبەلاح بەکاردێنن بۆ دەوڵەمەند کردنی خۆیان و بۆ دابینکردنی کار بۆ لایەنگرانیان. ئەو چالاکییە هاوبەشانە هەمیشە دەبنە هۆی بەرهەمهێنانی حکومەتی فراوان و گەورە. یەکێک لە نموونەکانی ئەم دیاردەیەش شارەکانی ئەمریکایە لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا کە ئامێر و مەکینە سەراپای ئەو شارانەی داگیر کردبوو. یەکێک لە پسپۆرانی ئەم بوارە پێناسەی ئامێری سیاسی دەکات وەک " حیزبێکی سیاسی کە سەرکردەکەی لە کاتی تەنگانەدا کار بۆ خەڵکی دەکات بۆ ئەوەی دەنگ بەدەست بێنێت و پاڵپشتی حکومەتیش دەکات بۆ ئەوەی لایەنگرانی لە نێو کەرتی حکومەتدا زیاد بکات." دیراسەیەکی ئامێری کراوە لە سەر ئەو شارانەی کە پشت دەبەستن بە ئامێر و ئەوانەشی کە پشتی بێ نابەستن لە ساڵانی ١٩٠٠ تا ١٩٢٠، دەرکەوتووە کە مووچە لەو شارانەی کە ئامێر بەکاردەهێنن لە سەدا ٨ و



داهاتی تاکیش لە سەدا ١٨ بەرزترە لەو شارانەی کە ئامێر بەکارناهێنن. هەروەها دەرکەوتووە ئەو شارانەی کە ئامێر بەکاردێنن سەدا ٢٤ ی داهات لە بواری ئیدارەی گشتی سەرف دەکرێت و سەدا ١٧ ەش زیاتر لە پۆلیس و خزمەتگوزاری ئاگر سەرف دەکرێت، هەروەها هەموو ناوچەکانیش پشتگیری کاریان تیادا هەیە. بۆ نموونە، گەر حاڵەتێکی زۆر زەق وەرگرین، ڕێژەی دانیشتوان لە بۆستن لە نێوان ١٨٩٥ تا ١٩٠٧ لە سەدا ٢٢,٧ زیادی کردووە لە کاتێکدا ژمارەی فەرمانبەرانی شارەکە لە سەدا ٧٥ زیادی کردووە. لە ساڵی ١٩٠٧دا مووچە سێ قات زیاتر بوو لە نێو کەرتی تایبەتدا. هەروەها کرێکاری ڕۆژێ لەو شارەدا لە سەدا ٥٠ زیادی کرد، لە کاتێکدا ڕێژەی بەرهەم نیواو نیو دابەزی! کاریگەری زاڵبوونی ئامێر بودجەی زیاتری گەرەکە و مووچەی فەرمانبەری مەدەنی دەبێ لە سەرووی مووچەی ئاساییەوە بێت، لە ئاکامی ئەمەشدا تێچوو لە خزمەتگوزارییەکانی وەک پۆلیس و بەشی ئاگرکوژێنەوە زۆر زیاد دەکات. لە ئەنجامی هەموو ئەو گۆڕانکارییانەدا ئەو شارانە چاکسازییان کرد و ئەو زیادە و مەسرەف و مووچەیان بڕی. بە ڕای جۆنسن و بیپێب، لە ویلایەت و ناوچە شارستانییەکاندا چاکسازی لە ئەنجامی زیادبوونی ڕەهای قەبارەی حکومەت ڕووی داوە. ئاماژە بەوە دەکەن کە ویلایەتە گەورەکانی وەک نیۆرک و ماسەشووسێتس و ئیللینۆس، کە کەرتی حکومی زۆر گەورەیان هەبووە، یەکەم ویلایەت بوون دەستیان داوەتە چاکسازی لە ڕووی دابینکردنی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان. شارەکانی وەک بۆستن و نیۆرک و شیکاغۆ کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر فەرمانبەریان هەبووە یەکەم شار بوونە دەستیان داوەتە چاکسازی، لە کاتێکدا هەندێ شار و ناوچەی شارستانی بچووک تا ئەم ڕۆژگارەی ئێستاش سێود لە سیستەمی چاودێری کردن وەردەگرن. ئاشکرایە کە هەندێ جار ئامێرە سیاسییەکان تۆوی تێکشکاندنیان لە نێو خۆدایە کاتێ حکومەتیان تا ئەو ڕادەیە فراوان کرد کە شوێنێک بۆوە بۆ بەرپەرچدانەوەیان. گەر کەرتێکی تایبەتی زۆر چالاک هەست بە فشار بکات لە لایەن کەرتێکی حکومی ناشایستە ئەوا ڕەنگە بارودۆخێکی لە بار بۆ چاکسازی بڕەخسێت.

بە پێی یەکێک لە دیراسەکان، ئەو شارانەی چاکسازییان تیادا کراوە نەک هەر تەنها سیستەمی خزمەتگوزاری مەدەنی و سیستەمی کڕین و چاکسازی باجیان بە

دونیا ناساند بەڵکو وێنەیەکی درێژخایەنیان لێ کەوتەوە. بە شێوەیەکی ڕێژەیی زیاتر بۆ پرۆژە ژێرخانییەکان سەرف دەکەن وەک ڕێگا و مەزرا و ئاوەڕۆ و ئاوی پاک بە بەراورد لەگەڵ ئەو شارانەی کە تا ئێستا دەستیان بە چاکسازی نەکردووە. چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی کاریگەرییەکی زۆر باشی هەبووە لە سەر گەشەی ئابووری. لە یەکێک لە دیراسەکانی سەر شارەکانی ئەمریکادا، دەرکەوتووە چاکسازی بووەتە هۆی زۆربوونی گەشەی ئابووری بە شێوەیەکی بەرچاو. ئەم ئەنجامەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەرژەوەندیە ئابووریەکان لە پێشەوەی هەوڵەکانی چاکسازیدا بوونە. کۆمپانیاکانی بواری نۆژەنکردنەوە و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان زۆرجار لایەنی پێچەوانە بوونە گەر چاکسازی بواری خزمەتگوزرای مەدەنی و پرۆسەی گرێبەستنی نەگرتباوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەنجامدا هاوپەیمانێتییەک بۆ چاکسازی لە گەلێ شاردا پێک هات کە بەڕێوەبەرەکانی چاکسازیان هەڵبژارد بۆ پشتگیری بازرگانی.

گەشە و هێزی کەرتی تایبەت دەبێ یارمەتی دەر بن و پێ داگرن لە سەر چاکسازی. ئەوەشمان لە بیر بێت ئەو شار و ویلایەتانەی کە چاکسازی تیادا کراوە ئەو شارانە بوونە کە تیایاندا کەرتی تایبەت پشکی تەواوی هەبووە لە کۆی گشتی فەرمانبەران و داهاتدا. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، بازرگانە تایبەتەکان دەبن بە لایەنگری و پاڵپشت بۆ چاکسازی کە نرخی ئەوانی دابەزاندووە، هەروەها کرێکارانی کەرتی حکومیش ڕەنگە زۆر نارەزایی دەربنەبڕن گەر دامەزراندن لە نێو کەرتی تایبەتدا زۆر زەحمەت نەبێت. چاکسازی ڕووی دا کاتێ حکومەت بووە ڕێکخراوێکی فراوان لە قەبارەیەکی ڕەهادا لە هەمان کاتدا ڕێژەیەکی کەمی پەیوەست بوو بە کەرتی تایبەتەوە. ژمارەیەکی کەم لە بازرگان و تاکە تایبەتەکان وەستا بوون لە سەر کارەکانی حکومەت و گرێبەست و ئارەزووەکان بۆ نەهێشتنی چاکسازی، ئەگینا زۆربەیان ویستی چاکسازییان هەبوو و یارمەتیشیان دا.



## بەردەوامبوونی چاکسازی

یەکێک لەو ڕێگایانەی کە لە بەردەوامبوونی چاکسازی دڵنیامان دەکاتەوە قەرەبوو کردنەوەی ئەو کەسانەیە کە لە ئەنجامی چاکسازیدا زیانیان پێ دەگات و دەناڵێنن. ئەو جۆرە قەرەبوو کردنەوەش بۆ زیانلێکەوت و زەرەرمەندەکان هەمیشە پێویست نییە. زۆرینە دەتوانێت بە سەر کەمینەدا زاڵ بێت، هەروەها ئۆتۆکراتێک دەتوانێت نەخشەیەک بۆ چاکسازی ڕابگەیەنێت. بەڵام، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەگەری سەرکەوتنی چاکسازی هەیە گەر ئەوانەی کە زۆر زیانیان لێ کەوتووە قەرەبوو بکرێنەوە. ڕەنگە ئەمە پێویستییەکی ناوخۆ بێت گەر مەبەستەکە ئەوە بێت قەناعەت بە بەرپرسێکی گەندەڵ بکرێت دەست لە دەسەڵاتەکەی هەڵگرێت بە بێ خوێن ڕشتن. لە حاڵەتەکانی تردا، قەرەبوو کردنەوەی بەرپرسە گەندەڵەکانی پێشوو ڕەنگە کارێکی ئەوەندە ناخۆش نەبێت. باشترین نموونە چاکسازییە لە بواری خزمەتگوزارییە مەدەنییەکاندا، کە مەرجەکانی مووچە و کارکردن باشتر دەکرێن لە بەرابەردا فەرمانبەر و بەرپرس دەبێ واز لە بەرتیل وەرگرتن بێنن. بەرپرسە گەورە گەندەڵەکان زۆر دڵخۆشن بە کارەکەیان، بەڵام تەواوی بیرۆکراسی پاڵنەرێکی پێ بەخشراوە ئەویش ڕاستگۆییە. ئەم جۆرە سیاسەتانە پێویستە پیادە بکرێن لەو وڵاتە هەژارانەی کە خەڵکی ڕۆشنبیری کەمە و ناتوانن هەندێ ئەرکی کەرتی حکومی جێبەجێ بکەن. دەرکردنی هەموو بەرپرس و فەرمانبەرە گەندەڵەکان پێکەوە لە یەک کاتدا ئەوا کارێکی دەگمەنە هەرچەند گەر کاریگەرترین ڕێگاش بێت بۆ چاکتر کردنی کارکردن لە سیستەمە گەندەڵەکاندا. بێگومان، مەترسیەکە ئەوەیە کە ئەو تەنازولاتانەی بۆ بەرپرسە هەنووکەییەکان کراون ئەوەندە گەورەیە کە کاریگەری ئەوتۆی چاکسازی ئیفلیج کردووە.

هەندێ جار سیاسەتەکانی دژە گەندەڵی پێکهاتەی دەوڵەت دەگرێتەوە بۆ کەمکردنەوەی ڕۆڵی خۆی لە ڕێگەی تایبەتمەندێتی و ڕەتکردنەوەی پێو و دانگە نیزامیەکان. چونکە ئەم چاکسازیە ژمارەی بەرپرسە حکومیە پێویستەکان کەم دەکاتەوە، ئەو بەرپرسانە دەبێ بەرگەی گۆڕان بگرن. یەکێک لە دیراسەکان

پێشنیاری بە دەست هێنانی پشتگیری بیرۆکراتەکان دەکات بۆ ئەو جۆرە چاکسازیە لە ڕێگەی بەخشینی " إكرامیە المتقاعد golden handshake. ئەمە پشکێکی داراییان پێ دەبەخشێت لە هەوڵی سەرکەوتنێکی درێژخایەنی چاکسازیدا، هەروەها پاڵنەرێکیان پێ دەبەخشێت بۆ ئاشکرا کردنی زانیاری پێویست بۆ چاکخوازان. نووسەرانی ئەم بوارە دوو نموونە لە وڵاتی چین دەهێننەوە کە تیایدا بەرپرسان و فەرمانبەران سوودی شەخسی خۆیان هەبووە لە چاودێری کردنی بازرگانە نوێیەکان و ڕەزامەندی دەربڕین لە سەر عەرزی پشکەکان. بەڵام، هەروەک نووسەرەکان دانیان بەوە داناوە، لێخۆشبوون لە گەندەڵی ستراتیژیەتێکی ترسناکە. ڕەنگە بەرپرس و فەرمانبەرە گەندەڵەکان لە سەر خۆیان وەرگرن و چالاکییەکانی خۆیان ڕێک بخەنەوە تا دەسکەوتی گەورەتر بە دەست بێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی گەشەی ئابووری و پەراوێز خستنی شەرعیەتی حکومەت. لێخۆشبوونی ڕابردووی گەندەڵی لە لایەن حکومەتەوە لە داهاتوو دەبێتە هۆی دروستبوونی بەربەستێک لە سەرکۆنەکردنی گەندەڵکارانی تر. بۆیە ئیختیاری باشتر هەن وەک پاداشتی یاسایی و قەرەبوو کردنەوەی بە کۆتا هاتنی خزمەتەکەی (severance payments)، هەروەها هاوکاری کردن لە گۆڕانی بۆ فەرمانبەرێکی تایبەتی. ئەم سیاسەتانەش زۆر گران لە سەر بودجە دەکەون، بەڵام تەنها یەک جارن و چاکسازییەکی جدی لێ دەکەوێتەوە.

هەتا گەر زەرەرمەندەکان هێوربکرێنەوە، باری چاکسازی هەر ناسک دەبێت. مێژووی هەوڵەکانی چاکسازی زۆر هاندەر نین. زۆرجار چاکخوازان قەناعەتیان بە خۆیان هێناوە و چەند یاسایەکیان دەرکردووە یاخود چەند سیاسەتێکی نوێ ڕابگەیەنن بە بێ ئەوەی جەخت بکەنەوە لە سەر ئەرکە زەحمەتەکەیان کە وەرگێڕانی ئەو چاکسازیەیە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن و بەردەوام و گۆڕانکارییەکانی لە کاروبارەکانی حکومەتدا. گەر کولفە بیرۆکراتی و سیاسییەکان لەمەڕ جێبەجێ کردن پشت گوێ بخرێت لە کاری یەکەمی چاکخوزان ئەوا قۆناغەکە شلۆق دەوەستێت و ڕوو لە سەرنەکەوتن دەکات.

بەردەوامبوونی چاکسازی لە بواری خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە ویلایەتە



یەکگرتووەکان و بەریتانیادا شایەنی لێکۆڵینەوەیە. ئەزموونی ئەوان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە گەر پێ دابگری لە سەر گۆڕان، گەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت، ئەوا چاکسازی خۆی دروست دەبێت. کلیلی ئەمەش پرۆسەی چاکسازییە کە هاوپەیمانی نوێ لە خودی پرۆسەی گۆڕانەکە خۆیان دروست دەبن. بە پێی تێپەڕبوونی کات پشتگیری بۆ چاکسازی گەشە دەکات هەرکە بەرنامەکانی چاکسازی خۆیان گەشە دەکەن. بۆیە هەرکاتێک چاکسازی دەستی پێکرد خۆی بەردەوامی دەبەخشێت بە خۆی.

چاکسازی لە سەر ئاستی فیدراڵدا بە هێواشی دەستی پێکرد لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکەم جار تەرکیزی کرد لە سەر بەشە بیرۆکراسیەکان کە بەرزترین ڕێژەی دەسکەوت لابەلاکان لەوێیە. لایەنگرە گرینگەکان لە دەرەوەی حکومەت سوودیان وەرگرت و یارمەتی بە دامەزراوە کردنی چاکسازیان دا. لە نێو حکومەتیشدا، سوودمەندانی یەکەم لە پاراستنی خزمەتگوزاری مەدەنی هەوڵی پاراستنی چاکسازیان دا لەم بوارەدا. هەوڵەکە لە سەدا ١٠وە بۆ سەدا ٨٠ نزیکەی ٤٠ ساڵی خایاند. ڕێژەی سیستەمی سوود وەرگرتن زیادی کرد کاتێ فەرمانبەری حکومی زیادی کرد. کاتێ کارەکانی کەرتی حکومی ڕووی لە زیاد بوون کرد، ئەوا ڕێژەیەکی زۆرتری فەرمانبەران وەردەگیرێت بە بێ ئەوەی فشار بکرێتە سەر فەرمانبەرە هەنووکەییەکان. هەرچەندە هەندێ خەڵک ڕەنگە کار لە دەست بدەن لە بەر ناشایستەیی و کەمی توانا، بەڵام ڕەوشەکە پێویستی بە بڕینی مووچەی کەس نەکرد.

کاتێ دەسکەوتی فەرمانبەران زیاد دەبێت، هەموو فەرمانبەران بە یەکەوە دەبن بە یەک گروپی بەرژەوەندی و کار دەکەن لە پێناو بەردەوام بوونی سیستەمەکە. بێگومان ئەمەش کۆڕایەکی تێکەڵاوە گەر هەل و مەرجەکان گۆڕانکاریان تیادا کرابا. لە هەندێ کاتدا، فەرمانبەران لەگەڵ پاراستنی خزمەتگوزاری مەدەنی چاکسازیەکانی تر بۆ باشتر کردنی بەرهەم هێنان ئیفلیج دەکەن. خراپترین حاڵەت هەبوونی دەستەیەکی ڕێک و گەورەی فەرمانبەری حکومیە لە سەر بنچینەی خزم خزمانێ دامەزرا بن، لەبەرئەوەی زۆر زەحمەتە دەریان بکەیت یان چاکیان بکەیت. ئەمە

بووەتە کێشەیەکی هەرە سەرەکی حکومەت کاتێ بە نیازی گرێبەستی خزمەتگوزارییەکانە بە دەر لە ڕێکخراوە تایبەتییەکان. بەڵام گرێبەستی دەرەوە کەمتر هەیە لە وڵاتە هەژارەکان ئەمەش دەبێتە هۆی نەبوونی ڕێکخراوە تایبەتییە لێهاتووەکان بۆ ئەوەی بتوانن دەست بخەنە نێو کارەکانی دەوڵەتەوە.

چاکسازی لە ئەمریکای شارستانیدا نموونەیەکی تری چاکسازی بەردەوامە. هەرچەندە لە گەلێ شارەکانی تری ئەمریکادا چاکسازی لە سەر هێڵێکی ڕاستدا بەردەوام نەبوو. جێگای ئیدارەی ئامێر و چاکسازی دەسەڵات بوو. بەڵام، هەرچەندە هەندێ لامەرکەزی ڕووی دا، ئامێرەکان زۆرجار درێژەیان بە چاکسازی دا کە لە لایەن حکومەتە پێشکەوتووەکانەوە ئاشنا کرا. چاکسازیەکان لەگەڵ هەڵبژێردراوەکان ئاشنا بوون هەڵگەڕانەوەشیان زەحمەت بوو. چاکسازی باجی موڵکداریەتی لە هەندێ شاردا بووە هۆی پەک خستنی پسوولەی باجی خاوەن خانووەکان. بۆ نموونە، لە شاری " جێرسی"، باجی بەشەکانی هێلێکی شەمەندەفەر بووە هۆی سووک کردنی باجی قورسی خاوەن ماڵەکان. ئاشکرایە، ئەو دەنگەرانەی کە موڵکیان هەبوو، لە سوودەکانی کەم کردنەوەی باجی موڵک دەگەیشتن، تەنانەت ئەوانەی بە کرێشیان دەدا هەندێ لەو سوودەی بەردەکەوت. چاکسازیەکان بەردەام بوون چونکە دەسکەوتەکان ئاشکرا بوون بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دەنگەدران سەرەڕای ئەو باجەی سەپێنرا بوو بە سەر هەندێ لە بەرژەوەندیەکانی بازرگانان.

وڵاتانی تریش توانیویانە هەندێ چاکسازی بکەن، بەڵام ئەو پرسیارانە هەر ماونەتەوە دەربارەی پێشکەوتنیان بەرەو حکومەتێکی لێهاتوو و تۆکمە. خزمەتگوزاری گومرگ لە مەکسیک، سیستەمی زەمانەت لە ئەرژەنتین، هەروەها حکومەتی شاری " لا پاز" هەموویان بەم دواییانە ئەزموونێکی باشیان وەرگرت لە ڕووی پاکردنەوە. چاکسازی لە مەکسیک پشت ئەستوور بوو بە ئاسانکردنی ڕێنماییەکان و باش کردنی مووچە و سیستەمی چاودێری. کارەساتێک لە ئەرژەنتین بووە هۆی گۆڕان لە ڕووی ژمێریاری و دەستەی کۆمپانیای حکومی بە تەواوی گۆڕان. بەڕێوەبەرێکی چاکسازی لە لاپاز کۆمەڵێک پڕۆژەی ئاشنا کرد کە بەو هەوڵانە دەستی پێکرد بۆ لەبار باردنی خراپترین دزو و گەندەڵ بەڵام بەردەوام



نەبوو لە گرتنە خۆی گۆڕانە ڕیشەییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، ماوەی چاکسازی بە نیوەچڵی پرسیار هەڵدەگرێت. بۆ نموونە، لە لاپاز پاش ئەوەی حاکم نووسینگەکەی جێهێشت، چاکسازی وەستا و گەندەڵی سەری هەڵدایەوە. ئەمەش ئەرکی چاکخوازەکانی قورس کرد، دەبوایە چارەی شکستی بیرۆکراتی و سیاسی لە لایەک هی چاکسازیش لە لایەکی تر بکەن و ڕێگا بدۆزنەوە بۆ کپ کردنی ئەو ڕکابەرانەی کە لە دژی چاکسازی بوون و هەمیشە چاویان لە دەرفەتێکی ئاوادا بڕیبوو.

لە هەندێ حاڵەتدا، دامەزرێنەرانی چاکسازی لە بەر کاری خراپی یەک لە دوای یەک پەکیان دەکەوێت. لە بری دروست کردنی گروپێک لەو براوانەی پێشوو کە پشتگیری بەردەوام بوونی چاکسازی دەکەن، سوودمەندانی پێشووی پڕۆگرامەکە دەترسن لەوەی زەرەرمەند بن گەر چاکسازی بەردەوام بێت. لە خراپترین حاڵەتدا، دەبن بە هاوپەیمانێتیەکی ڕێگر کە ناهێڵن گۆڕانێکی فراوان و ڕیشەیی ڕووبدات. بە پێی دیراسەیەک، چاکسازی زەوی لە ئەمریکای لاتین نموونەیەکی ئەم پرۆسە هەڵگەڕانەوەیە بوو، هەموو لایەنگرانی پێشوو لە دژی چاکسازی وەستانەوە. ئەو وڵاتانەی چاکسازیان کرد، یەکەم جار بەرنامەیەکیان دانا بۆ مۆدێرن کردنی کێڵگە ناوەنجی و گەورەکان وەک خێراترین ڕێگا بۆ زیاد کردنی بەرهەم. بەڵام، سەرکەوتنی ئەو بەرنامانەش لەوەدابوو کە ئابووری جووتیارەکانی زۆر بەهێز کرد کە لە بەرابەردا دەسەڵاتێکی سیاسی زۆر بەهێزی پێ بەخشین. لە ئەنجامدا، هەمووی هەڵگەڕانەوە و بە دوای دەسکەوتدا دەگەڕان و بوونە ڕێگریش لە بەردەم دابەشکردنی زەوی بە سەر هەژاراندا. نووسەرانی ئەم بوارە گەیشتوونەتە ئەم قەناعەتەی کە سەرەڕای تێچوێکی مەودا کورت، چاکسازی زەوی دەبێ پێش بە مۆدێرن کردن جێبەجێ بکرێت. شرۆڤەکانیان ڕەنگە هەندێ وانەی تیا بێت بۆ چاکخوازان لە وڵاتە سۆشیالیستەکانی پێشوو. ڕێگەدان بە لیبراڵی کردنی ئابووری بە بێ دامەزراندنی چوارچێوەیەکی یاسایی و سیاسی و سەقامگیر دەتوانێت ئەوانەی سوودیان وەرگرتووە لە یەکەم دابەشکردنەوەی شتی دەوڵەت بەرەو چەند هەوڵێکی دژکارانەی ببات بۆ دروستکردنی سیستەمێکی یاسایی لێهاتووتر و عادیلانەتر.

## ئەنجامەکان

چاکسازی ڕێی تێ دەچێت و لە ژێر هەندێ هەل و مەرجیشدا بە دامەزراوەیی دەکرێت و زەحمەتیش پێچەوانە دەکرێتەوە. پێکهاتەی دامەزراوە سیاسییەکان دەتوانێت ڕێگە بۆ چاکسازی خۆش بکات و دەشتوانێت ڕێگەی لێ بگرێت، هەروەها هەندێ سیستەم ڕێک دەخرێن تاوەکو چاکسازیەکی درێژخایەن و بەردەوام ڕوونەدات. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ژێر هەل و مەرجی تردا چاکسازی دەتوانێت لایەنگر دروست بکات کە بتوانن بەرگەی هەوڵەکان بگرن بۆ گێڕانەوەی گۆڕانەکانی ڕابردوو. وانەی هەوڵەکانی چاکسازی لە ڕابردوو و ئێستا گرینگی لایەنگران دەخاتە ڕوو لە دەرەوە و ناوەوەی حکومەت. قسەیەکی بەڵگە نەویستە، چاکسازی زۆر ئاسانترە گەر کۆمەڵگا بازرگانی و نێودەوڵەتییەکان قەناعەتیان بەوە بێت کە ئەوان سوود لە کەمبوونەوەی گەندەڵی و واستەکاری وەردەگرن، هەروەها گەر هاوڵاتی ئاسایی سوود ببینن لەم کەمبوونەمیە. لە گەلێ حاڵەتدا، جۆرە پشتگیری و لایەنگریەکی ئاوا ڕێی تێدەچێت گەر ڕێگەی لێ نەگیرێت بەهۆی ئەوانەی کە دەسکەوتیان هەیە لە واستە و گەندەڵی. ئەو سیستەمە سیاسییانەی کە ئارەزووەکانی تاک ئاڵووێر دەکەن، بین بە کار و بەرتیل و گرێبەستی حکومەت، ئەوا سیستەمی ڕێگە خۆشکەرن بۆ گەندەڵی. چاکسازی ئەو جۆرە سیاسەتانەش دەوەستێتە سەر کارەساتێک یان قەیرانێک یاخود هێواش داماڵینی سوودەکان لە نێو ڕێکەوتن و مامەڵەکان. هەندێ جار هەوڵێکی ناڕاستەوخۆ بۆ چاکسازی پێویستە. چاکسازی بە متمانەی خزمەتگوزاری مەدەنی و پراکتیزەکردنی و پرۆسەی کڕین لە لایەن لیژنەی کڕینی باوەڕپێکراو و پرۆگرامەکانی مۆڵەت پێدان ڕوونادەن بە بێ چاکسازی ڕیشەیی لەو ڕێگایەی کە سیاسەتی حکومی لێیەوە تێپەڕ دەبێت.

لە ژێر فشاری هەندێ هەلومەرجدا تەنها چاکسازی بە نیوەچڵی لە ڕووی سیاسییەوە ڕێی تێدەچێت. سەرۆکەکانی ئەمریکای لاتین زۆرجار دامەزراوە سەرەکییەکانی حکومەتیان هەڵبژاردووە وەک بانکی ناوەندی یاخود دەسەڵاتەکانی



داهات. لە ئەفریقیا، چاکسازی باج بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەوانەی کە دەسەڵاتی داهاتیان بە دەستە دەگرێتەوە کە سەرچاوەی تایبەتییان لە ژێر دەستە و خزمەتگوزاری بێ وێنەیان کۆنترۆڵ کردووە. هەروەک " گێدس" ئاماژەی بۆ دەکات، ئەمە نابێتە ستراتیژیەتێکی درێژخایەن و بەردەوام. سەرکردەیەکی بەهێز دەتوانێت یەکەیەکی هەرێمی و کەلتووری دروست بکات، بەڵام گەر پشت ببەستن بە پاراستنی ئەو، ئەوا تەنها بە گۆڕانێک لە نێو حکومەتدا دەڕووخێن. مامەڵەی تایبەتی، تۆڵە لای هەندێ دروست دەکات. وێڕای ئەمەش، تەنانەت چاکسازی فراوانی حکومەت ڕەنگە دامەزرێت گەر بازنەیەکی گەورەی لایەنگران و پشتگیریکەران دروست نەکەن کە هەمووی بە واستە و بە هێزی پارە بوونەتە لایەنگر. ڕەنگە مەنتق ڕێگایەک بە واقیعی سیاسی ببەخشێت. لە ژێر فشاری هەندێ بارودۆخدا، ڕەنگە دەسکەوتە کورتخایەنەکان پشتگیرەکی زۆر کۆبکاتەوە بۆ هەنگاوە زۆر و زەوەندە زەحمەتەکانیش. لە ژێر باری هەلومەرجی تردا، سوودە کورتخایەنەکان بەرپەرچدانەوەیەک لای هەندێک دروست دەکات بە تایبەتی لای ئەوانەی هەمیشە وێڵن بەدوای بەردەوامبوونی دەسکەوتەکانیان. ئەو پرسانە پێشنیاری دوو ڕێگا دەکەن بۆ چاکسازی بەردەوام، یەکەمیان، کە ڕێی تێدەچێت تەنها لە کاتی قەیرانە گەورەکان و نەمانی قەناعەت بە واستەکاری خزمێنە، کە ئەمەش " گورزێکی گەورەیە" دەبێتە هۆی کۆمەڵێک گۆڕان هەمووی لە یەک کاتدا. دووەمیان، ستراتیژیەتێکی زۆربوون و فراوان کردنە کە تیایدا هەنگاوەکان زۆر بە هەشیاری دەچن بەرەو پێشەوە بۆ بینا کردنی پشتگیری بە پێی تێپەڕ بوونی کات بۆ چاکسازی بەردەوام. هەندێ دەسکەوتە کورتخایەنەکان دەبێ ببنە قوربانی تاوەکو مافێکی ڕیشەیی بەدەست بێنن.

## ئەنجامەکان

زۆرجار بەرژەوەندی خود و بەرژەوەندی گشتی ناکۆکن. لە پەیوەندییەکی گەندەڵدا هەردووکیان بەرتیلدەر و وەرگر لە باشترین باردان، بەڵام مامەڵەکانیان سیاسەتی حکومەت پێشێل دەکەن. لە رووی پارە دانەوە پێوەر سەردەکەوێت تا ئارەزووی پارەدان. هەندێ بەرپرس و فەرمانبەری حکومی گەندەڵ دەڵێن گوایا بەرتیل کاری لە هەڵسوکەوتی ئەواندا نەکردووە. ئەوەی وەری دەگرن گوایا تەنها دیارییە بۆ ئەو کارە باشەی کە کردوویانە. لەگەڵ ئەوەشدا، تاک و کۆمپانیا زەبەلاحەکان قەناعەتیان بەوەیە کە ئەو جۆرە دیارییانە داواکارییەکە بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییەکی باش لە سەرەوە و خوارەوەی حکومەتدا هەیە. تەنانەت ئەوانەشی کە پارە دەدەن بۆ وەرگرتنی شتێک ( خۆی شتەکە بە خۆڕاییە) پێیان وایە ئەو بەرتیلە باشترە لەو بەدیلەی کە لە لایەن بەرپرس یان فەرمانبەری گەندەڵ دەخرێتە روو ( یەکێک لەو بەدیلانەش دواخستنی کارە). رەنگە پێیان وا بێت کە بەرپرسە سیاسییەکان و حاکمەکان دژی ئەوان دەوەستنەوە گەر پارە هیچ یەکێک لە دەستەکانی نەگۆڕی. هەوڵی سیستەماتیکی بۆ رێگەدان بەو جۆرە بەرتیلە کارێکی وێرانکەرانەیە. ئەوانەی کە جڵەوی دەسەڵاتیان لە دەستە بیر لە دروستکردنی ژمارەیەک یاسای تایبەت و سنووردار بۆ خەڵکی و بێ سنوور بۆخۆیان دەکەنەوە بۆ ئەوەی رێگە خۆش بکەن بۆ بەرتیلی زیاتر. ئەوانەی کە لە رابردوو هەرگیز بەرتیلیان نەداوە رەنگە لە داهاتوو بیدەن چونکە دەبێتە نەریتێک. واقیعێک رووبەڕوویان دەبێتەوە: گەر بەرتیل نەدەی، هیچ کارێکت بۆ ناچێتە سەر!

هەرچەندە بەرتیلی تاک بە شایستە و عادیلانە وەسف بکرێت، گەندەڵی سیستەماتیکی زۆر بە دەگمەن ئەو کارە دەکات. گەر لە دەوڵەتێک کۆت و پێو و دانگ زاڵ بێت، هەروەها لەو دەوڵەتە هەموو سیاسەتێک زیان بە هەمووان بگەیەنێت جگە لە نوخبەیەک نەبێت، ئەوا لەو دەوڵەتە گەندەڵی هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە. لێخۆشبوون و لێبوردن لەم کارە، دەبێتە هۆی رێگە خۆش کردن بۆ سیستەمێکی



ناڕەواو ناشایستە بۆ بەردەوام بوونی کارەکە. کارەساتەکانی گەندەڵی دەبێتە نیشانەیەک بۆ پێگەی گەشەی سیاسی وڵاتێک. ئەوە دەخەنە روو کە هاوڵاتیان تازە درک بە جیاوازی دەکەن لە نێوان بازنەی گشتی و تایبەتی و ناڕەزایی دەردەبڕن کاتێ گەندەڵی هەموو سنوورێک دەبەزێنێت. هاوڵاتی خەم لەو بەرتیلە دەخوات کدە دەدرێت لە بەرابەردا کارێک بەڕێ دەکرێت لە سەر حیسابی ئەو و مافیشی دەخورێت، ئیتر درک بەو نەریتە دەکات و دەست دەکات بە داواکردنی مامەڵەیەکی عادیلانە و حکومەتیش بتوانێت خزمەتگوزاری مەدەنی و گشتی بۆ هەموو لایەک بە یەکسانی دابین بکات.

رەنگە گەندەڵی رەگی خۆی داکوتا بێت لە نێو کەلتوور و مێژوودا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کێشەیەکی ئابووری و سیاسیشە. دەبێتە هۆی لێنەهاتوویی و نایەکسانی لە دابەشکردنی سوود و خەرجیە گشتییەکاندا. دەرمانێکە کە سیستەمی سیاسی پێ ئیش دەکات لەگەڵ خەمێکی کەم بۆ بەرژەوەندی گشتی. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پێکهاتەی حکومەت زیاتر بایەخ بە کەناڵی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان دەدات. شەرعیەتی سیاسی ئیفلیج دەکرێت گەر حکومەت رێگە بە هەندێ بدات دەسکەوتی تایبەتی بێشومار وەرگرن لە سەر حیسابی ئەوانی تردا.

یەکێک لە پرسە سەرەکییەکان بۆ چاکخوازان ئەوەیە کە کەی بەرپرسە سیاسی و بیرۆکراتەکان پاڵنەرێکیان بۆ پەیدا دەبێت بەرەو گۆڕان بچن، یان گۆڕان پەسەند بکەن. دەکرێ فشاری دەرەوە یارمەتیدەر بێت، بەڵام پابەند بوون بە گۆڕان روونادات تاوەکو ئەوانە دژی چاکسازین قەرەبوو نەکرێنەوە یانیش بخرێنە پەراوێزەوە. باشترین حاڵەت بۆ چاکسازی ئەوەیە کە لە کاتی گۆڕانە سەرەتاییەکاندا سوودمەندەکان بتوانن پشتگیری زیاتر بکەن لە داهاتوودا. خراپترین حاڵەتیش ئەوەیە کە گەندەڵی رۆژ دوای رۆژ پەرت و بڵاوتر و فراوانتر ببێت. نابێ چاوەڕێی ئەوە بین گەندەڵی خۆی وەک درەختێک وشک بێت لەبەرئەوەی حکومەتێکی چاکسازی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست یان لە بەرئەوەی گەشەی ئابووری چالاکە. هەرچەند فەرمانبەر و بەرپرس دەسەڵاتیان زیاتر بێت ئەوا گەندەڵی هەر بەردەوام دەبێت و زیانێکی ئێجگار زۆریشی دەبێت بۆ ئەو وڵاتانەی ناسکن و تازە کەوتوونەتەوە.

چاکخوازان دەبێ کاری ڕاستەقینە بکەن، نەک تەنها دانیشن و بە تەمای ئەوە بن کە گۆڕانی ڕیشەیی هەر ڕوودەدات کاتێ سەرە گەورەکان دەگۆڕێن.

گەندەڵی کێشەیەک نییە بە تەنیا هێرشی بۆ بەریت. یاسای تاوانباران نابێت تەنها بگەڕێت بە دوای سێوە خراپەکان و سزایان بدات. بێگومان، دەوڵەت پێویستی بەوە هەیە متمانە دروست بکات لە ڕێگەی سزادانی بەرپرسە گەورە گەندەڵەکان، بەڵام ئامانجی ئەو جۆرە کارە بۆ سەرنج ڕاکێشان و کۆکردنەوەی پشتگیری گشتییە، نەک چارەسەر کردنی کێشەکە. یاساکانی دژە گەندەڵی دەتوانێت تەنها پێشینەیەک بۆ پێکهاتەی گرینگتری چاکسازی بخاتە بەر دەست.

ئەو حاڵەتانەی کە تیایدا گەندەڵی توانای وەکیلەکان بەهێز دەکات و دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی باشتر دەکات سنووردارن. بەڵگەی تیۆری و تەجریبی پشتگیری لێبوردنێکی گشتی گەندەڵی ناکات. گیروگرفتی لێبوردن لە هەندێ ناوچەدا ئەوەیە کە لێبوردن هەوڵەکان ئیفلیج دەکات بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی لەو ناوچانەی کە گەندەڵی بە ئاشکرا زیانبەخشە. ئەو ئەگەرەی کە هەندێ جار بەرتیل پاڵ بە بەرپرس و فەرمانبەر دەنێت بۆ کار کردن پێشنیاری ئەوە دەکات کە لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا بەرتیلی نایاسایی ببێتە پاڵنەرێکی یاسایی پارە دان. گەر هەندێ جۆری پارە دان وەک بەخشیش سەیر بکرێت و پەسەند بکرێت بۆ فەرمانبەری حکومی، ئەوا دەبێ بە پێی یاسا ڕێک بخرێن و ببێتە بابەتێکی ڕەوا لە کاتی داواکردندا. یەکێک لە تاقیکردنەوەکانی سەلماندنی " کەلتووری" بۆ پارەدان پەسەند کردنی پرۆپۆزەلەکانە بۆ دروستکردنی ئەو جۆرە پارە دانە گشتییانە.

هەردوو تیۆر و پراکتیزە پێشنیاری ئەوە دەکەن کە هیچ وەڵامێکی تاک و سادە نییە پێویست بکات لە نێو دەستەکە هەرکە یاسا بنەڕەتییەکانی دژە گەندەڵی لە شوێنی خۆیان کاری خۆیان بکەن. گەیشتووینەتە ئەو قەناعەتەی کە دوو جۆرە گەندەڵی جیاواز و هاوکات بەند بە یەکتریەوە هەن: گەندەڵی لە نێو بەرپرسە گەورەکان کە هەمیشە مامەڵەی زۆر گەورە لەگەڵ کۆمانیا زەبەلاحە نێودەوڵەتییەکانەوە دەکەن، هەروەها ئەو گەندەڵییەی کە لە سەر ئاستی حکومەتدا هەیە وەک گەندەڵی لە کاتی کۆکردنەوەی باج و گومرگ و مۆڵەت پێدان و پشکنین. لە



هەر یەک لەو جۆرە گەندەلییانەدا، هەندێ بەرتیل چالاکییە ناشەرعیەکان ئاسان دەکات، هەروەها هەندێکی تریشیان دەدرێت بۆ سوود وەرگرتن.

ئەو وڵاتەی بە جدی لە سەر بنبڕکردنی گەندەڵی کار دەکات دەبێ دیراسەیەکی قووڵ و تێر و تەسەل بکات لە بارەی ئەوەی لە کوێ گەندەڵی زۆر زیانبەخشە و لە کوێش هێرشی بکاتە سەر. هەنگاوی یەکەمیش ئەنجامدانی ڕووپێوێکە لە سەر خەڵکی گشتی بۆ ئەوەی ئەوە ئاشکرا بکات چۆن گەندەڵی کار لە ژیانی ڕۆژانەیان دەکات. ئەمە ڕێگایەکمان نیشان دەدات بۆ دانانی ئەولەویاتەکان کە ڕەنگدانەوەی ناخۆشی و زیانەکانی خەڵک بێت. بەڵام، تەنها بەڵگەی ڕووپێو بەس نییە. ئەو گەندەڵییەی کە ئاشکرایە لە بەرچاوی زۆربەی خەڵک دەکرێت زۆر زیان بەخش نییە. بۆیە دەبێ هەنگاوی دووەم لە سەر ئاستی گەندەڵی بێت لە سەر گرێبەست و تایبەتمەندێتی و ئەو داشکاندنانەی کە دەبێتە هۆی چەواشەیەکی جدی ئابووری و ئیفلیج کردنی تەندروستی دارایی و ئابووری دەوڵەت. سێیەم، ڕەنگە خەڵک پێیان وا بێت کە سوود لەو بەرتیلە وەردەگرن کە باجیان سنووردار دەکات و بارە قورسە بازرگانییەکەیان لە سەر کەم دەکاتەوە. بۆیە بەرتیلی ئەم جۆرە ڕەنگە وەک کێشەیەک باس نەکرێت لە لایەن ئەنجامدەرانی ڕووپێو. لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەری هەرە گەورەی ئەو جۆرە بەرتیلە زیانێکی ئێجگار زۆری هەیە. ئەوانەی کە کار دەکەن لە سەر گەندەڵی دەبێ سەیری ئەودیوی وەڵامەکانی تاک بکەن تا ڕەچاوی کاریگەری گشتی بکەن بۆ ئەوەی هەوڵێکی باش بدەن بۆ جێبەجێ کردنی یاساکان. لەم جۆرە حاڵەتانەدا سیاسەتی وەڵامدانەوە دەبێ بەرنامەی خۆی دابڕێژێتەوە، نەک زۆرکردنی چاودێری. هێرشێکی ڕاستەوخۆ بۆ سەر گەندەڵی لە ڕێگەی سەپاندنێکی توندی یاسا و داواکاری هەڵسەنگاندن و ئاژانسە تایبەتییەکانی دژە گەندەڵی بەس نین و ڕەنگە گەلێکیشیان هەر پێویست نەبن. لە بری ئەوە، تەرکیزی ئەو سێ هەنگاوەی سەرەوە دەبێ لە سەر دیاریکردن و چارەسەر کردنی هۆیەکانی سەرهەڵدانی گەندەڵی و بەرتیل بێت. بۆیە گشتاندنی هەوڵەکان بە سانایی ڕێی تێ ناچێت، بەڵام ئەزموونی وڵاتی جیا جیا پێشنیاری گەلێ ئەگەری گشتی چاکسازی دەکات:

* داهاتی باج و گومرگ ڕەنگە زۆر لە خوار ئاستی پێویست بن بۆ جێبەجێ

کردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانی حکومەت، هەروەها شێوازی پارە دان نایەکسان بێت لە کاتی بەرتیلدان، دەبێ بە پێی یاسا ڕێک بخرێت. وەڵامەکە دەبێ بۆ سانا کردنی یاساکانی باج بێت بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی بیرۆکراتی و پێزانینی بیرۆکراسی بۆ چاککردنی چاودێری و پاڵنەرەکان لە پێناو ئەنجامدانی کاری چاک.

* ڕەنگە نیزامی بازرگانی زۆر ئاڵۆز بێت، کاتێکی زۆری بوێت و هەروەها گەشەی تەندروستی کەرتێکی تایبەتی زۆر کاریگەری لێ بکرێت. لێرەش وەڵامەکە پێداچوونەوەیەکی باشە بە سەر یاسای ئەو نیزامانە بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە کامەیان دەکرێ لاببرێت، کامەیان سانا بکرێتەوە، هەروەها کامەیان پێویستی بە سەپاندنە. گەلێ وڵات نیزامی بازرگانی بێ کەڵکی هەیە کە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرتیل و هەروەها نیزامە ناشایستەکان لە ناوچە سوودمەندەکان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە وەک پاراستنی ژینگەیی دەبێ جەختی لە سەر بکرێتەوە.

* شێوازێکی بە مەسرەفتر ئەوەیە کە دەوڵەت چاودێری ژێرخانی پڕۆژەیەکی ئێجگار زۆر بکات کە زۆر گەورەن و ئاڵۆزیشن. زیانی گەندەڵی بەرتیلەکان نین، بەڵکو ئەو کارە ناشایستانەیە کە هانی بەرتیلدان و وەرگرتن دەدەن. هەتا گەر بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ لە سەر گەندەڵی لە بەردەست نەبوو، ئەوا بەڵگەی نەخشەی خراپی پڕۆژەکە دەبێ بەس بێت بۆ هەڵوەشانەوەی پڕۆژەکان. ئەو جۆرە گۆڕانە لە ئاڕاستە دەبێ ئاوێتەی ڕێنماییە چاک کراوەکان بکرێت بۆ ڕازیبوون لە سەر پڕۆژەکانی داهاتوو، ئەگینا هەڵەکان دووبارە دەبنەوە.

چاکسازی دامەزراوە بنەڕەتییەکان دەبێ مەرجی پێشەکی چاکسازی بێت لە نێو چەند کەرتێکی دیاریکراودا. هەندێ جار، ئەو چاکسازییەی کە زۆر کاریگەرە لە هەلومەرجی ئابووری و سیاسیدا ڕەنگە لە حاڵەتێکی تر کە تیایدا حکومەت زۆر بێ هێزە و پەرپووتە هیچ سوودێکی نەبێت. ئەو شتانەی کە زۆر گرینگن بۆ چاکسازی لە بوارەکانی تر چاککردنی سیستەمی لێکۆڵینەوەیە لە سیستەمی سیاسیدا.

هەتا گەر یەکێک پێکهاتەی دەستووری نەتەوەیەک وەرگرێت، ئەوا زنجیرەیەک چاکسازی هەن کە ڕەنگە لە ڕووی سیاسییەوە زەحمەت بن بەڵام ئەوەندەیان تێ



ناچێت. بەڵام دەبێ بچنە بنج و بنەوانی دامەزراوەکانیش تاوەکو گۆڕانکاری ڕوویدات لە کارمەندەکان و هاوپەیمانی سیاسی. سیاسەتەکانی بنبڕکردنی گەندەڵی کە لە ڕووی سیاسییەوە زیانیان هەیە دەبێ جەخت لە سەر ئەوەش بکەنەوە ئایا حکومەت بە تا چەند کارەکانی بە ڕوونی دەکات و شەفافیەتی تیایە و کاریش بکەن بۆ ئاسانکردنی ڕێکخراوی سەربەخۆی گروپی چاودێران.

هەرکاتێک کێشەکانی سیاسەتە بەرجەستەکان و پێکهاتەی دامەزراوەکان چارەسەر کران، زۆربەی وڵاتە گەندەڵەکان هێشتا تووشی ئەرکێکی زەحمەت دەبنەوە لە چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی. ئەمەش یان ئەوەتا لە ڕووی داراییەوە گران دەوەستێت یانیش لە ڕووی سیاسییەوە زیانی دەبێت، بەڵام بەشێکی پێویستە لە هەر هەوڵێکی چاکسازیدا. گەر کرێی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان خراپتر بێت لەوانەی کەرتی تایبەتی و هەروەها گەر جیاوازی مووچە لە نێو خزمەتگوزاری مەدەنی زۆر کەم بێت بە لای فەرمانبەرانەوە، دواجار هەوڵەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی زەحمەتە سەرکەوتوو بن. سیاسەتەکانی چاکسازی دەبێ قەبارەی خزمەتگوزاری مەدەنی کەم بکاتەوە، مووچەیەکی باش و شایستە بدرێت بەو فەرمانبەرانەی دەمێننەوە، هەروەها پاڵنەری کاریگەر دابمەزرێت بۆ هاندانی فەرمانبەران بۆ ئەوەی ڕاستگۆ بن و بە چاکی کارەکانیان ئەنجام بدەن.

نەبوونی دامەزراوەی بە متمانە کە بتوانێت گوێ لە ناڕەزاییەکان بگرێت و یاسا بسەپێنێت خاڵێکی لاوازە لە گەلێ وڵاتی ئینتیقالی و پێشکەوتوودا. بۆیە لایەنێکی چاکسازی دەبێ یان چاککردن بێت لە دامەزراوە هەنووکەییەکان وەک دادگا یانیش دروستکردنی دەستەی نوێ وەک پشکنەرانی سەربەخۆ یان کۆمیسیۆنی دژە گەندەڵی. ئەزموونی وڵاتانی تر دەبێ ڕەچاو بکرێت، ئەزموونە سەرکەوتووەکان و ئەوانەشی کە بێ سوود بوونە. ئەو خاڵەش دەبێ ڕەچاو بکرێت کە کاتێ ئەوانەی دژی گەندەڵی کاریان دەکرد خۆیان پیسترین گەندەڵییان لێ دەرچوو!

دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان و کۆمەڵگا بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان دەتوانن پاڵنەر دروست بکەن بۆ چاکسازی. دامەزراوەکانی هاریکاری کردن و قەرز بەخشین دەبێ هەوڵی جدی تر و فراوانتر بدەن. هەوڵەکان بۆ پاک ڕاگرتنی پڕۆژە هاوکارییەکان لە

کاتێکدا پشت گوێخستنی پڕۆژەکانی چالاکییەکانی حکومەت زۆر سست و ناشایستە دەبن کاتێ بەرپرس و فەرمانبەرە گەندەڵەکان و تاک و کۆمپانیا زەبەلاحەکان بە دوای دەرفەت لە هەموو شوێنێکدا دەگەڕێن. ئاشکرایە، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، نابێ دەست هەڵگرن لە هەوڵەکانیان بۆ ئەوەی پڕۆژەکانی خۆیان بە دوور بگرن لە گەندەڵی، هەوڵەکانیان جدی تر دەبێت کاتێ یارمەتی وڵاتانیش بدەن بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی لە ڕێگەی دامەزراوەکانیانەوە.

گۆڕانی ڕیشەیی پێویستی بە پابەند بوون هەیە لە سەرەوەی حکومەت و ئارەزووێک هەبێت بۆ بەدوا داچوون کاتێ هەوڵەکانی دژە گەندەڵی سەرناگرن. دەکرێ چاکسازی جدی جێبەجێ بکرێت لە نێو هەموو پێکهاتەیەکی حکومەت. ئەو حکومەتانەی کە چاکسازی زەحمەت دەکەن دەبێ دەنگی سەربەخۆ لە ڕەخنەدا بەرز بێتەوە، ئەو جۆرە حکومەتانە زۆر بە زەحمەت دەتوانن پابەندبوونێکی بە متمانە دروست بکەن بۆ کاری ڕاستگۆ و شەفاف. ئەو جۆرە حکومەتانە ڕەنگە بتوانن بە خێرایی بڕۆن لە ماوەی کورتی دەسەڵاتیاندا بەڵام ئەو مەترسییەش هەیە کە سیاسەتەکانیان لە داهاتوودا هەمووی پێچەوانە دەبێتەوە. هەڵمەتەکانی دژە گەندەڵی دەکرێ بەکاربهێنرێن بۆ ئیفلیج کردنی هەلە سیاسییەکان و گرووپی پڕ لە گرفت. چاکخوازان دەبێ بەرگەی ئەوانە بگرن کە دژە گەندەڵی بەلاوە دنێن و مەنسەبی سیاسی سنووردار دەکەن. هەوڵەکان بۆ چاکسازی تەنها بە ناو دەبێتە هۆی لەدەستدانی هەموو متمانەیەک لە ڕووی سیاسی و ئابووریشەوە. لە بازنەیەکی بەرزی سیاسیدا دادگای تاک نابێتە هۆی بەرهەمهێنانی چاکسازییەکی ڕاستەقینە. تەنها گۆڕانە پێکهاتەیییەکان لە پاڵنەرە گەندەڵییەکان لە نێو کار و چالاکییەکانی حکومەتدا دەتوانێت گۆڕانێکی ڕیشەیی و باوەڕپێکراو دروست بکات.

# پێڕست